چاپی نۆیەم

پڕفرۆشترین کتێبی ساڵی ٢٠٢٣

# مەملەکەتی شەیتان

کتێبی چوارەم

ماکوان کەریم



بسم الله الرحمن الرحيم

# مەملەکەتی شەیتان

## کتێبی چوارەم

نووسین: ماکوان کەریم

پێداچوونەوە و خاڵبەندی: شەوبۆ جەلال


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

بەڕێوبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی ٠٧٥٠٩٩٩٨١٨٢

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

ئنیستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ محمود - بەرامبەر مزگەوتی محمود علاف

ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

نەخشەسازی ناوەوە: موستەفا موحەممەد کوردی

نەخشەسازی بەرگ: توانا ئەحمەد

چاپی دەیەم: ٢٠٢٤

پێوانە: ١٤*٢١

تیراژ: ١٥٠٠

لاپەڕە: ٤٩٤

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (١٨٨٤)ی ساڵی (٢٠١٦) پێدراوە

پڕفرۆشترین کتێبی ساڵی ٢٠٢٣

کتێبی ژمارە (١٩) لە بڵاوکراوەکانی بزاڤی نوێ

# مەملەکەتی شەیتان

## کتێبی چوارەم

نووسینی:
ماکوان کەریم

چاپی دەیەم:
٢٠٢٤

هیچ کەس ناتوانێت بگەڕێتە دواوە و
لەسەرەتاوە دەست پێ بکاتەوە
بەڵام هەموو کەس دەتوانێت لە ئێستاوە دەست
پێبکات و پایانێکی نوێ دروست بکات.

# پێشەکی:

بەناوی خواوەندی هەستی پاك، کە هەمووماني ئافراندووە لە خاك.

سوپاس بۆ خوای باڵا دەست وا کتێبی چوارەمی مەملەکەتی شەیتان بە کۆتا گەیشت و کەوتە بەردیدی خوێنەرانی.

وەك هەمووان دەزانین کە مەملەکەتی شەیتان زنجیرەیەك کتێبە و سوپاس بۆ خوای گەورە تا ئێستا چوار کتێبی لێ چاپ کراوە.

کتێبی مەملەکەتی شەیتان یەکێکە لە کتێبەکانی نووسەر ماکوان کەریم، کە ئەم شاکارە نایابە خوێنەرێکی یەکجار زۆری هەیە و بەپەرۆشەوە چاوەرێی چاپی ئەم کتێبەیان دەکرد.

ئامانجی نووسەر لەم کتێبە ئەوەیە کە چەواشەکاری و درۆ و خورافیات لە سیحر و جادوبازی و کاری شەیتانەکان جیابکرێتەوە.

لە کتێبی یەکەمدا ئاشنا بووین بە شێوازی چوونی جنەکان بۆ ناو لاشەی مرۆڤ و چۆنێتی دەرهێنانی کرا.

لە کتێبی دووەمدا نووسەر هەوڵی ئەوەی داوە کە جۆری سیحر و جادوو ڕوونبکاتەوە و شێوازی بەتاڵکردنەوەکەی باس بکات، تا خوێنەر سوودی لێ ببینێت و لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەر حاڵەتێکی لەو شێوەیەدا بزانێت چۆن چارەسەری بکات.

لە کتێبی سێیەمدا نووسەر زیاتر لە ڕووی مەیدانییەوە کە خۆی بەشێك بووە لە ڕووداوەکان و نیشانەکان و شیوازی چوونی جنەکان بۆ ناولاشەی

و دەرهێنان و ئەو ئەزیەت و ئازارەی کە مرۆڤەکان دەیبینن بەدەستی ئەوان ڕوون کراوەتەوە.

لەم کتێبەی کە ئێستا لە بەردەستی خوێنەردایە نووسەر هەوڵی داوە زیاتر باسی شێوازی ژیان و کەسایەتی و تواناکانی جنی و موسوڵمان و شەیتانەکان ڕوون بکاتەوە و تیشك بخاتە سەر ئەوەی کە شەیتانەکان لەگەڵ جنی مرۆڤدا دەستیان تێکەڵ دەکەن بۆ کارکردن و کۆنترۆڵ کردنی مرۆڤەکان و بەکارهێنانیان بۆ کارەکانی خۆیان.

هەروەها باسی ئەو گروپ و کەسانە دەکات کە لەگەڵ جنەکان کار دەکەن، کە ئەمەش زیاتر دەوڵەمەندەکان و سەرمایەدارە بەناوبانگەکانی جیهان و سیاسییەکان ئەم کارە دەکەن.

لەم کتێبەدا باس لە چەند چەمکێك و کەسایەتییەك کراوە کەوا لە ڕێگای جادوو و سیحرەوە کاری چارەسەری نەخۆش دەدەن و پێیان وایە کە هێز و توانایەکی تایبەتیان هەیە و بەهێزی وزە دەتوانن نەخۆش چارەسەر بکەن، هەموو ئەو چەمك و زاراوە و کەسایەتییانەی ناویان هاتووە لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا بەکورتی ئاماژەیان پێدراوە تا خوێنەر بتوانێت شارەزاییەکی هەبێت لەسەری.

باران ئاریایی
فرێدریکستاد-نەرویج
٨-ژانویە-٢٠٢٣

## هۆکاری تاوانی ئافرەت خۆشەویستییە ..

کچێکی جوان لەمەڕ وڵاتی خۆمان، زۆر ناسکتر لەوەی بیری لێدەکەیتەوە وە جوانتر لەوەی کە تۆ بەخەیاڵتا نەهاتووە، گلابو لەکێشەیەکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەوە. بۆ ئەوەی ڕووی سپی بکاتەوە و وازی لێبهێنن لەوکارە قیزەونەی کە تووشی بووە. کە لەڕاستیدا دەیانویست لەڕێی ئەو کێشەیەوە بیگلێنن بۆ کێشەیەکی تر.

چۆن ئەمەم زانی؟

ئێوارەیەکی جوانی زەردە کاتێك ڕۆژ لەبەر چاو نغرۆ دەبوو بەناو بازاڕدا دەگەڕام، کەسێك بانگی کردم ماکوان! ماکوان!

سەیری ئەملاو لام کرد کەسم بەدی نەکرد لەو کەسانەی کە من دەیانناسم، ئەوەی بەدیم کرد تەنها ئافرەتێکی قژ سووری باڵا بەرز کە تەنوورەیەك و کراسێکی سپی لەبەردا بوو، هەرگیز بڕوام نەکرد ئەوە کورد بێت و بانگی من بکات، بۆیە پشتم تێکردەوە و بە ئەسپایی بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن.

دیسان هەمان دەنگ بانگی کردم، ماکوان! ماکوان!

دیسان ئاوڕم دایەوە و بێجگە لەو پەریە دەریاییە کەسی ترم بەدی نەدەکرد! وەستام بزانم ئەو کەسەیە بانگم دەکات، دەستی بادا وتی: ببوورە بەڕێز ماکوان ئێوارەت باش!

ماکوان: من دەڵێیت؟

کچەکە: بەڵێ، بەڕێزتان ماکوان کەریم نین؟

ماکوان: بەڵێ، خۆیەتی...

کچەکە: بۆ وا سەرسام بوویت بەدیارمەوە؟

ماکوان: کێشەکەیە لەوەدایە خۆم دەناسم، بەڵام تۆ ناناسم!

کچەکە دەستی هێنا بۆ تەوقە کردن، بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت ئۆتۆماتیکی دەستم برد دەستی بگرم، بەڵام بیرم کەوتەوە کە موسوڵمانم و تەوقە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم حەرامە، بۆیە دەستم بۆی خستە سەر سنگم وتم ببوورە دەست نوێژم هەیە، دەچم بۆ مزگەوت با دەستنوێژەکەم نەشکێت!

کچەکە: من ناوم کرۆنیکا-یە!

ماکوان: کێ؟

ناوم کرۆنیکا-یە!

ماکوان: ئەو ناوە کوردی نییە پێشتر بیستوومە!

سەرقاڵ بوم بەوەوە بیدۆزمەوە کێیە، بیرم نەکەوتەوە. ناچار وتم خۆشحاڵم خەڵکی کوێیت؟ ئەمرکە!

دەمزانی ئەو ناوە شتێکی لە پشتەوەیە، بەڵام بیرم نەدەکەوتەوە چییە؟

کرۆنیکا: هەست دەکەم پەشۆکاویت؟

ماکوان: خۆی لە ڕاستیدا نەپشۆکاوم و سەرسامی گرتوومی، چوونکە لە ژیانمدا ناپەشۆکێم. دەمەوێت خوێندنەوەیەکی خێرات بۆ بکەم، هەرچی دەکەم ڕێم تێت ناکەوێت؟

کرۆنیکا: من و تۆ یەکترمان نەدیووە، لە ڕێگای کتێبی مەملەکەتی عیشقەوە تۆم ناسیووە، دەمەوێت بزانم ئەوەی کە ڕوویداوە ڕاستە یان تەنها ڕۆمانە؟

ماکوان: ئەگەر ڕاستی بوو چی دەکەیت و ئەگەر ڕۆمان و خەیاڵ و فەنتازیا بوو تۆ چیت پێدەبڕێت؟

بێجگە لە وانە و کار و ئەدەبیاتانەی کەتێیدا باسکراوە دەبێتە ئەزموون بۆ خوێنەرەکەی.

کرۆنیکا: ڕاستە بۆ من کێشە نییە، بەڵام وەکو فزوڵییەك حەزمکرد بیزانم.

ماکوان: ئەوەی دەتەوێت بیزانیت وەڵامەکەی بەڵێیە، هەمووی ڕاستە!

کرۆنیکا: ئەتوانم لەو مەملەکەتی عیشقەدا منیش جێگام ببێتەوە؟!

ماکوان: ئەوەندە بە ئاسانی خۆت ئەدەیت بەدەستەوە؟ ئاخر خۆ من کرم و مار و مێروو نیم هەرکەس ببینم ئارەزووم بچێتە سەری! ڕاستە تۆ ئافرەتێکی جوانی و ناسکی، مانای ئەوە نییە عیشق و شەهوەت یەك بگرنەوە، دروستە بەشێك لە عیشق شەهوەتە، بەڵام لەگەڵیشیا پرنسیپە.

پێم وانییە تۆش ئەوەندە کەسێکی ئاسان بیت وا زوو خۆت بدەی بەدەستەوە، مەگەر شتێك لە پشتیەوە هەبێت، یان ئافرەتێکی سۆزانیت! بمبوورە کە وادەڵێم، یاخود لە دەزگا و کۆمەڵەیەك و ڕێکخراوێکەوە هاتوویت بۆ ناشیرینکردنی من، گریمانی کۆتایی کە زۆر لاوازە ئەویش ئەوەیە کە هەژمونی مەملەکەتی عیشقت بەسەرەوەیە و ئەتەوێت کارەکتەرێك بیت لە کارەکتەرەکانی ناو مەملەکەتەکەی من، بڕوایشم نییە لەم وڵاتەدا تۆ ئەوەندە بە ئاسانی بیر بکەیتەوە.

کرۆنیکا: ئەوە بۆ ئەو هەمووە شیکارییەت بۆ کردم و پێم وانییە، تۆ کەسێکی ئاسایی بیت و بە قسەی من کاریگەریت لەسەر دروستبکات.

ماکوان: نا، بڕوا مەکە ئەزموونم زۆرە لەگەڵ خەڵکی وەکو تۆدا، پێم بڵێ کێ ناردویتی و بۆچی هاتوویت و چیت دەوێت و بای چەندی، چیت لە مێشکایە، چۆن و چی و بەچی، لەچیایت؟

کرۆنیکا: هێواش ماکوان، چارەسەری من لای تۆیە و فریام کەوە بۆ ئەوەی لەناو نەچم!

ماکوان: خێر چییە؟

کرۆنیکا: من دەزانم ناتوانم ئەوەی دەمەوێت بەدەستی بهێنم لەگەڵ تۆدا، دەشزانم کەسێکی ئاسان نیت، چوونکە باسی تۆیان بۆ کردووم دەزانم ئەوەندە بەئاسانی ناتوانم ئامانجم بپێکم. قسەت زۆر لەسەر کراوە، ڕاستیت دەوێت نە مەملەکەتی عیشقم خوێندۆتەوە نەهیچ تەنها نێردراوم بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆم بە تۆ بکەمەوە! تۆ هیچ تاوانێکت نییە، بەڵام من تاوانبار کراوم بەوەی کە ئەگەر تۆ هەڵنەخڵەتێنم ئەو تاوانەم بێدەنگی لێناکرێت!

ماکوان: یا الله، بزانم چیت لە ژێر سەردایە، باش بوو زوو دانت نا بە کارەکانتدا ئاقڵیەکەشت لەوەدا بوو خۆتت ناساند و منیشت ناسی.

کرۆنیکا: زۆر بەڕاشکاوی و بە کورتی من لەگەڵ خۆشەویستەکەم دەستم تێکەڵ کردبوو، بەڵام ئەو تەنها دەستی پێگەرم دەکردمەوە و وێنەی ڕووتی گرتبووم لەکاتی سەرجێیدا بەیەکەوە، بەوەش چەند جار فشاری تری بۆ هێنام لەگەڵمدا ڕابوێرێت ڕازی بووم، بەڵام کارەکەی زۆر ڤیزەون بوو هەوڵی ئەدا ڤیدیۆم بگرێت و بڵاوی بکاتەوە و بینێرێت بۆیەکێك لە کۆمپانیا پۆرنەکان، منیش ئەوەم پێقبوڵ نەکرا و کوشتم!

ماکوان: هەر کوشتت! کوشتت؟!

کرۆنیکا: بەڵێ هەرکوشتم! کوشتم! بەڵام دەستی کرد بەگریانێکی زۆر.

ماکوان: من کاتی گریانم نییە، ئەگەر دەگریت بەجێت دەهێڵم و دەڕۆم کە تەواوبوویت لەگریان وەرەوە بۆ لام.

کرۆنیکا: باشە ناگریم، تەنها گوێم بۆ بگرە.

ماکوان: فەرموو!

کرۆنیکا: لەدوای کوشتنی کەسی یەکەم هاوڕێکەی پێیزانیم، بەڵام نەیهێشت کەس بزانێت خۆشەویستەکەمی خستە ناو عەلاگەی ڕەشەوە و بردمان لە شوێنێکی دوور چاڵمان بۆ هەڵکەند و فڕێماندایە ناو خاك.

پاشان کەسی دووەم بەهەمان شێوەی ئەو بوو ئەویش هەمان کاری لەگەڵدا کردم وەکو فشارێك بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبم، فیلمی دەگرتم کە پێمزانی بۆ هەمان کۆمپانیای پۆرنی ناردبوو، بیرم لەوە کردەوە کەسێك ئەوەندە پیس و قیزەون بێت باشترە بینێرم بۆ جێگای ئەوەی یەکەم! پلانم دانا بۆ کوشتنی، نەمزانی بوو کامێرای شاراوەی داناوە لە هەموو لاکانەوە بۆ جوان تۆمارکردنی فیلمە پۆرنەکان، لەدوای کوشتنی ئاشکرا بووم.

ماکوان: ماندوو نەبیت! بەڕاست ئەمە ڕاستییە یان فیلم ئەگێڕیتەوە؟ جورئەتی کوشتنی زۆرت هەیە، با منیش بڕۆم نەکو بمکوژیت!

کرۆنیکا: من کەسێك دەکوژم یاری بەلاشەم بکات، تۆ لەوانەیت کە یاری بەلاشە بکەیت؟

ماکوان: استغفرالله، یاری کردن بەلاشە؟ لە کوشتنی تۆ ناترسم، بەڵام لە سووتانی خوای پەروەردگارم دەترسم. لە تۆ جوانتر و ناسکتریش هەیە

حەزەکانی خۆمی پێ بەتاڵ بکەمەوە لەم وڵاتە ئەوروپیانەدا، جا بە پارە بێت یاخود بە قسەی خۆش و هەڵخەڵەتاندن، لەگەڵ ڕێزم تۆش هەر جوانیت، بەڵام مانای وانییە ئیتر دەستکەوت و نێچیری هاوشێوەی تۆ نەبێت ئەگەر من ڕاوکەر بم، هیوادارم لێم تێبگەیت. بۆ ئەوەی وا نەزانیت کە بەتەنها تۆ هەیت و کەسی تر نییە، ئەگەر چاوبگێڕیت هاوشێوە جوانی و لەشوو لاری تۆ زۆرە لەم چواردەورەدا، وایە؟

کرۆنیکا: وایە، من چیبکەم و چۆن هاوکاریم دەکەیت؟

ماکوان: من نازانم تۆکێیت؟ ڕاست دەکەیت یان درۆ؟ داواکاریت چییە و ئەتوانم چیت بۆ بکەم؟

کرۆنیکا: دەمەوێت لەگەڵتا بخەوم و ڕووتت بکەمەوە و وێنەت بگرم! وێنەکەت بدەم بەو کەسانە، پارەش چەند دەڵێیت بۆت پەیدا دەکەم لە بانك بۆت قەرز دەکەم بالەم کێشانە ڕزگارم ببێت.

ماکوان: واتا فیلمی پۆرن بەمنیش دروست دەکەیت؟ تۆ من دەناسیت؟

کرۆنیکا: نا هەمووی هەفتەیەکە باسی تۆیان بۆ من کردووە، هەست دەکەم ڕقیان لێت بێت و کێشەی خێزانیت بۆ دروست بکەن، منیش وام دانابوو بەڕاستی هەموویت پێ بڵێم خۆشم دێم بۆ لای خێزانت پێی دەڵێم کە تەنها تەمسیلیەکە ئەوەندەم لێقبووڵ بکەن، بۆ ئەوەی ڕزگارم بێت لەدەستی ئەم سەگانە.

ماکوان: کەسایەتی من زۆر لەوە گەورەترە ئەوەی بیری لێدەکەیتەوە، من ئەگەر کێشەی خێزانم هەبوایە ئاسانترین بوو، چوونکە کەس نییە ئەوەندەی خێزانم متمانەی بە من بێت دەبوو پێش ئەوەی بڕیار بدەیت و ڕازی بیت بۆ ئەو کارە من بناسیت، ترسناکی و قیزەونی کارەکەشت بزانیایە.

کرۆنیکا: دەزانم کارەکەم قیزەون و خراپە، بەڵام ئەوەندە نییە لە داواکارییەکەم ڕاستگۆم لەگەڵتا؟

ماکوان: ئەی ماشاء الله لەم ڕاستگۆییە! هاتوویت دەڵێیت وەرە باکەرامەتت بشکێنم و بزمارێك بدەم لە تابوتەکەشت، ئاخر ئەمە ڕاستگۆیي نییە بەلکو ئەمە نیشانەی لاوازی تۆیە، جا من چۆن بەوە ڕازی دەبم.

کرۆنیکا: ئەی من بگیرێم؟

ماکوان: ئەی هەردوو چاوت دەربێت! ئەی من حەیا و شەرەف و کەرامەت و خانەوادە هەمووی بۆ تۆ بخەمە ژێر پێم لە پای چیی؟ تۆ کە خۆت تێکەڵی ئەو پیسانە بوویت دەبو بزانیت بە کوشتنی دوو کەس ناردویانیت بۆ لای من کە ئەو کارە بکەیت لێتخۆش بن و قسە نەکەن؟ بۆ زانیاریت جارێ ئەوان هەر قسە ناکەن ئەگەر یەك بەیەکیان بکوژیت، چوونکە کارەکەیان یاسایی نییە بۆیە نە تۆ ئەدەن بەدەستەوە نە سکاڵاشت لەسەر تۆمار دەکەن، تەنها بەکارت دەهێنن.

کرۆنیکا: وانییە من لەکاتی کوشتنی هەردووکیاندا وێنەم گیراوە، بێجگە وێنەی تری خۆم بە ڕووتی لەکاتی سەرجێیدا.

ماکوان: بەڵێ دەزانم پیس بۆ لای پیس دەچێت، تۆش لە بنەڕەتدا لە پیسەکانی، تەنها جیاوازییەکت هەبوو کە تۆ بەدوای خۆشەویستی ڕۆحەوە بوویت، ئەوانیش بەدوای خۆشەویستی لاشەتەوە.

کرۆنیکا: تکایە هاوکاریم بکە هەروا دەستم لێ بەرمەدە!

ماکوان: بەسەرچاو وەرە بابچین بۆ فەرمانگەی پۆلیس، هەموو ڕاستییەکان باس بکە ئەوکات تاڕادەیەکی باش تاوانەکەت لەسەر کەم دەبێتەوە.

ئەشتوانیت بڵێیت دەستدرێژی سێکسی کراوەتە سەرت ئەوە بار و گوزەرانەکەمە، ئەوە باشترین حاڵەتە کە بیکەیت. ئەوەش تەنها هاوکاریەکە من دەتوانم هەمبێت دێم شایەتیت بۆ ئەدەم کە تۆیان ناردووە هیچت لەگەڵ من نەکردووە، ئەو کات لەوانەیە تۆ بە باشی لێیدەربچیت!

کرۆنیکا: پێت وایە ئەوە ڕێگا چارەسەر بێت بۆ ئەوەی لەم کێشانە ڕزگارم بێت؟

ماکوان: تاکە ڕێگایە کە لەزیندانەکەتدا بە ئازادی و بە ئارامی بژیت، ئەگەر چی زیندان بیت لە چوارچێوەی دیوارێك دایت، بەڵام ئەگەر ئازاد بیت ئەوە ژیان نییە تۆی تێدا دەژیت. ئاگات لەخۆتە چیت لێ بەسەر هاتووە؟ هەموو چرکە ساتێکت نەك زیندانە، بەڵکو مردنە ! بەس پێم بڵێ ئەو کەسە کێیە تۆی ناردووە؟

کرۆنیکا: من هاتم بۆ ئەوەی خۆم بە تۆ ڕزگار بکەم کەچی تۆ هاتوویت ئەتەوێت بە ئاسانی بمدەیت بەدەستەوە؟ ئەی بۆ هاوکاریم ناکەیت؟ من خۆم دێم بۆ لای خێزانت هەموو شتێکی پێدەڵێم ئێمە ئافرەتین و زوو لەیەك حاڵی دەبین ئەوکات پێت دەڵێم ئەو کەسەش کێیە کە منی ناردووە.

ماکوان: وەڵڵا بڕوام نییە شتی وا ڕووبدات و مەیە بۆلای خێزانم، شتی وای لا باس بکەیت پێم وایە قژ بەسەرتەوە نەهێڵیت، خۆشت مەخە ئەو هەورازە سەختە! کەسی من تۆ نازانیت کەسایەتی من کێیە و بۆچی تۆیان ناردووە، کەسەکە کێیە و چ کارەیە؟

کرۆنیکا: نا - من نازانم ئەرێ بەڕاست تۆ کێیت؟

ماکوان: من مەلام..

کرۆنیکا: وەی لەم مەلایە خۆ جینزی لەپێدایە! مەلام نەدیووە وەکو تۆ بێت، ئەی کوا شتە سپییەکەی سەرت؟ وتیان ڕۆژنامەنووسە!

ماکوان: شتە سپییەکەی سەرم گرنگ نییە، گرنگە ئەو سپیایەتییە لە ناو دڵمدا بێت و کابۆکەی پێشم کە تۆ پێی دەڵێیت جینز، داپۆشەرمە و بۆ من ئاساییە گرنگ ئەوەیە شەرعی بێت. لەبەر ئەوە تۆ ئەقڵت لەچاوتایە بۆیە پیاوکوژ و لاشە فرۆش دەرچوویت و یاری بەلاشەی خەڵکی تر دەکەیت، ئەی ناترسیت لەوەی کە ئەو کەسەی یاری بەلاشەی دەکەیت بەدەردی هاوڕێکانی خۆتت بنێریت و بتکوژێت، لاشەکەت دەرخواردی سەگ بدات، ئەی کە دەزانی ڕۆژنامەنووسم چۆن حسابی ژیان و کەسایەتی کۆمەڵایەتی من ناکەیت هەروا ئاسانە؟

کرۆنیکا: بەڕاست تۆ کێیت؟ وەڵڵا ئێستا لە خۆمەوە لێت دەترسم.

ماکوان: نا مەترسە لە من لە خۆت بترسە، کۆتا جارە بیرت دەخەمەوە کە برۆ خۆت تەسلیم بکە و منیش هاوکاریت دەکەم پارەی پارێزەرەکەشت لەسەر من.

کرۆنیکا: پارەم زۆرە، بەڵام دایکم زۆر بێکەسە کەسی نییە ئەگینا ئەوەی تۆ دەیڵێیت بیرم لێکردۆتەوە، لە ڕاستیشدا حەزی پێدەکەم.

ماکوان: من پارێزەرێکم هەیە بەیەکەوە دەچین بۆ لای، زیاترم بۆ باس بکەو با زیاتر هاوکارت بم. لەکوێ دەژیت؟ بتگەیەنمەوە یان سەیارەت پێیە؟

کرۆنیکا: سوپاس سەیارەم پێیە، چۆن یەکتر ببینینەوە، دەتوانیت تەلەفونەکەی خۆتم بدەیتێ؟

ماکوان: هەر کات تەلەفونت کرد لە کوێ ویستت یەکتری دەبینینەوە ئەوەش ژمارەی تەلەفونەکەمە، ئەی چۆن لەم بازاڕەدا منت دۆزییەوە؟

کرۆنیکا: نیشانیاندام! توخوا سەرم لێ تێك چووە نامەوێت زیاتر خۆم و خەڵکی تریش بەخۆمەوە سەرگەردان بکەم.

ماکوان: لەخوا دەترسیت؟

کرۆنیکا: بڕوام بە خوا نییە، ئەگەر بوایە وام لێنەدەهات!

ماکوان: زۆر لەسەری نەڕۆشتم، پێموت تۆ هەر خوا ڕەحمی پێکردوویت کە لەدەرگای منت داوە.

ماڵئاوایمان لە یەکتر کرد ڕۆیشت، منیش خۆم لێ ون کرد بەشووێنیدا گەڕامەوە و شووێنی کەوتم، بەڵام ئەو گریمانەشم دانابوو کە خەڵکێك چاودێری دەکات منیش دەبینێت، چوونکە دیارە لە سەرەتاوە منی نەناسیوە. بۆیە چوومە ناو سەیارەکەم نزیکی مزگەوت بوومەوە سەیارەکەی خۆمم دایە دەستی کوڕێکی هاوڕێم لە مزگەوتەکەدا سەیارەکەی ئەوم وەرگرت و شووێنی کەوتم، باش بوو لێم ون نەبوو شووێنی کەوتم و تا لەشارەکەی من دەرچوو، چووە سەر جادەی خێراو ڕووە و شارێك لە نزیك شارەکەی من، بە شووێنییەوە بووم تا گەیشتە بەردەم شووقەیەك سەیارەکەی بردە ناو گەراجی شووقەکە و هاتە دەرەوە و بە کلیلی خۆی دەرگای سەرەکی باڵاخانەکەی کردەوە، لە دوورەوە تەماشام کرد نەمزانی خۆی کرد بەکام شووقەیەدا، تەماشای ناوی ماڵەکانم کرد کرۆنیکای تێدا نەبوو، بەڵام ناوی ئافرەتێکم بەدی کرد نووسرابوو فاتیمە سەعید شووقەی ژمارە ١١ بوو.

بەهەرحاڵ گەڕامەوە و بۆ بەیانی کاتژمێر ٢ تەلەفونی بۆ کردم وتی من ئامادەم با بڕۆین بۆ لای پاڕێزەرەکەت.

دیسان بوویەوە بە گومان بۆم خۆم تەلەفونم کرد بۆ پارێزەرەکەم و هەموویم بۆ ڕوونکردەوە چی ڕوویداوە، ئەویش وەکو خۆم تەقەی مێشکی دەهات دەیوت ماکوان کەسێك دووکەس بکوژیت چۆن کاری وا دەکات، خۆی تەسلیم دەکات لانی کەم لە سەرو بیست ساڵ زیندانی دەکرێت، ئەگەر عەمدیش نەبێت.

## ئاشکرا کردنی پلانێك لەلایەن سەسیل

هەرچی سەرم دەهێنا و دەبرد بەتەنها پیاسەم دەکرد بیرم لێدەکردەوە ئەم چیرۆکەم بۆ هەڵاوێر نەدەکرا، ئافرەتێك لەم وڵاتە ئەورپییەدا دوو کەس بکوژێت شەرەف و کەرامەتی خۆی لا ئەوەندە خۆشەویست بێت، بەڵام شەرەف و کەرامەتی خەڵکی تری لا ئاسان بێت! بەدەم خۆمەوە هەر قسەم دەکرد بۆڵە بۆڵم بوو ئاخر چۆن دەبێت وا بکات؟ دواییش ئەوەندە شەریف و خاوەن کەرامەت بێت هەموو ڕاستییەکانم پێ بڵێت! بیرم دەکردەوە دەبێت چی لە پشت ئەم هەموو قسەو باسەوە بێت کە بۆم نەدۆزرایەوە و سەرەداوێکم لێ دەست نەدەکەوت، ئەمە ڕاستی بێت یاخود فێڵ؟ ئەبێت چییان لەمن بوێت؟

زوو زوو هەناسەیەکم هەڵدەکێشا دەچوومەوە سەری دێر، دەمهێنا و دەمبرد هیچ تێنەدەگەیشتم تۆ بڵێیت ڕاست بکات؟

نەمدەوێرا بەکەس بڵێم بێجگە پارێزەرەکەم ئەویش هیچی لێ حاڵی نەبوو، ئەوەندەش پارە خۆشەویست بوو کە قسەکردن لای ئەو بە پارە بوو، ناچار بووم زۆر پرس و ڕاوێژ بەپارێزەرەکەم نەکەم.

بیرم کردەوە کێ باشە لەگەڵیدا ئاخاوتن بکەم، تاکە کەسێك ئەقڵم گرتی کوڕێکی هاوڕێم بوو لە سەرکار دەمناسی، کوڕێکی وریا بوو لە بواری ئافرەت و باندە مافیایەکانی ناو ئەم وڵاتە، ئەوەی خواناسی بوو نەیدەزانی، تەنها مەشروب خواردن و فرۆیشتن بە قاچاخ، جگەرە، ئافرەت و شەڕ بوو!

شەوێکیان بەیەکەوە کارمان دەکرد لە شاری ئۆسلۆ چەند ئەلبانییەك هاتنە ناو دوکانەکە ویستیان دزی بکەن، شەڕێکی تا بڵێی خەست و پیاوانەمان

کرد، سەردەمی ئەم شەڕە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠٠٣ هەستم کرد کوڕێکی ئازایە هەرچەند تازە بوو لەکارەکەی. ئەوکاتە خێزانم گواستبووەوە، لەشەڕەکەدا چەند تێڵایەکم دابوو لە ئەلبانییەکان و خوێنم لەسەریان هێنابوو، من و ئەو کوڕەی کە پێکەوە کارمان دەکرد جلەکانمان وەکو یەك بوو کامێرەی دوکانەکە جوان نیشانی نەدابوو بێجگە لە جلەکانیشمان باڵاو قژ و سیمامان لەیەکەوە نزیك بوو، ئەوکاتەش کامێرەی دوکانەکەمان دیجیتاڵ نەبوو ڕەش و سپی نیشانی ئەدا و دەنگیشی تۆمار نەدەکرد، کاتێك من دارەکەم وەشاند پۆلیسەکە پرسی ئەوە کامەتان بوون؟ ئەو کوڕە لە پڕ وتی: من بووم، یەکسەر ئەویان کەلەپچە کرد!

منیش بەکوردی قسەم کرد و ڕووم کردە (کاوە) وتم کاکە ئەوە منم تۆ نەبوویت؟

کاوە: هیچ قسە مەکە تۆ تازە ژنت هێناوە، ئەگەر حوکمی کەوتە سەر با من حوکم بدرێم!

ئەو شەوە هەردووکامانیان برد، شەوی شەممە بوو دوکانەکەمان داخست، بۆ بەیانییەکەی ڕۆژی یەك شەممە ئازاد کرام و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام زۆر ویژدانم ناڕەحەت بوو ناچار بە خێزانم وت: "بگەڕێوە بۆ ماڵی باوکت من دەچم خۆم تەسلیم دەکەم"، خێزانم ناردەوە هاتم بۆ دوکان بە خاوەن کارەکەم وت: "باجارێکی تر تەماشای ڤیدۆکە بکەمەوە" سەیرمان کردەوە وتم: "ئەوە منم دارەکە دەوەشێنم کاوە نییە"، خاوەن کارەکەش وتی: وایە!

داوام لێکرد کە شاهیدیم بۆ بدات دەچم خۆم تەسلیم دەکەم، پێم ناخۆشە ئەو کوڕە بێتاوانە بگیرێت.

هەرچۆن بوو خۆم گەیاندەوە بەڕێوبەرایەتی پۆلیس، چوومە پرسگەکە پۆلیسێکی لێ بوو وتی: فەرموو!

ماکوان: هاتوم سکاڵایەکم هەیە!

پۆلیس: لەسەر کێ؟

ماکوان: لەسەر خۆم، خۆم تاوانێکم کردووە پێویستە ڕاستییەکە بڵێم!

پۆلیس: بەسەر سوڕمانەوە، چی بووە چیت کردووە؟

ماکوان: ڕووداوی شەڕەکەم بۆگێڕانەوە کەچی ڕوویداوە، ئەوەشم ڕوون کردەوە کە لەتاو ئەوەی ئەلبانییەکان زۆر بوون ئێمەش تەنها دوو کەس بووین بۆیە دارم بەکار هێناوە، ئەوەی کە تێلاکەی وەشاندووە من بووم، نەموت کاوە دانی ناوە بە تاوانەکەدا بەڵکو وتم دوای تەماشای ڤیدۆکەم کردۆتەوە لە دوکان، خاوەن کارەکەشم شاهیدی ئەدا کە من بووم نەك هاورێکەم.

پۆلیسەکە: من هیچ تێناگەم، ئەگەر ژمارەی ئەو کێشەیەت لا بێت دەتوانم بیدۆزمەوە.

ژمارەکەم نەزانی بۆیە بردیانمە ژورێکی تەنها، ئیتر لەوێوە قسە و باسەکانیان لێپرسیم.

چووم ڕۆژی دووشەمە بوو کە چووم خۆم تەسلیم کرد دوای گەڕان بە داوای کەیسەکەماندا، یەکێك لە پۆلیسەکان هاتەوە وتی: "ڕاستە ئەوکێشە ڕوویداوە، بەڵام هاورێکەشمان ئازاد کردوویت! کارەکەی ئێوە پارێزگاری بووە لە خۆتان، ئەو چەند کەسەش دانیان ناوە بە تاوانەکانیاندا کە بۆ دزی هاتوون، هاورێکەشت چەند کاتژمێرێك پیش ئێستا ئازاد کرا، تەنها (٢٥٠٠) کرۆن سزادراوە! بڕۆ خۆت پارەکەی بدەرەوە یان کاتێکی تر وەرن با وەصلەکەتان بۆ بگۆڕین، مادام تۆ ڕاستگۆیت و هاورێکەی خۆتت خۆش دەوێت، تۆش ئازادیت دەتوانیت بڕۆی بۆلای هاورێکەت. ئامۆژگاریتان

دەکەم هەرگیز شەڕ مەکەن، ئەگەر دزیشتان لێکرا ئێوە هەڵمەسن بە کاری پۆلیس، با پۆلیس کارەکانی ئەنجام بدات! پارەکەیان بدەنێ و یاخود با دزییەکە بکەن دوای خۆمان دەیانگرین و بە یاسا مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین".

ماکوان: باشە بەسەر چاو! لەدڵی خۆمدا "ئەم قسەیە کەی بە مێشکی کورد دا دەچێت دزی لێبکەن بەبێدەنگی بووەستێت"!

زۆر دڵخۆش بووم هاتمە دەرەوە تەلەفونم کرد بۆ خاوەن کارەکە و وتم: کاوە بەربووە!

خاوەن کارەکەم: وەرە لای منە چاوەڕێی تۆ دەکات.

پێش ئەوەی من بگەڕێمەوە سەعید، کە ئێرانی بوو و فارس بوو هەموو باسەکی بۆ گێڕابووەوە کە من ویژدانم نامورتاح بووە و چووم بۆ پۆلیس.

کە چووم لەوێ دانیشتبوو لەو ساتەوە ئەو کوڕە زۆر ڕێز و تەقدیری لە لامدا هەبوو، باوەشمان کرد بەیەکدا و خۆشەویستییەك دروست بوو هەرچەندە ماوەی مانگێك بوو کارمان دەکرد بەیەکەوە، بەڵام لەو ساتە وەختەوە هەستم بە پیاوەتی دەکرد، بە هەمان شێوە ئەویش هەستی خۆشەویستی زۆر زیاتر بوو، زۆر ڕێزی لەمن دەگرت. کات تێپەڕی و ژیان هەمووانی لەیەك دوورخستەوە، هەریەکەمان چووینە شارێکی تر، بەڵام یەکترمان هەر دەبینی جاروبار لە شاری ئۆسلۆ و لە فەیسبوك و بۆنەکاندا کە تایبەت بوو بە کوردەکان لە ئەوروپا و ژمارەی تەلەفونی یەکترمان لا مابوو.

تەلەفونم بۆ کرد کە دەمەوێت ببینم، بەڵام وەرە بۆ لام من کارێکی گرنگم پێتە. لە شارەکەی من دووربوو چەند کاتژمێرێك! ئامادەیی دەربڕی و وتی: "کەی بێم؟"

ماکوان: ئەگەر ئیشت هەیە شەممە و یەکشەممە وەرە، ئەگەر کاریشت نییە کەی بۆت کرا وەرە.

کاوە: نەوەڵڵا کارم نییە، هەمووی دوو هەفتەیە لە زیندان بەربووم!

ماکوان: بۆ گیرابوویت؟

کاوە: بەڵێ، ماوەی ساڵێك زیندانی کرابووم.

ماکوان: پێم ناخۆشە، چی بووە؟

کاوە: هیچ نەبوو لە دوو عەرەبم دابوو، یەکێکیان دەستی شکا! وامزانی زانیوتە ئیشت بۆ دۆزیومەتەوە؟

ماکوان: ناوەڵڵا نەمزانیووە، کەوابێ جاری مەیە تا خۆم تەلەفونت بۆ دەکەم، تەلەفونم کرد بۆ هەندێك برادەری خۆم لە نزیك ئەو داوام کرد کە هەندێك پارە بدەن بە کاوە، چوونکە زانیم گیرفانی زۆر بەتاڵە. پارەیان دابووێ و هات بۆ لام چووم بە شووێنیدا بۆ ویستگەی شەمەندەفەر، دوای چۆن و چاکی هەواڵ پرسین.

کاوە: چی بووە مامە ماکوان؟

بۆمگێڕایەوە کە دوو ڕۆژ پێش ئێستا تووشم بووە بە تووشی ئافرەتێکەوە، هەموو ڕووداوەکەم وەك خۆی بۆ گێڕایەوە.

ماکوان: بانگی ئەو کچە بکەم هەتا تۆ لەگەڵم دایت، بزانم خوێندنەوەت بۆی چییە؟!

کاوە: چیت بۆ بکەم؟

ماکوان: نازانم چی بکەین و چی تێدەگەیت؟

کاوە: بانگی بکە و بزانین چی دەبێت.

ماکوان: جارێ بابڕۆینەوە بۆ ماڵەوە.

گەڕاینەوە ماڵەوە ئێوارەی هەینی بوو، لە دوای ئەوەی کە پشووماندا زۆر سەرقاڵ بووم بە بیرکردنەوە لەو ئافرەتە.

کاوە: بۆ تەلەفونی بۆ ناکەیت ئێمە بچین بۆلای، ئەگەر ڕاستی کرد شووێنی خۆیمان پێدەڵێت خۆ ئەگەر درۆشمان لەگەڵ بکات ئەوە دوامان دەخات تا خەڵکەکانی لەگەڵیدان بانگ دەکات، شووێن و جێگای دەزانیت؟

ماکوان: بەڵێ لەو شارەی نزیك خۆمانە.

کاوە: با بڕۆینە ئەوێ لەوێ تەلەفونی بۆ بکە ببینین، بۆ ئەوەی زوو بگەینە لای پێش ئەوەی خەڵکەکانی دەوروپشتی کۆبکاتەوە، خۆت قسە لەگەڵ بکە و منیش زانیم کەس نییە لەو دەوروپشتە یەکسەر دێم بۆلاتان، ئاوا پێم باشە؟

ماکوان: پێشنیارەکەیم بەدڵ بوو، چووین لەنزیك شووقەکان تەلەفونم بۆ کرد، کرۆنیکا دەمەوێت ئەمشەو بتبینم؟

کرۆنیکا: ئاساییە من بێم بۆلات؟

ماکوان: من دێم بۆلات ئەگەر ئاساییە؟

کرۆنیکا: وەرە من دوێنی چاوەڕێم کردی بۆ نەهاتی؟

ماکوان: کارێکم بۆ هاتە پێش، تکایە ئەدرەسی ماڵەکەت بنێرە بابێمە لات.

کرۆنیکا: ئەدرەسەکەی نارد ئەو جێگایە بوو کە لێ وەستابووین و ژمارەی دەرگاکەشی نارد هەر ئەو ناونیشانە بوو دەستنیشانم کردبوو، ماڵی فاطمە سەعیدەکە بوو شووقەی ژمارە ١١

بە کاوەم وت هەمان ئەدرەسە ڕاستگۆیە.

کاوە: تەلەفونی بۆ بکەرەوە بزانە هەرکات بچین ئاساییە؟

تەلەفونم بۆ کردەوە "ئاساییە هەر کات بێم؟"

کرۆنیکا: بەڵێ ئاساییە هەر کات دێیت ئاساییە.

ماکوان: کاوەی برام دەتوانیت خۆت لەم ناوە حەشار بدەیت، کە من دەچمە ژوورەوە با تەلەفون کراوە بێت لەنێوانمادا هەرچی بوو ئاگادارت دەکەمەوە، باشە؟

کاوە: باشە با چەقۆکەی دەستت کراوە بێت، کراسەکەت قۆڵکورتە ئەو کراسەی من بکە بەرت بیخە ژێر قۆڵی کراسەکەت، ئەگەر زانیت خەڵکی لێیە بە چەقۆ داینکوتە یان بیانجنە، دەرگا بکەرەوە منیش خۆمی پێدا دەکەم.

کراسەکەمان گۆڕیەوە لەناو سەیارەکەدا، کاوە دابەزی و بڕوات خۆی حەشار بدات منیش هەندێك وەستام بۆ ئەوەی خۆم ئامادە بکەم و بڕۆم. دەنگێك لە پشتی سەیارەکەمەوە هات " ئەوە چی دەکەیت؟" ئاوڕمداوە سەسیل بوو!

سەسیل: بۆ کوێ دەچیت؟

ماکوان: سەلەی برام تۆیت، وەڵڵا شتێك ڕوویداوە بەدەمیەوە دەچم.

سەسیل: نەکەیت! بەچوونە ژوورەوەت چەقۆت پێ بێت و هیچیشت پێ نەبیت هەر دۆڕاندوتە.

ماکوان: ئاگاتان لە منە چی ڕوویداوە سەلەی برام؟

سەسیل: بەڵێ ئاگامان لێتە، ئەو ئافرەتە بەشێك لە قسەکانی ڕاستە بەشەکەی تری لە ماڵەکەی خۆیدا کامێرەی تێدایە، هەر بچیتە ژوورەوە وێنەت گیراوە بەڤیدیۆ، جا ئەگەر چەقۆی لێدەربێنیت هەر قوڕت بەسەر و دەگیرێیت، چەقۆش دەرنەهێنیت ئەو خۆی ڕووت و قووت دەکاتەوە وێنەت دەگیرێت کە بە ڕووتی لەگەڵ ئافرەتێکدا لە ماڵێکدای! چۆن دەچیتە ماڵی، ئەو بەدوای تۆیەوە بۆ ئەوەی شتێکت لێبگرێت تۆش هەروا بەئاسانی خۆت تەسلیم دەکەیت؟

ماکوان: بەخوا ڕاست دەکەیت سەلەی برام، زۆر ترسناکە من ئەقڵم بەوانە نەشکا!

سەسیل: مەچۆ هەولدە بەڕۆژ بیبنیت و لە دەرەوە لەناو جێگا و شووێنی قەرەباڵغیدا، ئەوەی دەوێت تۆ بچیتە لای بەتەنهایی!

ماکوان: ئەی چۆن وتت بەشێك لە قسەکانی ڕاستە؟

سەسیل: ئەوە دانێ بۆ شێخ بەرقان و حەزقیل دوای خۆیان تێت دەگەیەنن، بەڵام تکایە بەبێ ئێمە هیچ مەکە، ئەگەر ساڵێکیشمان پێ چووە نەهاتووین بۆلات. من دەڕۆم ئەوە کاوەی هاوڕێت هاتەوە دەپرسێت بۆ نارۆیت هیچ بووە؟

کاوە: ئەوە بۆ نارۆیت چی ڕوویداوە، بۆ وەستاویت؟

ماکوان: سەرکەوە ئیشم پێتە، هاتەوە ناوە بۆم باس کرد کە بیرم بەلای شتیکی ئاوادا چووە، ئەوەی کە سەسیل بۆی باس کردم بۆ ئەوم باسکرد.

كاوە: بیركردنەوەكەت مەعقولە، تەلەفونی بۆ بكەرەوە بڵێ میوانم هاتووە ناتوانم بێم، بیخەینە كاتێكی تر بزانین چی باشە بیكەین.

ماكوان: تەلەفونم كردەوە بۆ كرۆنیكا داوای لێبوردنم كرد كە میوانم هاتووە ، كاك كاوەی ڕەفیقم هاتووە  ناتوانم بێمە خزمەتتان بۆ كاتێكی تر یەك دەبینین!

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە لەگەڵ كاوە، ئەو شەوە هەر بیرم دەكردەوە تا نوێژی بەیانی خەوم لێنەكەوت. نوێژم كرد و خەوتم، بۆ بەیانی وەكو هەموو ڕۆژانی تر هەڵساین نانمان خوارد، زۆربەی كاتەكانی شەممە و یەك شەممان هەر خۆم لەماڵم لەبەر ئەوەی ماڵومنداڵ دەچن بۆ ماڵی نەنكیان.

چاوەڕێ بووم حەزقیل، سەسیل، شێخ بەرقان یان ڕاقی دەركەون، بەحەنانەش ڕازی بووم! كەس نەهات.

كارێكی دوو سەعاتیم هەبوو دام بە كاوە، وتم مەگەڕێرەوە لەم شارە كار بكە. ئەو كارەی من بەرە من ئیشی ترم هەیە.

لێرەش كوڕێكی كوردی سووریا هەیە بچۆ لای ئەو بژی، كەوام وت زۆر خۆشحاڵ بوو خێرا دوای نان و چای بەیانی ڕۆشت وتی دەچم جلەكانم دەهێنم، پیشتریش قسەم كردبوو لەگەڵ موحسین كە یەكێك بوو لە كوردەكانی ڕۆژئاوا داوای كردبوو لەمن ئەگەر كەسێكی باشم شك برد لەگەڵی بژی، چوونكە بەتەنها ناتوانیت پارەی شووقەكەی بدات.

منیش بەتەنها مابوومەوە نەمدەزانی چی بكەم و چی بڵێم و چۆن هەنگاو هەڵبهێنمەوە، دڵم خەریك بوو ئەتەقی بۆ ئەوەی بزانم كەی ئەم جنۆكانە دێنەوە لام! دەسەڵاتم نەبوو لە ئارامگرتن زیاتر، دەهاتم و دەچووم وەك ئەوەی لە كۆریدۆری و ناو زینداندا بم لە قاوشەكانیدا چۆن زیندانەكان پیاسەدەكەن دێن و دەچن ئاوا دەهاتم و دەچووم هەموو لێوی خۆمم

گەستبوو، داخ لەدڵ بووم بۆ ئەوەی بزانم کێن ئەوانەی ئەم بێشەرەفییەم لەگەڵدا دەکەن.

کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات چووم بۆ مزگەوت نوێژم کرد، گەرمایەکی زۆر بوو لەناو مزگەوت مامەوە دەستم کرد بە قورئان خوێندن، چوونکە شەو دڕەنگ خەوتبووم هەستم دەکرد وەنەوز ئەدەم. خەوم لێکەوت قورئانەکەم بەسنگەوە بوو ئەوەندە دەزانم مەلای مزگەوت هاتە لام و وتی ئەبو ئاناء هەستە کاتی نوێژی عەسرە، نزیکەی چوار کاتژمێربوو خەوم لێکەتبوو! ئەوەندە لاشەو مێشکم ماندوو بوو دیاربوو قورئانەکەم لەدەست وەرگیرابوو لەلایەن کوڕێکی هاوڕێی خۆم لە مزگەوتەکەدا، سەرەتا کە زانیم ماندووم و دەستم سڕ بووبو بە قورئانەکەوە ئیتر تەختەی قورئانەکەم کردە سەرین و بەرماڵێکم خستبووە سەری بۆ ئەوەی نەرم بیت، باش خەوم لێکەوتبوو تا ئەوکاتەی ئەبو مەحەممەد مەغریبی هەڵیساندم بۆ نوێژی عەسر، هاوینان نوێژەکان کاتی زۆریان لە نێواندایە دوای نوێژ چوومەوە بۆ ماڵەوە دەرگای ماڵەوەم دەکردەوە حەزقیل لەسەر پلیکانەی ماڵەکەمان دانیشتبوو!

حەزقیل: ئەوە چییە لەکەس ناپرسی ماکوان؟

ماکوان: لەخۆشیدا وتم حەزە گیان خوا بمکا وەقوربانەکە و چۆنی ماڵو موڵك؟

حەزقیل: جەماعەت لەسەرەوە دانیشتوون لە نیوەڕۆ وە چاوەڕێتین هەر نەهاتیتەوە.

ماکوان: لەخۆشیدا دەرگاکەم داخست و بەهەنگاوێك سێ پلیکانەم دەبڕی.

حەزقیل: ئەوە چییە ئەڵێی ژنت بۆ مارە کراوە بۆ وا ڕادەکەیت ملت دەشکێت.

ماکوان: ئەزانی چەندە موحتاجتانم حەزە گیان؟

کەچوومە سەرەوە تەماشام کرد ژووری دانیشتنەکمان پڕە لە جنۆکە، شێخ بەرقان، ڕاقی، سەسیل و یەك دوانێکی تر هیچیانم نەدەناسی، لەخۆشیا وتم حەزە بڕۆ ڕیزێ چای بهێنە هەموو دەستمان کرد بە پێکەنین، لەخۆشیا زوو زوو دەموت یاخوا بەخێربێن!

# میوانی جنۆکە و مێژووی کرۆنیکا

لە ماڵەکەی مندا مەجلیسێکی جنۆکە بەسترابوو، چوومە ژوورەوە سڵاو و خۆشەویستیم بۆ هەموویان دەربڕی، شێخ بەرقان و هەندێك لە هاوڕێیانی کە من نەمدەناسین لەگەڵ حەزقیل و سەسیل ئامادەبوون لەو مەجلیسەدا.

ڕوومکردە سەسیل بۆئەوەی بیری بهێنمەوە کە وتی: بەشێك لە قسەکانی کرۆنیکا ڕاستە و بەشێك لەقسەکانی درۆیە، هەروەها وتی شێخ بەرقان و هاوڕێکانی بۆت باس دەکەن!

سەسیل: با شێخ بفەرمووێت!

شێخ بەرقان: گرنگە تۆ و هاوڕێ جنۆکەکانت ئەوە بزانن کە ئێمە بەیەکەوە هەموومان گیرۆدە بووین ناتوانین دەست لە یەکتر بەربدەین، ماکوان وەکو پێنجوێنییەکانی لای ئێوە دەڵێن: "ناتوانین دەستبەرداری یەکتربین" سەسیل ڕاست دەکات بەشێك لە ژیانی ئەو کچە زۆر ترسناك و کێشاویە، خۆشی بۆخۆی دروستی کردووە بەبێ ئەوەی بزانێت!

ماکوان: ڕاستە دەیوت دوو کەسی کوشتووە؟

شێخ بەرقان: ماوەیەکی کەمە دەیناسین ئاگاداری ژیانی نین وەکو ئەوەی خەڵکی کوشتبێت، بەڵام وەکو ئەوەی باسی فیلمی ڕووت و پۆرن دەکات زۆر لەوە خراپتریشیان پێکردووە، ئەو باندەی لەگەڵیاندا کار دەکات زۆر ترسناکن!

ماکوان: حەتمەن لە فیلمی پۆرن و ڕووت کار دەکەن کە بازرگانی بە دەرمان و مادده هۆشبەرەکانیشەوە دەکەن!

شێخ بەرقان: نا؛ زۆر لەوە ترسناکتریش دەکەن کە بەبیر و خەیاڵی خەڵکیدا نەهاتەوە!

ماکوان: چی دەکەن؟ دەستیان تێکەڵە لەگەڵ وەرماش شەیتانەکان؟

شێخ بەرقان: هیچمان بۆ ئاشکرا نەبووە، بەڵام ئەوەی کە ئاشکرا بووە تا ئێستا ئەوەیە کە ئەم کچە شانسێکی باشی هەبووە تا ئێستا نەکوژراوە.

ئەم کرۆنیکایە درۆ دەکات لەگەڵ کورد دا کار ناکات، هەموویان لە ژێر دەسەڵاتی کوڕێك کار دەکەن ناوی فرانك-ە، لەبنەڕەتدا خەڵکی ئەڵمانیایە و ماوەیەکی زۆرە لە نەرویج دەژی.

ماکوان: کارەکەیان چییە؟

شێخ بەرقان: ئێمەش نەمانزانی وایە تاکو ئەم جنۆکەی هاوڕێمان (کازول) لەو دەوروپشتە بینمان، ئەو زانیاری پێداوین و کردوومانەتە هاوڕێی خۆمان، ئێستا لەگەڵماندا هاتووە بۆ ئێرە، بەڵام زمانی کوردی نازانێت، عەرەبی، نەرویجی، ئینگلیزی و چەند زمانێکی تر دەزانێت دەتوانیت قسەی لەگەڵ بکەیت خۆی بۆت باس بکات.

خۆشحاڵیم دەربڕی بۆ کازول و دەستم گرت بەسنگمەوە بۆی بە عەرەبی پرسیم: ئەمانە کاریان چییە؟

کازول: ئەمانە سەرەتا بەناوی فیلم و کلیپ و دروستکردنی کورتە فیلم ئەو پەنابەرانەی کە لە ئەوروپان کۆیان دەکەنەوە و هەموو شتێکیان پێدەکەن، ئەمانە هەموو کۆمپانیای گەورەی ڕاگەیاندنن و هەموو جۆرە فلێکس و ڕیکلامێك دەکەن، چاپخانە و تەنانەت شاری تایبەت بەخۆیان هەیە کە

هەموو جۆرە كەرەستەیەك لەبن دەستیاندایە بە ملیۆن دۆلار و كرۆن خەرج دەكەن! لەڕاستیشدا كاری سەرەكیان هیچی ئەمانە نییە كە باسم كرد بۆت، بەڵكو زۆر كاری خراپتر دەكەن.

ماكوان: ئەو كارە خراپە چییە بۆم باس بكە دڵم تەقی، نازانم لەمە خراپتر چی هەیە؟!

كازول: كارەكە لە وڵاتی نەرویج ناكرێت، بەڵكو لە وڵاتە هەژارەكان دەكرێت! بۆ نمونە لە ڕۆمانیا، بولگاریا، هەنگاریا و ماڵتیڤ...هتد. كارەكەشیان ئەوەیە ملیۆنێرەكانی ئەوروپا و ئەمریكا و تەنانەت عەرەبەكانیش بەشداری دەكەن كە زۆرێكیان لوبنانین و هەندێكیان خەڵكی كوێتن، ئەم دەوڵەمەندانە هەرچی كاری قیزەونە تاقیان كردۆتەوە زۆرێكیان بێزار بوون لە هەموو شتێك، بۆیە یاری مەرگ بەم كەسانە دەكەن!

ماكوان: هیچ تێناگەم زیاتر ڕوونی بكەرەوە كازول گیان، یاری مەرگ چییە؟

كازول: فرانك بەناوی ڤێستیڤاڵی هونەری و فیلم و زۆرێكی تر لەم ناوانە لەو وڵاتانەی تا ڕادەیەكی زۆر هەژارن و بە بەرتیل كاریان تێدا دەڕوات، دەوڵەمەندەكان كۆ دەكاتەوە لە جێگایەكی گەورەدا وەكو ستادیۆم یاری مەرگی تێدا ڕێك دەخات. بۆ نمونە شێر، پڵنگ، سەگ و گورگی دڕ كۆدەكاتەوە برسیان دەكات و لەگەڵ مرۆڤەكان شەڕیان پێدەكات! زۆرێك لەو دەوڵەمەندانە ئەوەندە بێزار بوون لە ژیان هەموو شتێكیان تاقی كردۆتەوە خۆشی و كاتی خۆیان بەوە دەبەنە سەر!

ماكوان: تا ڕادەیەك ئاگاداری ئەوەم دەمزانی دەكرێت و شتی لەوە ترسناكترمان بینییوە و باسكراوە، حەزقیل دەزانیت خەڵكانێك هەن پێشبڕكێیان بە فیشەك دەكرد بزانن كێ لە كۆتاییدا دەمێنێتەوە.

کازول: ڕاستە ئەوە زیاتر لە ئەمریکا، ڕووسیا و وڵاتەکانی تریش وەکو قومار دەیکەن، بەڵام ئەو ئافرەتەی کە تۆ باسی دەکەیت تا ئێستا چەندین ئافرەتی بردووە بۆ ئەو کارە و نەگەڕاونەتەوە، نیازیان هەبوو کە خۆشی بەو شێوە لێ بکەن، بەڵام لەبەر جوانییەکەی کە فرانك وەکو گێڵ فرێندێك بەکاری دەهێنێت لەگەڵی ڕادەبوێرێت.

ماکوان: ئەی بۆ ناڵێیت وەکو عەبدێك، تەبعەن هەر بڕوات دەیکوژێت وایە؟

کازول: بەڵێ بەدڵنیایەوە وایە، ئەو ئافرەتانە کە بەکار دەهێنرێن تەنها تەماشایان دەکەن و خۆشحاڵ دەبن بە قیژە و هاواریان کاتێك ئەو ئاژەڵە دڕندانە دەیانخۆن ئەمان پێدەکەنن و خۆشحاڵ دەبن!

ماکوان: ئەی پۆلیس و دەزگا ئەمنییەکان ئەوانە ناگرن و پێیان نازانن؟

کازول: نا زۆرێك لەو کەسانەی کە بەشدارن لە پۆستی باڵای بڕیارداندان لە وڵاتە زلهێزەکاندا، بنەماڵە دەوڵەمەندەکان بەشداری دەکەن، وەك بەلۆعە چۆن ئاوی پێدا دێت ئاوا پارە دەردەهێنێت! فرانك بە ملیۆن دۆلار پارە پەیدا دەکات.

ماکوان: ئەی ئەم کچە چ پەیوەندی هەیە بە منەوە، بۆ بەدوای مندا دەگەڕێت و چی لە من دەوێت؟

کازول: من هیچ لەو بارەوە نازانم، ئەگەر شێخ بەرقان نەبوایە من تۆم نەدەناسی.

ماکوان: شێخ بەرقان جەنابت هیچ قسەکانی کازول حاڵی دەبیت؟

شێخ بەرقان منیش بەدوای سەرەداوادا دەگەڕێم تا ئێستا هیچم دەست نەکەوتووە!

ماکوان: پێدەچێت ئێمەش بەکار بهێنن لەم کارە قیزەونانەدا یان بە کوشتنمان، یاخود بە حەیا بردنمان. کێشەکەی من لەوە دایە دەمەوێت بزانم بۆ من لەناو ئەو خەڵکەی ئەواندا من هەڵبژێراوم، بڕوام نییە پەیوەندی بە فرانك-ەوە بێت، یان دەزانن ئێمەی کورد بێکەسین دەیانەوێت بەکارمان بهێنن بۆ سەیر و تەماشای دەوڵەمەندەکانی دونیا و بزانن گۆشتمان خۆشە تا دەرخواردی ئاژەڵە دڕندەکانی بدەن!

شێخ بەرقان: چییە ماکوان ئەڵێی دەترسیت؟

ماکوان: ئازایەتی مانای ئەوە نییە نەترسی، بەڵکو ئازایەتی مانای وایە بترسیت و کۆڵ نەدەیت، ترس داتنەنیشێنێت، دەترسم نەوەك بەو مانایەی ئیتر هەناسەم لێبڕابێت، بەڵکو ترسەکەم تەنها بە ئاگابوونمە!

شێخ بەرقان: کارێکی باشە ئەو وریای و ترس و بەئاگاییەت هەبێت بۆ ئەوەی زەفەرت پێنەبەن، ماکوان گیان ئێمەش هاوڕێتین هەر شتێك بوو دڵنیابە ئاگادارت دەکەینەوە.

ماکوان: بارك الله فیکم، سوپاسی برا جنۆکەکانم دەکەم بۆ ئەو خەمخۆرییەیان، بەڵام دەبێت بزانم من بۆ خراومەتە ناو ئەم یارییەوە؟ پەیوەندی من بەم گروپەوە چییە؟ ئەوەی سەرم لێی دەرناچێت ئەوەیە کێ لە پشت یارییەکەوەیە و بۆ من؟ دەبێت هەوڵ بدەین بیزانین، کازول ئەو کارەمان بۆ بکات مەمنوونی دەبین.

سەسیل: ئەی بۆ هەوڵنادەیت بزانیت کرۆنیکا کێیە؟ بەدوای ئەوەدا بگەڕێ تا دەگەیتە ئەنجامێك، پێم وایە باشترین کارێك لە ئێستادا کە بتوانین بیکەین دەبێت بزانین کرۆنیکا کێیە.

ماکوان: ئێ هەر وادەکەین خۆ ناچم بەدوای فرانك دا بگەڕێم بزانم خەڵکی بەرلین-ە یان فرانکفۆرت، دەبێت بەدوای ئەم کچەتیوەوە بین بزانین چییە و لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە؟

حەزقیل: ئەم ناوە لە ناو کورد دا نییە "کرۆنیکا"، ئەم ناوە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە ماکوان؟

ماکوان: دوێنی شەو زۆر گەڕام بەدوای ئەو ناوەدا، ئەوەی کە دۆزیمەوە ناوی کچێکی جاسوسی مەسیحییە دژی موسوڵمانان کاری کردووە، کە زیاتر چوومە ناو ژیانی بە ئافرەتێکی قدیسە ناسراوە، واتا ئافرەتێکی پیرۆزی مەسیحییەکانە، زیاتر و زیاتر بە شووێنیدا ڕۆشتم لە کۆتاییدا بوو بە ئافرەتێکی موسوڵمانی سۆفی ناوی گۆڕاوە بۆ خانمی چاکەخواز (ست حسن)!

حەزقیل: وەڵڵا سەرت لێ تێکدام هیچ تێنەگەیشتم واتای چی مەسیحییە و جاسوسە و سۆفییە؟

ماکوان: ڕاستە سەرم لێ تێکدایت، بەڵام کێشە لە ژیانەکەیدا نییە دەمەوێت بزانم چۆن ئەو ناوەی هەڵبژاردووە!

حەزقیل: تۆ بۆم باس بکە، دوایی ئەویش دەزانین.

شێخ بەرقان: کاك ماکوان ئەو ناوە چییە؟

ماکوان: لەڕاستیدا ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاوم چۆن چیرۆکی ئەو دەزانێت؟ کاتێك گەڕامەوە بۆ مێژووەکەی لە وڵاتی بسکای و ناڤار لە ئیسپانیای ئێستا کە ئەو سەردەمە پێی وتراوە ئەندەلوس ئافرەتێکی لەو شێوە هەبووە دووکەسی کوشتووە! ئەویش وتی: "دووکەسم کوشتووە"! هەستم کرد درۆ

دەکات، بەڵام نەمزانی مێژووی ئەو کەسایەتییە دەزانێت چۆن هەستی پێکردووە؟

حەزقیل: لەوانەیە کرابێت بە ڕۆمان یان شتێك لەو بابەتانە، لەوێوە ناوەکەی هێنابێت!

ماکوان: وەڵڵا حەزەی برام بەڕاستی خەریکە موسەقەف دەبیت، نانا باشیت قسەکەت ڕێگای تێدەچێت.

حەزقیل: بۆم باسکە چییە؟

ماکوان "بە پێکەنینەوە": زۆر گرنگی بە ناوەکەی ئەدەی ناشێ عاشقی نەبووبێتی حەزە گیان؟

حەزقیل "بە پێکەنینەوە": من عاشقی بووم؟ وەڵڵا کە ناوی دەهێنین تۆ خەریکە ئەتوێیتەوە، تۆ هەر یەکەم جار بینیت عاشقی بوویت دەستە چەورەکەی خۆت بەسەر مندا مەسڕە.

ماکوان: جا ناحەقم بوو حەزەی برام؟ ئەزانی چەندە جوانە ئەو کرۆنیکایە!

حەزقیل: تا کاتمان هەیە لەگەڵتاین و کەس لەماڵ نییە، بۆم باسکە دەمەوێت شتێك لە مێژووی ئەو کرۆنیکایە بزانم.

شێخ بەرقان: ئەزانی ماکوان بۆچی حەزقیل دەیەوێت ئەوەندە لەو ناوە بکۆڵێتەوە؟

ماکوان: ناوەڵڵا نازانم؟

شێخ بەرقان: دوێنی باسی کرد بۆم کە منداڵێکیان بووە دەیەوێت ئەو ناوەی بنێ بەلایەوە خۆشە!

ماکوان: ئەی پیرۆزە حەزە گیان، وەڵڵا خۆشحاڵ بووم بەسەر چاو ئێستا بۆت باس دەکەم. کرۆنیکا جاسوسێکی نێردراوی وڵاتی ناڤارە!

وڵاتی ناڤار لە نێوان فڕەنسا و ئیسپانیا دا بوونی هەبوو، لە بنەڕەتدا هەموو ڤایکین و چەتەکانی دەریا بوون، تەماعیان لە خاکی ئەندەلوس هەبوو، لەو سەروبەندەدا ئەفسەرێکی ئەو سەردەمەی ناڤار بەناوی مارتل بۆ دژایەتی ئیبن و ڕوشد و عەلی کوڕی ئیبن عەرەبی نارد، دوو زانای گەورەی ئەو سەردەمەی خۆیان بوون.

شێخ بەرقان: مەبەستت ئیبن عەرەبی ئەندەلوسە؟

ماکوان: باوکی ئیبن عەرەبی ناوی عەلەیە کوڕەکەی ناوی محێدین عەلی ئیبن عەرەبیە.

شێخ بەرقان: واتا باوکی محێدین ئیبن عەرەبی بووە؟

ماکوان: بەڵێ، باوکی پیاوێکی عارف و زانایەکی گەورەی ناوچەی بەلەنسیای ئەندەلوس بووە لەو سەردەمەدا، لەهەمانکاتیشدا زۆر ئازا و بەهێز بوو هاوڕێی ئیبن ڕوشد بووە. ئەوکاتە ئیبن ڕوشد وەزیر بوو، کەسیك بەناوی مارتل خۆی کردبوو بە شێخی حەنابیلە وەکو ئەم سەلەفیانەی ئێستا خۆی نیشان ئەدا، بەڵام لە ڕاستیدا کەسێکی مەسیحی بووە سەرکردە و ئەفسەرێکی سوپای ئەو سەردەمەی وڵاتی ناڤار بوو.

مارتل هەرچی کرد نەیدەتوانی لەڕووی زیرەکی و توانای عەلی کوڕی ئیبن عەرەبی کەم بکاتەوە ڕۆژ بەڕۆژ بەتواناتر و بەڕێز تر دەبوو لەناو خەڵکیدا، چەندین جار هەوڵی کوشتنیشی دا بۆی نەچووە سەر.

حەزقیل: بۆچی دەیانوسیت لەناویبەرن؟ ئەم عەلیە دەسەڵاتی چی هەبووە؟

ماکوان: هیچ دەسەڵاتی نەبووە تەنها بیرمەندی سەردەمی خۆی بوو، لە هەموو دەوڵەتێکدا ئەگەر پیاوی زیرەك و بیرمەند و فەیلەسوفی تێدا هەڵبکەوێت ئاستەمە کەوتنی ئەو دەوڵەتە! لە هەر دەوڵەتێك خوێندەوار و بیرمەند و فەیلەسوفی تێدا نەبوو ئەوا دەوڵەتەکە بەئاسانی دەکەوێت!

مارتل دەیزانی توانای ئەندەلوس لە بیریار و فەیلەسوف و خەڵکە دانشمەندەکەیدایە بۆیە هات لە ڕێگای دینەوە بەناوی مەدرەسەی زاهیری و قورئان و سوننەتەوە خەڵکی نەخوێندەواری دروست کرد، کە نابێت بیر بکەنەوە ئەوەی قورئان و سوننەت وتیانە ئەوە تەواوە و پێویستمان بەهیچی تر نییە! بیرکردنەوە قەدەغەیە! ئیتر ئەوە بووە هۆکاری ئەوەی کە زۆربەی زانایان لەڕێگای ئەم مارتل-ەوە دەکوژران و خەڵکی نەخوێندەواری دروست کردبوو بەناوی دینداریەوە شووێنکەتووی قورئان و سوننەتن، قازی بەلەنسیا لەترسی مارتل عەلی کوڕی محێدین-ی ناردی بۆ قورتوبە.

شێخ بەرقان: ئەی قازی نەیدەتوانی بیگرێت و لە ناوی بەرێت؟

ماکوان: ئاخر خۆ قازی و خەڵکی بەلەنسیا نەیاندەزانی ناوی مارتل-ە، ئەوە ئێستا بۆ تۆی باس دەکەم، ئەوکاتە خۆی ناونابوو بە شێخی حەنابیلەکان و ناوی شێخ زیاد خۆی وا ناسندبوو کە یەکێکە لە خەڵکەکانی قەیرەوان.

حەزقیل: ئەی کرۆنیکا چ پەیوەندیەکی هەیە بەم کۆمەڵە باسەی کە تۆ کردت؟

ماکوان: کرۆنیکا ئافرەتێکی سەماکەری جوانی ناسراوی دەوڵەتی ناڤار بوو، پیاوانی ئەو سەردەمە زۆر ئارەزوویان بوو لەگەڵیدا ڕابوێرن، ئەویش هەر کەس بیویستایە لەگەڵیدا بخەوێت و بەدڵی خۆی نەبوایە دەست بە جێ دەیکوشت!

حەزقیل: ئەی ئەویش دوانی کوشتووە، دیارە هەر مێژووی چیرۆکەکەی ئەوی زانیوە بۆیە ئەو سیناریۆیەی بۆ تۆ دروست کردووە!

ماکوان: ڕاستە منیش ڕەچاوی ئەو قسانەیم کرد کە مێژووەکەم خوێندەوە زانیم خۆی کردووە بەو کەسایەتییە مێژووییە، بەڵام خۆزگە تاکۆتاییەکەی بیبردایە سەر، چوونکە لەکۆتاییدا خزمەتێکی زۆری ئەندەلوس و ناوچەی ئەندەلوس و محێدین عەرەبی دەکات!

حەزقیل: ئەمەی تۆ باسی دەکەیت مێشکی دەوێت ماکوان نازانم دەگەینە کوێ، بەڵام تۆ ئەم چیرۆکەم بۆ تەواو بکە با تێبگەم؟

ماکوان: ڕاستی مارتل داوای ئافرەتێکی جوانی سەرنج ڕاکیش دەکات بۆ ئەوەی حەیای عەلی کوڕی ئیبن عەرەبی پێببات، ئەو سەردەمەش ئەم کچە کە ناوی کرۆنیکایە لە زینداندا گیراوە بەهۆکاری ئەوەی کە دوو کەسی ناوداری دەوڵەتی ناڤاری کوشتووە کە ویستویانە سەرجێی لەگەڵ بکەن بەزۆر، لە زیندان خزێنراوە بۆ ئەوەی لە ملی بدرێت!

دەسەڵاتی ئەو سەردەمە داوا لە کرۆنیکا دەکەن کە بۆ ئەوەی پاشای ناڤار لێی خۆشبێت دەبێ بڕوات عەلی کوڕی ئیبن و عەرەبی بکوژێت، یاخود کارێك بکات لە ناو بەلەنسیا ناشیرینی بکات و خەڵکی گوێ بۆ قسەی نەگرێت.

سەسیل: ئەی دەڕوات کارەکە ئەنجام ئەدات؟

ماکوان: بەڵێ دەڕوات زۆر هەوڵ ئەدات کارەکە ئەنجام بدات ناتوانێت عەلی هەڵخلەتێنێت تا لە کۆتاییدا عاشقی عەلی دەبێت. لەکۆتاییشدا مارتل دەیەوێت بەزۆر لەگەڵی بخەوێت، بەڵام ئەیسووتێنێت و ماڵەکەشی بەسەردا دەسووتێنێت. لەو ڕووداوەدا مارتل یاخود شێخ زیاد نامرێت،

بەڵکو هەموو دەموچاوی دەسووتێت تا ئاشکرا دەبێت قوتابیەکانی خۆی دەیکوژن کاتێك دەزانن کە جاسوسە.

حەزقیل: ئەی عەلی کوڕی ئیبن عەرەبی نایهێنێت کە ئاوا عاشقی دەبێت؟

ماکوان: فریای ناکەوێت عەلی وەفات دەکات و دەگەڕێتەوە بۆلای خوای خۆی، ئەویش لە خۆشەویستی عەلی کوڕی ئیبنو عەرەبی موسوڵمان دەبێت! هەر ئەمەشە کە فەلسەفەی ئیبنو عەرەبی واتا موحێدینی کوڕی عەلی ئیبنو عەرەبی فەلسەفەی خۆشەویستی دادەمەزرێنێت و تەسوفی عاشقانە لێرەوە دەست پێدەکات! موحێدین ئیبن عەرەبی دەڵێت: "بنەمای هەموو شتێك لە لایەن خواوە بۆ مەخلوق خۆشەویستییە و خۆشەویستی خوایە دابەش بووە بەسەر مەخلوقدا، ئەگەر بە خۆشەویستی کار بکەین ئەوا هەموو ئامانجەکان دەپێکرێن"!

حەزقیل: وەڵلاهی ئەمە فەلسەفەیەکی زۆر جوانە، ئەی مەگەر ڕاست نییە؟

ماکوان: وەکو فەلسەفە ڕاستە و جوانە، بەڵام وەکو دین و شەریعەت تاڕادەیەك یەکانگیر نین بەیەکەوە، چوونکە خۆشەویستی هەموو شتێکی لەسەر دانامەزرێت ئەگەر وابوایە خراپەکاری نەدەبوو هەبێت، بەڵام دەبێت خۆشەویستی هەبێت لەگەڵ خۆشەویستی سەمع و تاعەت و گەردن کەچی بۆ خوا وجودی هەبێت. موحێدین ئیبنو عەرەبی لەفەلسەفەکەیدا تەنها خۆشەویستی باس دەکات و سەنتەری فەلسەفەکەیەتی، ئەمەش لە ڕاستیدا قسە زۆر هەڵدەگرێت، بەڵام ئەو کتێبی چەند بەرگی لەسەر نووسیوە بەناوی فتوحاتی مەککی .

لەم قسانەدا بووین لە جەڕەسی دەرگا درا پێش ئەوەی بچم بیکەمەوە شێخ بەرقان وتی::ئێمە دەڕۆین کاوەی هاوڕێتە هاتووە بۆ لات"!

## ئاشکرا بوونی دۆسیەی کرۆنیکا

لە گەرمەی قسەدا بووین لەسەر مێژووی فەلسەفەی موحێدین ئیبن و عەرەبی و کرۆنیکا لە پڕ کاوە دای لە دەرگای ماڵمان، جنۆکەکانی هاوڕێم ئاگاداریان کردمەوە کە کاوەیە! چووم دەرگام کردەوە کاوە هاتە سەرەوە زۆر خۆشحاڵی دەربڕی کە خانوو و ئیشی دەستکەوتووە، هەندێك پارەی کەم بوو بۆ پێشەکییەکەی داوای لەمن کرد بیدەمێ و پارەکەم بۆ جۆر کرد، لەگەڵیدا کەوتینە قسەکردن باسی ڕەوشەکەم بۆ کرد کە ئەو زانیارییانەم دەست کەتووە.

کاوە: ئەم زانیارییانەت چۆن دەست کەوتووە، ئایا ڕاستن؟

ماکوان: چۆن دەستم کەوتووە؟ لەڕێگای کەسێکەوە کە ئەو کچە دەناسێت، نەرویجیە ئەو پێی ڕاگەیاندووم، بەڵام داوای لێکردووم ناوی نەبەم و کەس نەیناسێت چوونکە باندەکەیان زۆر ترسناکە!

کاوە: ئەی بۆ سکاڵایان لەسەر تۆمار نەکەین ئەگەر بەڵگە هەیە؟

ماکوان: کێشەکە لەوەدایە زانیارییەکان ڕاستن، بەڵام بەڵگەمان پێنییە تەنها وەکو زانیاری دەستمان کەوتووە دەبێت بەدوای بەڵگەوە بین بۆ ئەوەی بتوانین ئەوەی تۆ دەیڵێیت ئەنجامی بدەین.

کاوە: پێت باشە چی بکەین؟ چی دەڵێیت وا دەکەین.

ماکوان: مێشکم هیچی تێدانییە، بیرکردنەوەم لاوازە پێویستم بەکاتە بۆ بیرکردنەوەی زیاتر و تۆش هەوڵبدە مێشکت بگوشە وەکو لیمۆ بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی باشمان هەبێت و بزانین لەپایچی ئەمانە وا لە منیان پێچاوە؟

کاوە ڕۆیشت منیش هەر لە بیرکردنەوەدا بووم، چەند ڕۆژێك بەسەر بیرکردنەوەمدا تێپەڕی و هیچم بۆ نەدەپێکرا، بیرکردنەوەم ئاڵۆز بو بو ئەوەی کە بیرم لێدەکردەوە پاش کەمێکی تر لێی پەشیمان دەبوومەوە، بەڵام قسەکەی سەسیل-م لە مێشکدا بوو ئەگەر ببینم لە جێگایەکی گشتیدا ببینم و دوور لە جێگای چۆڵ و ماڵ.

ئێوارەیەکی شەممە تەلەفونم بۆ کرا لە لایەن کرۆنیکاوە کە ئەیەوێت ببینێت، دیت بۆ ماڵەوە بۆلام! منیش ڕێگام پێنەدا وتم: "ببوورە ئەم ئێوارەیە جەژنی لە دایك بوونی منداڵەکەمە و هاوڕێکانی بانگ کردووە، ماڵی ئێمە وەکو باخچەی ساوایان وایە، ئەگەر پێت خۆشە دەچینە دەرەوە لە کافتریا یاخود ڕێستورانتێك دادەنیشین و قسە دەکەین"؟

کرۆنیکا: زۆر باشە، نزیکەی نیو کاتژمێری دیکە دێمە لات.

ماکوان: هەر خۆتی؟

کرۆنیکا "بە پێکەنینەوە": دایکیشم بێنم؟

ماکوان: دایکی تۆ دایکی ئێمەیە ئەیخەینە سەرچاومان!

کرۆنیکا: بەساقەو بم زۆر سوپاس، لووتفت نواند ماکوان گیان.

ماکوان: لەخزمەتام چاوەڕێتم وەرە ناو سەنتەر.

کە تەلەفونەکەی داخستەوە خێرا تەلەفونم بۆ کاوە کرد و کوڕێکی سووری هاوڕێی لەگەڵدا بوو، وتم: "وەرن بۆ ناو بازاڕ ئیشم پێتانە، بەڵام گرنگە نەگاتە ١٠ خولەك لای من بن! بەپەلە گەیشتنە لام و جێگای دانیشتنم دەست نیشان کرد بۆیان و پێم وتن: تەماشای چواردەورمان بکەن بزانن کێ لەگەڵ ئەو دایە و داخۆ کەس چاودێری دەکات بە تەلەفونەکانتان وێنە

بگرن، بە ڤیدیۆش وێنەی زۆری چواردەورمان بگرن، بەڵام کەس هەستتان پێنەکات".

کوڕە سوورییەکە ناوی هیشام بوو بەسەیارەکەی خۆی ناردم بۆ دەروازەی شارەکە کرۆنیکا لێوەی داخڵ دەبیت و ڕەنگی سەیارە و جۆر و ژمارەکەیشم دایە، تا دوای بکەوێت کە هات تا بزانێت کەسی تری لەگەڵدایە؟ ئێوارەی شەممە بوو کاوەش لە مۆڵەکە چوو هەندێك گوڵی سووری هێنا و بەدەستییەوە بوو دەستی کرد بە فرۆیشتنی هەر چڵێ گوڵی دەفرۆشت بە پەنجا کرۆن! یەشتا کرۆنیکا نەگیشتبوو هەموو گوڵەکانی تەواو کرد بەپەلە چوو دوو ئەوەندەی تری هێنا لە نزیك ئەو کافتریایەی کە دامنابوو بچینە ناوی دەستی کرد بە گوڵ فرۆیشتن.

هیشام تەلەفونی بۆ کردم وتی: "ئەو سەیارەی تۆ دەیڵێیت داخڵ بوو کچێك لێی دەخوڕێت دوو کوڕی لەگەڵدایە! یەکێکیان نەرویجییە و ئەویتریش لە خۆمانە واتا شەرقییە مەبەستی ئەوە بوو یان کوردە یاخود عەرەب!

ماکوان: بەشووێنیانەوە بە بزانە چی دەکەن.

پاش کەمێکی تر هیشام تەلەفونی کردەوە وتی لە ناو بازاڕ کوڕەکانی دابەزاند، پێدەچێت بەتەلەفون لەگەڵ یەك قسە بکەن!

ماکوان: سەیارەکە و کچەکە بەجێبهێڵە، سەیارەی خۆت دابنێ شووێن ئەو دوو کوڕە بکەوە بزانە چی دەکەن و بۆ کوێ دێن!

لەناکاو کرۆنیکا تەلەفونی بۆ کردم: ماکوان لە کوێیت؟

ماکوان: وەرە لەناو بازاڕم، ئەو جێگایەی دەست نیشانم کردبوو لە تەلەفون پێم نەوت تا سەیارەکەی پارك کرد، کە هاتە لام بە پێکەنینەوە وتم دایکت نەهێناوە؟

کرۆنیکا دەستی کرد بە پێکەنین: نا- بچینە کوێ دانیشین؟

تەلەفونەکەم لەناو سەیارەکەدا بەعەمدەن بەجێ هێشت دوای ئەوەی کەمێك ڕۆیشتین وتم تەلەفونەکەم لێ ون بووە، ئەو تەلەفونەی خۆتم بدەرێ با تەلەفونێکی بۆ بکەم؟

کەوام وت کرۆنیکا شڵەژا دەستی کرد بە جانتاکەیدا و هیتفۆنێك لە گوێدا بوو هەستم کرد کە تەلەفونەکەی کار دەکات و دەیەوێت ئەو دوو کوڕەی لەگەڵیدا بوون بە دەنگی من بێنە ئەو جێگایەی کە دەست نیشانم دەکرد، بەڵام زوو تەلەفونەکەی داخست کە تەلەفونم کرد جەرەسی لێداو کەس هەڵیندەگرت، منیش تەلەفونەکەی ئەوم کوژاندەوە و بەپەلە چوومە لای سەیارەکە و تەلەفونەکەی خۆم هێنا. لەو دوور بووم بە تەلەفونی خۆم تەلەفونم کرد بۆ هیشام وتم چی دەکەیت؟

هیشام: سەریان کردووە بەیەکەدا هەر تەلەفون دەکەن وەکو ئەوە وایە داخرابێت، بۆیان بەردەست نییە سەرقاڵن و شڵەژاون.

ماکوان: لەگەڵیان بە بزانە دەچن بۆ کوێ، لێیان ون نەبیت باشە اخی گیان؟

هیشام: بێخەم بە و ئیسراحەت بە.

گەڕامەوە بۆ لای کرۆنیکا وتم تەلەفونەکەتم کوژاندۆتەوە تکام وایە نەیکەیتەوە تا بەیەکەوە تەواو دەبین، بەشێوەیەکی واش پێموت کە تووڕەییم پێوە دیاربوو، وەکو ئەوەشی هیچ متمانەم پێی نییە!

کرۆنیکا: ئاخر نەکو دایکم تەلەفونم بۆ بکات، هەستم کرد ڕەنگی تێك چووبوو!

ماکوان: کە چووینە ئەو کافتریایە بیکەرەوە، بەڵام لەسەر مێزەکەت دایبنێ تەنها تەلەفونی دایکت هەڵبگرە هەر کەس تەلەفونی کرد یان وەڵامی بدەرەوە لەبەر چاومدا دایخەرەوە یاخود تەلەفونی کەس هەڵمەگرە ئەگەر ئەتەوێت جێگای متمانە بیت و قسە بکەین.

کرۆنیکا: بۆ متمانەت نییە کاك ماکوان؟

ماکوان: خۆ ئەگەر متمانەشم نەبێت شتێکی عەجیب و غەریب نییە، بەدڵنیایەوە جاری متمانە لە نێوانماندا دروست نەبووە، وایە؟

کرۆنیکا: باشە لە کوێ دادەنیشین؟

ماکوان: ناوی کافتریایەکم پێوت لەو جێگایەی ئێمەوە زۆر دوور بوو.

کرۆنیکا: باشە ئیجازەم بدەرێ با تەلەفونێك بکەم بۆ دایکم و چاوەڕێم بکە دێمەوە لات.

ماکوان: فەرموو بە ئیسراحەتی خۆت، زانیم تەلەفون بۆ دوو کەسەکە دەکات و بەوان دەڵێت و ئیتر تەلەفونەکە دادەخات.

کرۆنیکا هاتە لام بە پێکەنینەوە: تەواو دایکمم ئاگادار کردەوە کە لەکوێم و دەتوانم تەلەفونەکە داخەم.

لەبەرچاوی خۆمدا دایخست و خستیە ناو جانتاکەی، منیش بردم بۆ ئەو کافتریایەی کە دامنابوو.

دانشتین و دەستمان کرد بە قسە، داوای قاوەمان کرد، هەڵسام بڕۆم بۆلای کاوە.

کرۆنیکا: بۆ کوێ دەڕۆیت؟

ماکوان: ئێستا دێمەوە! چووم بۆلای کاوە بەپەلە پێم وت دوو کەس لەگەڵ ئەم کچە تیوەدان، هیشام بە شووێنیانەوەیەوە ئەگەر توانیتان لێیان بدەن و قسەیان لێدەربێنن بزانن کێن و چین، دوایی وەرەوە بۆ لام لەگەڵ هیشام با شووێنی ئەم کچە نەزانن باشە؟ گوڵێکم بەری و بەدەم ئەو قسانەوە تا تێمگەیاند دوو گوڵم لێکڕی و قسەکانیشم بۆ تەواو کرد گوڵەکەم هێنایەوە و یام بە کرۆنیکا، پێش ئەوەی بێمەوە کاوە وتی وێنەم زۆر گرتوویت لە هاتنتەوە تا دانیشتن و نان خواردنت!

کرۆنیکا: سوپاس بۆ گوڵەکەت!

ماکوان: سوپاسی ناوێت عەزیزم تۆ ژەهرمان ئەدەیتێ منیش گوڵ!

کرۆنیکا: من ڕاستگۆ بووم لەگەڵتا، ڕاستیم پێوتوویت.

ماکوان: نا بڕوا ناکەم تۆ ڕاستیت وتبێت تۆ هەمووگیانت درۆیە! ببوورە کەوا دەڵێم بەڵام ئەوە ڕاستییە، چوونکە تۆ هیچت ڕاستگۆ نییە لەگەڵ من دا.

کرۆنیکا: چۆن وا دەڵێیت من درۆی چیم لەگەڵ کردوویت؟ ئەوەی ڕاستییە بە تۆم وتووە، زۆر ناشیرینە بەو شێوەیە قسەم لەگەڵ دەکەیت.

ماکوان: با درۆکانت بۆ بژمێرم ئەگەر وتت وانییە بەڵگەت ئەدەمێ لەسەر هەمووی، تۆ درۆ دەکەیت ناوت کرۆنیکا نییە! درۆ دەکەیت کەست نەکوشتووە! درۆ دەکەیت لەگەڵ پیاوێك ئیش دەکەیت ناوی فرانك-ە! درۆ دەکەیت دەوڵەمەندترین کەسیت و خۆت ڕازیت بە دەرکردنی فیلمی

پۆرن! درۆ دەکەیت لەلایەن ئەو باندەوە نەنێراویت! درۆ دەکەیت لە ئێستادا دوو کەس لەگەڵتا بوون سەرم لێ تێکداون بە شووێنتا دەگەڕێن! درۆ دەکەیت لەهەموو شتێکدا من ڕاستییەکانت پێبڵێم یان خۆت دەیڵێیت؟

کرۆنیکا: چۆن ئەمانەت زانیوە؟

ماکوان: ئەو کەسەی کە تۆی ناردووە بۆ لای من هەر ئەو پێی وتووم.

کرۆنیکا: سیامەند؟

دەستم کرد بە پێکەنین نەمدەزانی سیامەند کێیە، بەڵام نەشمدەویست بەدەنگ بڵێم بەڵێ نەوەك لە خۆیەوە ناو بڵێت و من تاقی بکاتەوە! تەنها بەزەردەخەنە وتم: قسەم بۆ بکە، خۆت باش شتەکان دەزانیت بۆ زانیاریشت من و فرانك باش یەکتری دەناسین!

کرۆنیکا ڕەنگی تێکچوبوو کە ناوی فرانك- م برد هەر زیڕەی کرد، وتی: تێم بگەیەنە چۆن ئەمانە دەناسیت؟

ماکوان: من پێت دەڵێم، سەرەتا دەمەوێت بزانم چۆن ناوی کرۆنیکات هەڵبژاردووە؟

کرۆنیکا: لە ڕاستیدا ناوم کرۆنیکا نییە!

ماکوان: دەزانم!

کرۆنیکا: من ناوم چیمەنە، باوکم دایکمی تەڵاق داوە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان لەوێ ژنی تری هێناوە و برایەکم لە نیوە دورگەی سقۆڵقێر لەوەێ خەریکی کاری ئەندازیاری نەوتە دڵنیاشم ناوی دایکم دەزانیت.

ماکوان: بەڵێ دەیزانم ناوی دایکت لەسەر جەڕەسی ماڵەکەتان نووسرا بوو.

چیمەن: ناوی کرۆنیکا لە زنجیرە درامایەکی عەرەبیەوە وەرمگرتووە کەناڵی (MBC) پێش شەش ساڵ لەمەو پێش پێشکەشی کرد، ناوی کچێك بوو زۆر جوان بوو ناوەکەیم هەڵبژارد!

ماکوان: مادام وایە دەزانی کرۆنیکا چەندە ئافرەتێکی پاك و بەڕێز دەرچوو لە کۆتاییدا چۆن ئەو جاسوسانەی ئاشکرا کرد؟

چیمەن: بۆ تۆش دراماکەت دیوە؟

ماکوان: نا - بەڵکو من مێژووی عەلی کوڕی ئیبن و عەرەبی، کرۆنیکا، مارتل، ئیبنو ڕوشد و هەموو ئەوانە دەزانم.

چیمەن: دیار بوو بڕوای نەدەکرد وای دەزانی منیش بینیومە، بەڵام بۆی ئاشکرا ناکەم بۆیە هەر باسی دراماکەی بۆ دەکردم.

ماکوان: بڕوا بکە من ئەو درامایەم نەدیوە، بەڵام دڵنیابە زۆر لەوە زیاتر دەزانم کە تۆ لە دراماکەدا بینیوتە، جا واز لەوە بهێنە بزانم بە ڕاستی کێ تۆی ناردووە بۆ لای من و سیامەند چی دەوێت؟

چیمەن: تۆ پێم بڵێ فرانك چۆن دەناسیت؟

ماکوان: من فرانك باش دەناسم دەزانم خاوەنی چ کۆمپانیایەکە و دەشزانم کاری چییە، ئەوەش دەزانم تۆ وەکو کۆیلە بەکار دەهێنێت، دەشزانم سیامەند کێیە و چییە، هەروەها دەزانم کە تۆ خوای گەورە ڕەحمی پێکردویت دەبوو ئێستا لە ژێر خاکدا بوویتایە! چەندین کوڕ و کچی خەڵکیتان لەناو بردووە تۆ هەست ناکەیت چەندە تاوانباریت!

كە واموت دەستی بە گریان كرد، چ گریانێك هەر فریای ئەوە دەكەوتم دەسڕی كلێنكسی بدەمی و چی لەو كافتریایەدا بوو تەماشای دەكردین، وتم مەگری با خەڵك تەماشامان نەكات.

چیمەن: دەتوانیت یارمەتیم بدەیت تەنها ڕێگا چارەیەكم بۆ بدۆزەرەوە، چی بكەم لەتاواندا پەنام بۆ سیامەندی بێ ئەخلاقیش بردووە، چەند جار لەگەڵمدا خەوتووە كە كارەكەم بۆ بكات، تا لەكۆتاییدا داوای لێكردم كە كاری نابەجێ لەگەڵ تۆ بكەم و وێنەت بگرم ئیتر ڕزگارم بێت لە دەستی فرانك! خۆم لە خۆم بێزارم دەزانم هەموو ژیانم تێكچووە، ئێستاش دوو بكەن كەسی لەگەڵدا ناردووم كە چاودێریم ، تۆ بەوریایی خۆت ئەوانیشت لێ ونكردم.

ماكوان: پەلە مەكە و گوێگرە.

تەلەفونم كرد بۆ كاوە: چیتان كردووە دەنگەكەیم دا بە دەرەوە بۆ ئەوەی كرۆنیكا گوێی لێ بێت، وتم ئاگاتان لەو دوو كەسە بێت تا دێمە لاتان وە بەو هیوایە بووم كە بڵێن هەر چاودێری دوو هاوكارەكەی چیمەن دەكەن.

كاوە لەوەڵامدا وتی: نەرویجییەكەم لەدەست دەرچووە، بەڵام كوردەكەم گرتووە لەناو پشتی سەیارەكەی هیشام دا سجنم كردووە! كوردی ڕۆژهەڵاتە دەمیم بە تیپ بەستووە، پێشم وتووە قسە بكات دەیخنكێنم و دەیخەمە ناو بەحر.

كە كاوە وایوت زۆر خۆشحاڵ بووم و وتم: ئاگاداربە ئەوەی تۆ بە بەهێزی دەزانیت لای ئیمە زۆر لاوازە، بۆ زانیاریت من و ستافی من زۆر لە فرانك و سیامەند و تۆش بەهێزترین، دەبوو ئەوە بزانیت، تۆ نەهاتوویت بۆ لای كەسێكی سادە و كارەكەی خۆت بكەیت و بڕۆیت، ئیستا باسێكی كورتی خۆت و سیامەندم بۆ بكە چۆن یەكتان ناسی؟

چیمەن: لەدوای ئەوەی فرانك بە هەموو شێوەیەك لەگەڵمدا ڕادەبوێریت و ناشتوانم هیچ بکەم، خۆت دەزانی دەمکوژێت! ئەم سیامەندەیان پێناساندم وتیان ساحیرە دەتوانێت تۆ ناشیرین بکات لەبەرچاوی فرانك و کۆتایی دێت بە نێوانتان، منیش دەمویست کۆتایی بێت بەو خۆشەویستییە شێتانەی کە بۆ منی هەیە، پەنام برد بۆ ئەم ساحیرە کە کارەکانم بۆ ئەنجام بدات.

سەرەتا وتی دەبێت ئاوی شەهوەتم بەسەر پشت بڕێژم، دوای ئەوە لەگەڵتا ڕابوێرم، ئاوی خۆم بکەمە ناو لاشەت تا ئەو نەیەت بەلاتدا! بەڵام هیچ وانەبوو ڕایبوارد و ئەو زیاتر دەهاتەوە بەلامدا، بەهەردووکیان ماندوویان کردووم، بەڵام کۆتا جار سیامەند هەر دەیوت ماکوان- م بۆ ڕسوا بکە منیش فرانك-ت بۆ ڕسوا دەکەم!

سیامەندم نەدەناسی یەکەم جار بوو گوێم لە ناوی بێت، زوو زوو دەموت ئەی بێڕەوشت سیامەند وا خۆم نیشان ئەدا کە دەیناسم، بەڵام کە وتی ساحیرە زۆر ترسام، ڕووم کردە چیمەن پێموت هیچی پێنەداوی بۆم کەیتەناو خواردن؟

چیمەن: نا – بەس دوعایەکی دامێ بێ ئەوەی تۆ بزانیت خستوومەتە ناو سەیارەکەت!

ماکوان: چۆن ئەو کارەت کرد، من ئاگام لێنەبووە؟

چیمەن: ئەوکاتەی کە هاتم تۆ پاڵت دابوو بە سایەرەکەتەوە، وتم ناتوانم پارکی بکەم تۆش وتت دابەزە با من بۆت پارك بکەم، فڕێمدا ناو سەیارەکەت جامەکەی کرابووە خستومەتە پشتی سەیارەکە!

ماکوان: ئێستا دەڕۆین ئەو سیحرە دەربهێنە، ئەوە دوعا نییە ئەوە سیحرە تا بەتاڵی دەکەینەوە. یەك شتی تر بزانە چیمەن هیچ ساحیرێك لەسەر

ئەم زەوییەدا ناتوانیت کاری باشە بکات تەنها کاری باش تێك ئەدات، تۆش خۆت لەناو قیزەونترین کاردایت دڵنیابە ناتوانیت کاری چاکەت بۆ بکات، بەڵکو ئەوەندەی تر خراپەت بەسەردا دەهێنێت! با بڕۆین تا کاوە ئەو کوڕەی لای تۆی نەکوشتووە جادووەکەم بۆ دەربهێنە فڕیتداوەتە کوێ؟

## دۆزینەوەی جادووی جیاکاری (سحر التفریق) یاخود سیحری ڕەش ..

هاتین بەرەو لای سەیارەکەم و بەدەم ڕێگاوە لە چیمەنم پرسی ئەو دووکەسە کێبوون بە دواتەوە، فرانك ناردبووی یاخود سیامەند؟

چیمەن: نا ئەوە سیامەند ناردبوونی لەگەڵما بۆ ئەوەی وێنەی من و تۆ بگرن بەیەکەوە، بەڵام نەتهێشت ڕووبدات، تۆ زۆر لەوە وریاتر و زیرەکتری کە بیرم لێدەکردیتەوە.

ماکوان: ئاخر منیش دوژمنم زۆرە وەکو تۆ دەڵێیت هەروا بە ئاسانی خۆم نادەم بە دەستەوە و لە کاتێکدا کە بیانەوێت تۆمەت و سکانداڵ بۆ من هەڵەبەستن.

چووینە لای سەیارەکە و سیحرەکەی بۆ دەرهێنام و لە جامەکەوە خستبوویە پشتی سەیارەکەم، کە دۆزیمەوە لێم وەرگرت چوومە ناو سەیارەکەم تەلەفونم کرد بۆ کاوە و هیشام و پێم وتن: سویچی سەیارەکە بخەنە سەر تایەی پێشەوە لای سایەق خۆم دەیکەمەوە و ئەو کوڕە ئازاد دەکەین، ئەوان لەو جێگایەدا بڕۆن.

منیش بەرەو لای ئەوان ڕۆیشتم و چیمەنیش بەدوامدا دەهات تا گەیشتمە لای سەیارەکەی ئەوان سندوقی سەیارەکەم کردەوە، کوڕەکەم دەرهێنا.

کاوە وەکو جل وبەرگ بیت ئاوا قەدی کردبوو نازانم چی لێکردبوو زیڕەی کردبوو! دەرمهێنا کوڕەکەم ناسی ناوی ئەمیر بوو خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو کەسێکی دەرمانخۆر بوو وتی: کاك ماکوان کوشتیانم!

ئەمیر گیان باسی هیچ مەكە و بڕۆ لەگەڵ كرۆنیكادا ئەم كێشە و باسە لە بیر بكە وەكو ئەوەی كە هیچت نەدیبێت باشە براكەم، با تووشی كێشە نەبیت ١٠٠٠ كرۆنم دایە، زانیم هەمیشە پارەی پێویستە.

ئەمیر: باشە كاك ماكوان لەبەر خاتری تۆ هەر بیریشی لێناكەمەوە.

ماڵئاواییم لەو كرد لەگەڵ چیمەندا مامەوە و پێموت: ئێستا سیامەند لە كوێ دەژی؟

چیمەن ئەدەرەسەكەی دامێ، ئەوەی سەرم لێدەرنەدەچوو ئەوە بوو سیامەند وێنەی منی بۆ چییە لەگەڵ چیمەندا؟ گەڕامەوە بەرەو ماڵ و بەدەم خۆمەوە بۆڵە بۆڵم بوو جادووەكەشم لە گیرفاندا بوو!

هاتمەوە بۆ ماڵەوە پانتۆڵەكەم داكەند جادووەكەیم خستبووە گیرفانەكەی دواوەم ماوەیەكی زۆریشبوو ئەو پانتۆڵە نەشۆرابوو سەرەی شۆردنی هاتبوو خێزانیشم كردبوویە ناو غەسالەكە تەنها كلیلەكانی دەرهێنابوو.

شەو درنگانێك بیرم كەوتەوە كە جادووەكە بەتاڵ بكەمەوە هەڵسام بچم لە پانتۆڵەكەم دەری بهێنم، كە تەماشام كرد پانتۆڵەكەم شۆراوە و وشكیش بۆتەوە، كە دەستم كرد بە گیرفانەكەیدا خوسابوو هەپرون هەپرون بووە!

دەشمزانی بەتاڵكردنەوەی ئەو طەلیسمانە خەتەرن، دەبیت زۆر وردبیت لەگەڵیدا دەنا تا ٤٠ ڕۆژ كاریگەری خۆی دەبێت، هیچ دەسەڵاتێكم نەما و وردە كاغەزەكانم كۆكردەوە خستمە ناو كوپێك و بە خێزانم وت ئەوە سیحرە دەستكاری مەكەن تا بەتاڵی دەكەمەوە.

میشكم ئاڵۆز بوو هەرچی دەمهێنا و دەمبرد سیامەندم بۆ نەئەدۆزراوە كێیە و چۆن دەیناسم، چی لە من دەوێت و بۆ كێ كار دەكات و طەرەفی كێیە!؟

لەم کەین و بەینەدا زۆر ئیشم بە شێخ برقان و جەماعەتەکەی بوو ئارەزوومەند بووم بیان بینم، بەڵام نەدەهاتن بۆ لام. ئێوارەیەکیان بە نیازی ئەوان بە تەنها چووم بۆ سەر دەریا بۆ ماسی گرتن، وتم بەڵکو خوای گەورە بیکات لەوێ دەرکەون.

چوومە کەناری دەریاکە دەستم کرد بە قولاپ هەڵدان، ئەو ئێوارەیە (ماشاء االله) خوای گەورە بەرەکەتێکی زۆری خستبووە ناو ئەو دەریایە قولاپم بێ ماسی نەهاتۆتە دەرەوە. ماسی زۆرم گرت هەر لە کەناری ئاوەکەدا هەموویم چاکرد و سەلك و کلك و ناوسکیانم فڕیدا و لێمکردووە ورده ورده کەوتمە ڕێ بۆلای سەیارەکەم نێوانی سەیارە و دەریاکە نزیکەی ١٠ خولەك ڕێگا بوو بە پێ، بەرەو ماڵ دەهاتمەوە ئومێدم بەوە نەمابوو جنۆکەکان ببینم.

لە ڕێگادا یەك دوو کەسم بینی زانیان ماسیم زۆر پێیە پێدەکەنین و دەیانوت ماسی باشت گرتووە! منیش هەر بۆ خۆشی دەموت بڕۆن نەکو بەشتان نەمێنێت ئێوەش ماسی بگرن.

لە ڕێگا پیاو و ژنێك بەرەو ڕووی من دەهاتن پیاوەکە زۆر باڵا بەرزبوو ژنەکەش زۆر کەڵەگەت بوو، شێوە و ڕوخساری پیاوەکە زۆر بە سەدام حسێن دەچوو ژنەکەش سیمای دەموچاوی لە ئافرەتێکی گۆرانی بێژ دەچوو بەناوی ئەحلام! زانیم ئەمانە نەرویجی نین هەستم کرد عەرەب یان تورك بن، بەڵام هاتنە لامەوە بە پێکەنینەوە تەماشایان کردم بە کوردی وتیان: ماسی باشت گرتووە! جەنابت کاك ماکوان-ی؟

ماکوان: بەڵێ ماکوانم! فەرموو تۆزێك بەرنەوە زۆرمگرتووە.

پیاوەکە هاتە لام و وتی: ناوم سەربازە خۆشحاڵم بە ناسینتان کاك ماکوان زۆر موتابەعەی بەڕێزتان دەکەم لە فەیسبوك و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و تازە هاتووینەتە ئەم وڵاتە بێ ئیقامەین.

ماکوان: زۆر خۆشحاڵم قوربان ناو سەیارەکەم عەلاگەی تێدایە با نیوەی ماسیەکەتان بدەمێ ببیەنەوە، هاتن لەگەڵمدا و نزیکی سەیارەکەم بوومەوە بەوانم وت بەچی هاتوون بۆ ئەم ناوە؟

سەرباز: بە پاس لەو مەوقیفە دابەزین وتمان با تۆزێك بەپێ بگەڕێین.

ماکوان: من دەمێکە لەسەر دەریاکەم ئەگینا چاوەڕێم دەکردن، ماندووم دەڕۆم ئەگەر دەچنەوە بۆ ماڵەوە ئەتان بەمەوە؟

سەرباز: دەستی کرد بە گیرفانیدا و کۆمەڵێك بەردی دەرهێنا ڕەنگی تێکەڵ بوون دانەیەکی گرت بە دەستییەوە وتی ئەو نوقڵە بخەرە دەمت لە حەجەوە هاتووە.

ماکوان: زۆر بەسادەیی لێم وەرگرت و خستمە دەمم تامی دەرمانێکی تاڵی نەخۆشی گرانەتای ئەدا، وتم بابە ئەوە کەی نوقڵە ئەوە تاڵە، هەر ئەوندەم وت لە دەما وەکو شەکر تواییەوە چاوم وردە وردە تەڵخ بوو، هەموو گیانم قورس بوو تەنانەت قاچم نەیدەتوانی بە پێوە بووەستێت لە شووێنی خۆما خستمی! ژنەکەی سەرباز هات بە چواردەورمدا خەتێکی خڕی کێشا هەر ئەوەندە ئاگادار بووم چاوم نا بەیەکدا ئاگام لە خۆم نەما!

کە چاوم کردەوە لەسەر بەردێکی ڕەق پاڵ کەوتبووم، هەموو چواردەورم تاریك بوو، شووێنەکە وەکو ئەشکەوت وابوو ئاگرێکی تیا کرابووەوە، لە خوار بەردەکەوە مار و مێروویەکی زۆر و قالۆنچە و حەشەراتی پیسم دەبینی. مارەکان مێروو مشکەکانیان دەخوارد و زۆر جار بە پێچەوانەوە مشکەکان مارەکانیان دەخوارد، دەستم برد بۆلای قایشەکەم لەوێدا چەقۆیەکەم تیا شاردبووەوە، بەڵام دەستم بۆ بەرز نەدەکراوە هیچی پێوە نەبوو بەچاوی خۆم دەمبینی کە هیچی پێوە نییە، بەڵام نەمدەتوانی بیجوڵێنم وەکو ئەوەی پێمەوە نووسابێت! قاچم عەیەیبی نەبوو، بەڵام جورئەتی ئەوەم نەبوو بڕۆم بەناو ئەوە هەموو مار و مشك و قاڵۆنچەدا،

لە هەمووی سەیر تر ئەوە بوو نەدەهاتنە سەربەردەکەی منی لەسەر بووم، کە تاشە بەردێکی گەورە بوو!

یەکێك لە دوورەوە بەدەنگێکی هەژدیهایی، هاواری کرد و ئەینەڕاند ماکوان کەوتیتە بەردەستم، ئەوەی لەگەڵ تۆ بوون هەموویان لای من وەکو تۆ وێران و ئەسیرن! ئای چەندە ماندووت کردین.

هەستم کرد دەنگەکە نەما و دەستم کەوتە جوڵە و مار و مێرووەکان نەمابوون لە بن بەردەکەدا، منیش دابەزیمە خوارەوە لەناو ئەو ئەشکەوتە بەرفراوانە دەگەڕام بەردەکانی وەکو چلورەی بەفر هاتبوونە خوارەوە دڵۆپەی ئاو ئەیدا لە پشتە ملم لە پڕ دادەچڵکیم و هاوارم کرد ئێرە کێی لێیە و چیتان دەوێت، پەیامتان چییە؟

دەنگ نەبوو بەدوای دەروازەیەکدا دەگەڕام لەو ئەشکەوتە بێمە دەرەوە، بە چوار دەوری خۆمدا هەڵدەخولام هیچم نەدی، هەموو هەر بەرد و شاخ و چلورەی شاخ بوو، زۆر هەڵخولام لە ڕاست بۆ چەپ و باکور و باشووری ئەشکەوتەکەم دەکرد، چارم نەما ناو دەمم وشك بوو، هەناسم سوار بوو .

لەماندوێتی خۆم تۆزێك دانیشتم، زۆر میزم دەهات ویستم میز بکەم و تۆزێکی تر بگەڕێم، دەستم کرد بە میز کردن و لە شووێنێکی بەرزەوە میزەکەم هەڵدا بۆ ئەوەی لە نوێژ نەچم، تەماشا دەکەم چەند کەسێك لە خوار منەوە وەستاون دەستیان بۆ مێزەکەم گرتۆتەوە بیخۆنەوە!

لەتاواندا تەریق بوومەوە و میزەکەم بڕی و بە پەلە خۆم گەڕاندە دواوە، لە پشتمەوە دەروازەیەك وەکو بڵێیت بە جادوو یان سیحر کرایەوە، زۆر شتی عەجیب و سەرسوڕهێنەرم ئەدی، لە خۆشیدا ڕامکردە دەرەوە کە هاتمە دەرەوە لە دەشتاییەکدا تەماشام کرد هەموو هاوڕێ جنۆکەکانم بەستراونەتەوە! تەماشام کرد شێخ برقان، حەزقیل، ڕاقی و حەنانە زۆرێکی تر لەو برایانەی تر کە هەر تەعاروفم هەبوو لەگەڵیاندا زیاد لە ١٦ کەس

بەسترابوونەوە! کە منیان دی هەموو سەریان داخست، بەپەلە چووم بۆ لایان بۆ ئەوەی بیانکەمەوە لەدواوە وەکو ئەوەی کە ئەسپێك یاخود هێسترێك بە قاچەکانی شەقم تیهەڵبدات ئاوا کێشایان بە پشتما و فڕێی دامە بەردەمی ئەوان!

وا فڕێیدام وتم تەواو مردم ئەوندە ئازارم پێگەیشت، هیچ توانای هەناسەدانم نەما تا چەند ساتێك.

لەبەردەم حەزقیل کەوتم، زانیم سەسیلیان لەگەڵدا نییە! وتم بەخوا سەسیل پەنی پێداون.

ئازارەکەم کەم بوویەوە چاوم دەگێڕا بۆ ئەوەی بزانم کێبوو پیای کێشام لە پشتەوە، کەسم بۆ نە ئەدۆزرایەوە، ئەو جنۆکانەش یەکێکیان قسەیان لەگەڵ نەدەکردم.

لەپڕ سەرباز دەرکەوت لەگەڵ ژنەکەیدا! ئینجا زانیم منیش ئەسیر کراوم لای ئەم عیفریت و شەیتانە خوانەناسانە.

سەرباز: دەزانی من کێم ماکوان؟

ماکوان: ئیبلیس و شەیطان یان خزمی ئەو جووتە!

سەرباز: من وەرماش-م، زۆر ئازارم نەدایت لەبەر ئەوەی کەسێکی بەخشندە بوویت و ڕەزیلیت نەکرد لە بەخشینی ماسییەکانت، هەرچەندە نیوەت داینێ نیوەکەی تری خۆمان خواردمان!

ماکوان: دەی بەقوزەڵقورتتان بێت، من کاتێك قسە لەگەڵ ئێوە دەکەم هەست دەکەم کە جیاوازم لە مرۆڤی تر و جورئەتی ئەوەشم بۆ دروست دەبێت کە حیسابی یەك تاقە قۆنەرەشتان بۆ نەکەم.

لەم قسانەدا بووم چواردەورم دارِما بەسەر یەکدا وامزانی دەکەومە ناو چاڵ، گوێم لە حەزقیل بوو وتی: نەترسی! بیرتە لە ئەڵمانیا چیمان کرد لە حوسێن، ئەوە هەمان چەواشەکاری جنۆکەکانە، ڕاوەستاوبە، تەماشای حەزقیلم دەکرد ئاگام لێبوو هاواری دەکرد ئەوم دەبینی کە هاوار دەکا و لێ ئەدەن، بەڵام ئەوەی لێی دەدا نەم دەبینی!

هاوارم کرد وەرماش-ی تەڕەماش، چیت دەوێت لێمان؟

وەرماش: بەیعەت و گفت و عەقد، هەرچیم وت بەقسەم بکەیت!

ماکوان: لە بەرانبەر چیدا؟

وەرماش: داواکە!

ماکوان: ئازادکردنی هاوڕێکانم.

وەرماش: ئاسانە هەموویان ئازاد بن لەبەر تۆ لە ئێستاوە.

ماکوان: جارێ تەواو نەبووم، ئەوەی داوای دەکەن نابێت ناشەرعی بێت.

وەرماش: بە پێکەنینەوە، خەمت نەبێت شەریعەتت بۆ دادەمەزرێنین! ماکوان ئێمە خۆمان دژی شەرعی بوونین، ئەوەی لای ئێمەیە هیچی شەرعی نییە، تۆش دەبێت لەسەر ناشەرعی بوون بەیعەت بدەیت! لەسەر ئەو بنەمایە پەیمان دەبەستین باشە؟

ماکوان: نا - باش نییە، من شتی وا ناکەم خۆم کافر ناکەم.

لەپڕ وەکو کارەبام لێبدەن پیاندا کێشام و فڕێیدامەوە بەردەم شێخ برقان، زۆر ئازارم پێگەیشت تەنانەت لە هۆش خۆم چوومەوە هەموو گیانم بووبە

خوێن بە دەمو چاو سەرمدا دەهاتە خوارەوە کە سەرم لە چەند لاوە شکا بوو.

شێخ برقان بە هێواشی پێی وتم یادی خوا بکە و زیکرەکانت بیر نەچێت، بڕۆ لێرە مەمێنە خەمی ئێمەت نەبێت!

زانیم شێخ برقان دەیەوێت بڕۆم بۆ ئەوەی تووشی هیچ هەڵەیەك نەبم و ئەسیر و گرتنی ئەوان کار لە من نەکات، بەڵام نەمدەتوانی بەجێیان بهێڵم.

هەرچۆن بوو هەڵسامەوە وەرماش نەمابوو چووم بۆ لای حەزەی برام دەگریا، ئەوەندە بەکزی دەگریا خەریك بوو منیش بۆ گریانەکەی بگریم.

وتم بۆ واتان لێ هاتووە، چۆن بتانکەمەوە چی بکەم؟

شێخ برقان ویستی قسە بکات دەمیان گرت، چووم بۆلای ویستم قورئان بخوێنم لەلای دانیشتم فرمێسکم بینی بەچاویدا هاتە خوار، دەستم کرد بە خوێندی سورەتی واقیعە تا گەیشتمە ئەو جێگایەی کە دەفەرمووێت (وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ..﴿٤١﴾) ئیتر من هێواش بوومەوە وەکو فێنکایي بەدڵما بێت ئاوا بوو، کە سەرم بەرز کردەوە لای پشتی سەیارەکەمەوە کەتبووم کەس نەهاتبوو بەلامدا! هەڵسامەوە زۆر ئاسایی بووم بەڵام کەمێك سەرم دەئێشا و بەرەو ماڵ کەوتمەوە ڕێ تەماشای ماسییەکانم کرد لەناو سەیارەکەمدا ژماردم نوقسانی نەبوو، هەر ئەوەبوو کە گرتبووم هیچی لێ کەم نەبووبەوە، بەڵام هەستم بە ماندووبوونێکی زۆر دەکرد.

گەڕامەوە دوای نوێژی شێوان لێی خەوتم، ماندوویەتی زۆرم پێوە دیار بوو، بۆ نوێژی بەیانی هەڵسامەوە زۆر خەفەت لە دڵما بوو دوعای خێری زۆرم کرد بۆ براکانم بەتایبەت بۆ حەزقیل و شێخ برقان، لەدڵی خۆمدا وامدانابوو

كە ئەمە فیتی سەسیل بێت وا پەیم دەبرد و بیرم دەكردەوە كە پلانی سەسیلە ئەوانی هەمووی یاوە بە داوی وەرماش-ەوە، ئیتر زۆر بیتاقەت و خەفەت بار بووم نەمتوانی بچمە سەركارەكەشم، تەلەفوونم كرد بۆ كار ئاگادارم كردنەوە كە ناتوانم بێم بۆ كار ماوەی ٤ ڕۆژ پشووم وەرگرت، لە دەوربەری نیوەڕۆدا بوو خێزانم و منداڵەكان چوون بۆ بازار بەتەنها بووم سەرم ناوە بۆ ئەوەی چاوێك لێك بنێم لەپڕ سەسیل هاتە لام!

سەسیل: السلام علیكم، ئاگاداری چی ڕوویداوە؟

ماكوان: وعلیكم السلام بەخێر بێیت، نا - چی ڕوویداوە؟

سەسیل: بەدزییەوە هاتووم ماڵەكەت چاوی لەسەرە، هەموو جەماعەت گیراون تەنها من ڕامكردووە، ئەویش لەناویاندا زۆر نەناسراوم ئەوانەی كە ناردبوونیان بۆ گرتنی شێخ برقان و ستافی خۆمان.

ماكوان: بۆ تۆ لەوان ئازیز تری، جا تۆ نەناسن كێ دەناسن سەسیل پێم وانییە ڕاست بكەیت فرتو فیڵی خۆتە؟.

سەسیل: سوێند بەخوا، ئاگام لە هیچ نییە ئەوەی ئاگاداری كردمەوە كەسێكی نزیك خۆمانە بە ناوی (میا) ئاگاداری كردمەوە، هەرچەندە كاتی ئەوەمان نییە، شتێكت پێدەڵێم بۆ ئەوەی بتوانی ئازادیان بكەین!

ماكوان: چیم پێدەڵێیت ئەوان چۆن ئاوا بە ئاسانی دەستبەسەر كراون، بۆ جەماعەتی وەرماش ئەوەندە موهیمن شێخ برقان و ستافەكەی ئاوا بەرن؟

سەسیل: بەڵێ بۆ ئەوان ئاسان بوو خەتای تۆیە، تۆ وات كرد ئەوان بگیرێن تۆ بەقسەی كەس ناكەیت هۆكاری سەرەكی تۆ بوویت، ئەوان لەبەر تۆ دەست بەسەر كراون!

ماكوان: چی بەڕاستتە، جا من چیم كردووە ؟

## خۆ بەدەستەدانەوەی من بە جنۆکەکان و ئازاد کردنی برا جنۆکەکانم

سەسیل هات و هەموو کارەکانی دا بەسەرمندا و منیش زۆر بێزار بووم لە قسەکان کە وتی: هەمووی خەتای تۆ بووە، بە هۆکاری تۆ گیراون ..!

ماکوان: جا من چیم کردووە، خۆ من لە دنیای ئێوەدا نیم تا خەتای من بێت ئەوانم دابێت بەدەستەوە جاسوسیم کردبێت؟

سەسیل: ڕاستە جاسوس نیت، بە بێئاگایی کارەکەت کردووە بێ ئەوەی بە خۆت بزانیت ئەوان سوودیان لە تۆ وەرگرتوە، لە ڕێگای درکاندنی هەندێك نهێنی لە جێگای ترەوە دەستیان کەوتووە کە تۆ هەموویت خستۆتە بەردەستی ئەوان بێ ئەوەی بە خۆت بزانیت ..

ماکوان: ئەمە چییە من بە بێئاگایی باسمکردووە خستومەتە بن دەستی ئەوان و ئەوان سوودیان لێوەرگرتوە؟ یان هەر ئەتەوێت قسەی زل بکەیت و بینێیت بەسەر مندا، بەڵگەکەت چییە بۆ ئەو قسەیەت سەسیل؟

سەسیل: بەڵگەکەم ئەوەیە ئەو کاتەی کە گەڕایتەوە، لە ئەڵمانیا و لە وڵاتی سوید بوویت، کە بووە شەڕت لەگەڵ (سپیا) ئێمەش تۆمان برد بۆ جێگای خۆمان.. چوویت هەموویت نووسیوە لە کتێبی سێیەم ئەم باسانەی خۆماندا هەموویت ئاشکرا کردووە ..

ماکوان: سپیا کێیە؟ من هەر نایناسم، باسی چی دەکەیت؟

سەسیل: ڕاستە، ببوورە من هەڵە بووم سپیا ناوی خۆی گۆڕیبوو بە پەروانە و ئەوەی ڕوویدابوو چوویت لە بەشی سێیەمدا هەموویت باس کردووە و

جێگا و شووێنی شێخ برقان و هەندێك نهینی تر کە تۆ بە چاو خۆت بینیوتە و بێ ئەوەی بزانیت کە چییە باست کردووە کە لەڕاستیدا تۆ هەموو کۆدەکانت بۆ جەماعەتی وەرماش ئاشکرا کردووە و ویرسان توانیویەتی کاری لەسەر بکات، لە چەند شەوی ڕابوردا دایان بەسەر شێخ برقان و ئەو برایانەی ترماندا هەموویان گیراون، هۆکارەکەشی تۆ بوویت بە نەزانی خۆت خۆتت و ئەوانیشت خستۆتە ناو چاڵێکی گەورەوە .!

ماکوان: کەس بە منی نەوتووە نابیت ئەو باسانە بنووسیت، ئێوە هەموو دەزانن، من ئەوەی دەیبینم و باسی دەکەین دەیکەمە کتێب و باس و خواستەکانمان بڵاو دەکەمەوە، پێموایە تۆش و حەزقیل و شێخ برقان و ڕاقی .. هتد هەمووتان دەزانن، خۆ ئێستا ئەوەندەی ئێوە دەناسم و ناوی خەڵکی لای ئێوە فێر بووم لە مرۆڤەکان ئەوەندە نانسم، بەهەرحاڵ خەتای من نییە، ئێوە خۆتان منتان ئاگادار نەکردۆتەوە، هیوام وایە ئێستا ئاوا قسە مەکە و هەمووی مەینە بەسەر مندا، فەرموو بزانم من چیم پێدەکرێت ، با بیکەم و چیتان پێباشە من بیکەم؟

سەسیل: سەرەتا تۆ دەبێت خۆت بدەی بەدەستەوە بۆ ئەوەی ئەوان ئازاد بن، ئەمە خاڵی یەکەمە و سەرەتایەکی گرنگە بۆ ئەوەی بیکەین ..

ماکوان: ئەزانی ئەو قسەیەت واتای چیە..! خۆم بەدەم بەدەستەوە کافر بوونی خۆم ڕاگەیەنم و تەواو، خۆ ئەوان ناچن من بگرن و بمخەنە زیندان، ئەوان داوا لە من دەکەن کە کاریان لەگەڵ بکەم ..!

سەسیل: ڕاستە، بەڵام دووربەدوور ئاگامان لێتە و ئاڕاستە دەکەین و فێرت دەکەم و چی بڵێیت لە کاتی ئەوان کۆنتراکت لەگەڵ دەکەن، بۆ ئەوەی کۆنتراکتەکە بەتاڵ بکەیتەوە، پاشان نەتوانن زاڵ بن بەسەرتا و چاودێریت دەکەین ..!

ماكوان: جا پێت وایە، ئەوەی تۆ دەیزانی ئەوان نەیزانن و ئەقڵیان پێنەشكێت ..؟

سەسیل: هەوڵی جدی خۆمان ئەدەین و تا بتوانین هاوكاری براكانمان بكەین، مەگەر ئێمە موسڵمان نین، هەموومان؟

ماكوان: با موسڵمانین بەڵام ناكرێت بۆ ئازاد كردنی ئەوان من كافر بم و ئەوان هەموو بچنە بەهەشت من بنێرن بۆ جەهەنەم، دۆزەخ بە من گەرم بكرێت، جا بۆیە من هاوكار و ڕەفیقایەتی ئێوەم كرد كە دووربم لە جەهەنەم، ئێستا بەبێ ئەوەی بە خۆم بزانم، ئێوە وا بە هیواشی پاڵم پێوە دەنێن بۆ جەهەنەم ..!

سەسیل: هەوڵبدە هێمن بەرەوە بڕۆین بۆ مزگەوت لەوێ قسە دەكەین بۆ ئەوەی قسەكانمان نەبیستراو بێت، لەدوای نوێژی بەیانی قسە دەكەین و پێت دەڵێم چی بكە و چی مەكە لە كاتی خۆتدان بەدەستەوە لەگەڵ وەرماش دا، باشە؟

ماكوان: زۆر باشە، كاتی نوێژی بەیانی یەكتر دەبینین لەمزگەوت، لەڕاستیدا كە سەسیل باسی مزگەوتی كرد، ئیتر گومانم نەما لە ڕاستگۆیی كە ڕاست دەكات، چوونكە پێشتر نەدەهاتە مزگەوت و توانای نەبوو نزیك بێتەوە، بۆیە خواحافیزمان كرد لە یەكتر و بە ئومێدی لە نوێژی بەیانی لە مزگەوت یەكتر ببینینەوە .

ئێوارەكەی تا شەو چاوەڕێی نوێژی بەیانیم دەكرد، بەهەر حاڵ نەخەوتووم، كاتی نوێژی بەیانی نزیك بوویەوە، بەرەو مزگەوت كەوتمە ڕێ، تا كاتی نوێژ لە مزگەوت چەند لاپەڕەیەك لە قورئانم خوێند و تا كات نوێژ و نوێژمان كرد و من مامەوە چاوەڕوانی سەسیلم دەكرد، خۆم دڕەنگ خست، تا یەكێك لەو برایانەی ئیدارەی مزگەوت هاتە لام و وتی: ئەبو ئاناء ئەگەر دەمێنیتەوە با كلیلی مزگەوتت بدەمێ و دوای خۆت دایبخە؟

سوپاسم کرد و وتم وادەکەم حەز دەکەم جاری بمێنمەوە و کلیلەکان بدە بەمن و لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ (ان شاءالله)تەسلیمی خۆت یان کەسێکی تر لە برایانی ئیدارە دەکەمەوە ..

دەستم کردەوە بە قورئان خوێند، بە ئومێدی هاتنی سەسیل بەڵام هەر دیار نەبوو، زۆر ماندوو بووم پاڵم دابووە بە پایەی مزگەوتەوە، خەوم لێکەوت و نازانم چەند بوو خەوتم بە فڕە فڕی سەسیل خەبەرمبوویەوە، کە دەهاتن بۆ لام، دەنگی هاتنیان وەکو باڵی پەپولە چۆن فڕە فڕ دەکات دەنگێکی وایان دەهات .. چاوم بەرز کردەوە تەماشام کرد سەسیل لەبەر چاومدا بوو ..

سەسیل: ببوورە دڕەنگ هاتم لەگەڵ میا سەرقاڵ بووین بە هەندێ کاری تایبەتی خۆمانەوە، بەڵام جوان گوێ بگرە چیت فێر دەکەم و چی دەکەیت کە دەچیت بۆ لای وەرماش..

ماکوان: وا گوێم گرتووە حەزدەکەی دەینووسم بە قەڵەم و وەرەقە؟

سەسیل: نا بۆ وا دەکەیت و دەینووسیت، خۆ ئەوانیش خوێنەواریان هەیە تۆ بە ئاسانی ئەیخەیتە بەردەستیان و پلانەکەی من ئاشکرا دەکەیت، هەوڵدە با لەمێشکدا بیت و کە پێویستت پێ بوو بەکاری بهینە، ئاوا باشترە..!

ماکوان: باشە، تۆ چی دەڵێیت باوا بێت قسەکەت ڕاستە ..

سەسیل: سەرەتا ئەوە بزانە کە جنۆکە بە گشتی و بەتایبەتیش ئەوانەی کە کافرن، دەسەڵاتێکی زۆر لاواز و کەمیان هەیە، ناتوانن هەندێك کاری کەم بکەن بەرانبەر بە مرۆڤ، جا ئەوە گرنگە بزانیت لە مێشکتا بچەسپێت، پێم وابێت، خۆشت باش ئەوە دەزانیت .

ماکوان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە دەیزانم، خوای گەورە دەفەرموویێت کە (إِنَّ كَيدَ الشَّيطانِ كانَ ضَعيفًا)

سەسیل: زۆر ڕاستە: ئەوەی کە پلان و توانا ئەدا بەوان خودی مرۆڤەکان خۆیانن، هەوڵبدە کە کەوتیتە ژێر کاریگەر و هەژمونی ئەوان و وەرماش ،پاشان کە چوویتە لای زۆر ڕێزت لێدەگرێت و شتی زۆر باش پێشکەش دەکات، بەس دڵنیابە هەمووی فرتو فێڵە و هەڵنەخڵەتێیت، ئەو دەزانیت کە تۆ بە فشار خۆت ڕادەستی کردووە، بەم هۆکارە هیچ فشاری زۆرت بۆ ناهینێت، ئەو توانا و وزەی لە لای تۆوە وەکو هالە دەردەچێت ئێمە دەیبینین، بەڵام تۆ خۆت هەستی پێناکەیت ئەوان باش دەزانن، هەوڵبدە هەرگیز نەهێڵیت هالەکەت لاواز بێت، ئەوە زۆر گرنگە ..

ماکوان: هالە مەبەستت ئە وزەیە کە بە هۆکاری دەست نوێژ و خۆدی نوێژ و قورئان و خوێندن و زیکرەکانەوە هەمانە؟

سەسیل: بەڵێ مەبەستم ئەوەیە، خۆت باش دەزانیت و پاشان هیچیان پێناکرێت و ئەگەر لەکاتی بەستنی کۆنترەکتەکەدا، ئەم قسەیە بکەیت، ئامادەی دەرببڕە بۆ هەموو کارێکی ئەوان داوات لێدەکەن، بەڵام بڵێ هەرکارێك کە ئەنجامی ئەدەم، دەبێت خەڵکی بزانیت چۆن کارەکەم ئەنجام داوە؟!

ماکوان: ئەمەیە نهێنییەکە، جا ئەوە چییە، نهێنی ئەو قسە لە کوێدایە؟

سەسیل: ورد بیر لە قسەکە بکەرەوە، هیچ شەیتانێك ئەوەندە گەمژە و ئەحمەق نییە ئەو تۆزە دەسەڵاتەی هەیە ئاشکرای بکات بۆ خەڵکی، ئەگەر هاتوو، هەر کارێك کە ئەوان بۆتیان کرد و تۆش کارت بۆ ئەنجام دان و داوات کرد کارەکەیان ئاشکرا بکەن، لەو کاتەدا هەموو کارەکانیان بەدرۆ دەکەوێتەوە، ئەوانەی کە بەدوای ماددیگەراییەوە بوون هەمووی هەڵدەوشێتەوە و تۆ دوو کار ئەنجام ئەدەیت کاری یەکەمیان ئەوەیە،

دەستی ئەوان ئاشکرا دەکەیت و کاری دووەهەمیش ئەوەیە کە هەرچی بانگەشەی ماددی و ماددیگەراکانە هەمووی هەڵدەشێنیتەوە، تۆ بڵێیت ئەوان ئەوەندە بێئەقڵ بن ئەوە ئاشکرا بکەن، بۆ خەڵکی گشتی؟

ماکوان: قسەکانت سەرنجی ڕاکێشام تا ڕادەیەك زۆر تەواوە ..

سەسیل: بەڵێ بەدڵنیایەوە، ئێمە وەکو جنۆکەی موسڵمان ناتوانین خۆمان بۆ هەموو کەس ئاشکرا بکەین، ئێستا ئەوان چۆن ئەو کارە ئەنجام ئەدەن؟

ماکوان: باشە ئەوەی باسی دەکەیت، چۆن دەگاتەوە بە وەرماش و من بانگ دەکەن و چۆن بتوانم ئەوان ئازاد بکەم ..؟

سەسیل: من و میا دەچینەوە بۆلای ئەوان و دانوستان و قسەیان لەگەڵ دەکەین کە تۆمان ڕازی کردووە، تۆش دەبێت ئامادەیی خۆت دەرببریت، کە ئامادەییت تێدایە، کەی هاتن بۆ لات و ویستیان بتبەن بۆلای ئەوان ئامادەیی خۆت نیشان بدە، بەڵام بە بەرچاوی خۆتەوە دەبێت ئازادیان بکەن، منیش با پێت بڵێم کۆتایی هاتووە، ئەوکات دەست بکە بەنووسینی کۆنتراکتەکە، لەو حاڵەتەدا تەنها من و میا دەمێنینەوە کە دەست کرا بە دامەزراندنی کۆنتراکتی نێوانی هەردوولا و پەیمانەکەتان بەست ئەوکات ئێمەش دەڕۆین و ئەوان هەرچیان وت بڵێ باشە و لە کۆتاییدا بڵێ من هەمووی دەکەم تەنها یەك مەرجم هەیە .. مەرجەکەیان پێبڵێ هەر کارێکمان کرد، دەبێت بۆ خەڵکی ئاشکرا بێت ..؟!

ماکوان: داواکان چی دەبێت؟

سەسیل: لە ئێستادا نازانم چی دەبێت بەڵام هەرچیت داوا لێبکەن، بەردەوام لەگەڵتا دەبم و ئەگەر منیش ئاگادارت نەکەمەوە، میا دێت بۆ لات ..!

ماکوان: میا کێیە؟

سەسیل: میا لەگەڵمدایە ، بانگی کرد و میا هات ..

بەیەکەوە تەعاروفمان کرد و کوڕێکی تەمەن چل ساڵ دەردەکەوت، بەهێز و لاشە جوان هاتە پیش چاوم،

ئەوان ڕۆیشتن و منیش گەڕامەوە بۆ ماڵەوە لێیخەوتم ..

ئەو ڕۆژە چاوەڕوانی هاتنی جنۆکەکانم دەکرد، هیچکام لەوان دیار نەبوون، پاشان بۆ ڕۆژی دوایی هیچ دەنگ نەبوو، من هەر چاوەڕوان بووم، تا نزیکەی یەك هەفتە هیچ ڕووی نەدا، لەدڵی خۆمدا بیرم کەوتەوە کە هیچ نەبێت بگەڕێمەوە بۆ سەر لێواری دەریاکە و بەڵکو لەوێ بیانبینم، شتێك ڕوویدات، قولاپم هەڵگرت و چوومە سەر دەریاکە بۆ ماسی گرتن، ئێوارەیەکی دڕەنگ بوو ..چاوەڕێم دەکرد و قولاپم هەڵئەدا ماسییەکم نەگرت ..!

تا لە پڕ کەسێك بە قولاپێکەوە دەرکەوت وتم خۆیانن، هاتە لام بە نەرویجی وتی دەمی قولاپێکت پێیە قولاپەکەم پچڕاوە..؟

ماکوان: بەڵێ فەرموو دانەیەکم دایە و وتم ئەگەر ئەمێنیتەوە دانەیەکی تریش بەرە من زۆرم پێیە ..!

کابرای ماسیگر: خوا حافیزی کرد بە نەرویجی و پاشان بە کوردی وتی کێشەی تۆ ئەوەیە، لە هەرشتێك دەمانەوێت نوقسان بهێنیت، بەو پەڕی چاکی لێدەردەچیت؟

ماکوان: تۆش لە شەیتانەکانی؟

کابرای ماسیگر: بەڵێ لەوانم ئێستا پێکەوە دەچین بۆ لای وەرماش..

ماکوان: ئەوە چییە من ئاوا تێدا سەرکەوتووم؟

کابرای ماسیگری شەیتان: بەخشندەیی!

ماکوان: بۆ دوو دەمە قولاپ ئەوەندە سەرسامن، دیارە ئێوە زۆر چرۆك و ڕەزیلن!

کابرای ماسیگری شەیتان: لای من ئەوە گرنگە، کە بەخشیندەیت ئەوە گرنگ نییە چی دەبەخشیت، هۆکاری گەورەیی مرۆڤەکان لە بەخشیندەییاندا دەردەکەوێت ..

ماکوان: دڵم بەقسەکەت خۆشە، بەڵام چوونکە شەیتان و کافریت و جەماعەتی وەرماش-ی، هیچ کاریگەری نییە ..

کابرای ماسیگری شەیتان: ئێمە بچینە لای هەر کەس تاقی دەکەینەوە بە بەخشندەیی، کە بزانین دەبەخشێت، ئێمە هیوا بڕوا دەکات، ئەوکەسانەی کە پیسکەو دەست دەگرن بە ماڵەکانیانەوە و نابەخشن، ئەوە بۆ ئێمە باشە، ئامادەی بڕۆین؟

ماکوان: بابڕۆین، لەدڵی خۆمدا وتم خوا بدات بە ناوی دەمتاندا دەبێت چیتان لە ژێر سەردا بێت ..!

بەدەورمدا لە شێوەی بازنەیەك دا کێشای و دوو سێگۆشەی دروست کرد و کە لە ئەستێرەیەکی شەش پاڵو نیشاندار و پێی وتم چاوت بنوقێنە و هەناسەیەکی قوڵ هەڵمژە ..

کردم و لە پڕ کەوتمە سەر زەوی کە چاومکردەوە لەو جێگایە بووم کە حەزقیل و شێخ برقان و جەماعەت لەوێدا ئەسیر کرابوون ..

شێخ برقان: بۆ هاتوویت، خۆت بێدین دەکەیت و لەبەر خاتری ئێمە ..؟

ئاگام لێبوو كێشایان بە شێخ برقاندا، تورە بووم وتم ئەگەر ئازاری بدەن پەشیمان دەبمەوە لە هەرچی كە وتومە هیچ كارێكتان لەگەڵ ناكەم ..؟

تەماشای حەزقیلم كرد هەر دەگریا چووم بۆ لای وتم حەزە گیان، مەگری پێبكەنە، ژیان ئەگەر بە قورسی بیگریت بۆت قورسدەكات، بە دەمیەوە پێبكەنە بۆت ئاسان دەكات، پێبكەنە، تۆ لە قوتابخانەی (محمد)یت صلی الله علیه وسلم..

رووم كردە شێخ برقان، ئەو چەند ئایەتەم بۆ خوێند (فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا * إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا * فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ * وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ ) ئاگام لە شڵەژانێكی زۆر بوو بەس نەمزانی چی ڕوویداوە و لە پڕ وەرماش دەركەوت و هات بۆ لام و بە خێرهاتنی كردم ..

ماكوان: دەستم كرد بە پێكەنین و وتم كاری خۆتت كرد، ئەی مەلعون؟

وەرماش: بەخێر بێیت جێگای تۆ لای منە نەك ئەم پیسانە .. !

ماكوان: ئەوانە پیس نین، ئەگەر پیسن منیش هاوڕێ و برای ئەوانم، بۆیە هاتووم تا ئەوان ئازاد بكەیت، بەهیچ شێوەیەك ڕازی نیم قسەیان پێبڵێیت، ئازادیان بكە و با من و تۆش ببینە هاوڕێ و واز لەوان بهێنە..!

وەرماش: چۆن زانیت، كە ئازادیان دەكەم؟

ماكوان: لە تەرەفی تۆوە هەواڵم بۆ هاتووە كە ئازادیان دەكەیت بە مەرجێك كە من كار بكەم لەگەڵتاندا، وایە؟

وەرماش: تەرەفی من، یان تەرەفی ئەوان؟

ماكوان: نەمدەزانی چی بڵێم دەترسام، بەڵام خوای گەورە خستیە دڵمەوە.. خۆ هیچ ڕووینەداوە، بۆ بشڵەژێم، بە ئاشكرا، بڵێم سەسیل بوو، لە

مزگەوت وتی ئێمە دەچین دانوستانی لەگەڵ دەکەم، وتم بیووره بیرم کەوتەوە، هاوڕێکانی شێخ برقان بوو .. !

وەرماش: ناوی دەزانیت؟

ماکوان: ئەی چۆن میا .. هات بۆ لام ..

وەرماش: باشە با بڕۆین پیاسەیەك بکەین، هەندێك قسە بکەین؟

ماکوان: بابڕۆین، بەڵام پێش ڕۆیشتنمان دەبێت ئەوان هەموو ئازاد بکەیت و دڵنیابووم کە ئەوانیشت ئازاد کردووە ، ئینجا هەنگاوم لەگەڵ هەنگاوت دەڕوات، ڕوونە؟

وەرماش: هەموویان ئازاد بکەن ..

لەدوورەوە گوێم لە شێخ برقان بوو هاواری کرد، وتی: ماکوان خۆت مەفرۆشە، بەهەرزان قیمەتت زۆر لەوە گرانترە بچیتە ژێر رکێفی ئەم شەیتانە..!

وەرماش: با بڕۆن لێرە .. ئیشمان پێیان نەماوە ..!

دڵنیابوومەوە ئەوان ڕۆیشتن .. ئنجا کەوتمە ڕێ لەگەڵ وەرماش..

# کۆنتراکتێکی کافربوون

کە لەگەڵ وەرماش کەوتینە قسە یەکەم داوام لەو ئەوەبوو کە دەبێت هەرچی کردووە پێش هەنگاونان بۆ قسەکردن دەبێت هاوڕێکانم ئازاد بکات.

وەرماش فەرمانی کرد بە ئازادکردنی هەموو هاوڕێکانم، گوێم لە شێخ بەرقان بوو وتی: ماکوان بۆ ئازادبوونی ئێمە خۆت بێدین مەکە.

مردن بۆ ئێمە باشترە لەو کارەی تۆ دەیکەیت.

من وەڵامم نەدایەوە، وەرماش قیژاندی بەسەر دەست و پێوەندەکانی دا وتی ئەمانە لێرە دووربخەنەوە با بڕۆن.

ماکوان: چۆن بزانم کە هاوڕێکانمت ئازاد کردووە؟

وەرماش: چیت دەوێت بڵێ بۆ ئەوەی دڵنیابیت کە ئازاد بوون.

ماکوان: با (میا) بێت قسەی لەگەڵ دەکەن، بزانم لە ژێر ڕکێفی تۆدا ڕۆیشتوون.

وەرماش: میای بۆ بدۆزنەوە و بانگی بکەنە ئێرە.

لەچاوەڕوانی هاتنی میا دا بووم بێتە لام، ئەو جێگایەی لێی بووم گۆڕا بۆ کەناری دەریایەکی پڕ خۆڵی نەرم و گەرم، پڕ بوو لە ئافرەت و پیاو لەکەناری دەریاکە و هەندێکیشیان مەلەیان دەکرد، ئەو هەموو ئافرەتە جوانە بە ڕووتی دەهاتنە بەرچاوم، هەریەکە جۆرە مایۆیەک و جل و

بەرگی مەلەیان لەبەردا بوو، بە پێكەنین و نازكردنەوە تەماشای منیان دەكرد.

هەمووان بەدەستیانە بوو خواردنەوەی جۆراوجۆر، منیش قوڕگم وشك ببووو، نەمدەوێرا هیچ بخۆم و بخۆمەوە.

زوو زووش ئەم هەموو جوانە دەهاتن و دەچوون خواردنەوەیان پێشكەش دەكردم.

كە·هەموویان لەشوولاریان جوان و وروژێنەر بوون. هەرچۆن بوو دانم بەخۆدا گرت تا میا هات.

میا: فەرموو ماكوان!

ماكوان: تۆ میای هاورێمی؟

میا: بەڵێ، ئەوم.

ماكوان: وەرە بچپێنە بەگوێمدا و ناونیشانێكم بدەرێ، بۆ ئەوەی بڕوات پێ بكەم.

میا: بەهێواشی وتی: لە مزگەوت بوویت كاتێك من و سەسیل هاتینە لات سوڕەتی (الرعد)ت دەخوێند.

ماكوان: ڕاستە! جەماعەت ئازاد بوون؟

میا: بەڵێ، هەموو ئازاد بوون، تۆش ئاگات لەخۆت بێت.

كەوای وت زۆر خۆشحاڵ بووم، بە میام وت بڕۆ بەوانیش بلێ دوعای خێر بۆ منیش بكەن.

بانگی وەرماش-م كرد وتم وەرە با قسە بكەین.

وەرماش: ماكوان پێش هەموو شتێك ئەوە بزانە كە زۆر خۆشەویستی لای من و هاوڕێكانم، زۆرێكی تر لە مرۆڤە هاوڕێكانمان كە بەیەكەوە كار دەكەین، خۆش دەژین لەم ژیانەدا بەچاوی دوژمن تەماشامان مەكە، بەڵكو وەكو برا و دۆست و هاوڕێی خۆت تەماشامان بكە.

بەردەوام بوو لەقسەكانی و وتی: لە ئەورۆوە، دۆلار یان یەنی یابانی لەهەرجۆرێك ئەتەوێت، ماڵ، سەیارە، ئاڵتون، ئەڵماس، هەرچیت دەوێت داوا بكە.

چ مەنسەبێك حەز لێدەكەیت، كام دوورگە و جەزیرە ئەتەوێت بڕۆ دەست نیشانی بكە ببێتە موڵكی تۆ.

هەرچی داوا بكەیت بۆت دەستەبەر دەكەین.

ماكوان: ئەم هەمووە بەرانبەر چی؟!

وەرماش: هیچمان ناوێت تەنها با هاوڕێ بین.

ماكوان: ئەزانی چی تۆ قسە لەگەڵ منداڵ و موراهیق ناكەیت وا بزانیت من كەسێكی هەرزەكارم و بەدوو قسەی لووس بڕۆیت و وا بزانیت سابوونت لەبنی پێم داوە، ئیتر هەڵخلیسكاوم وا لەو باسانە بێنە و وەرە ناو باس و جەوهەری ئەوەی ئەتەوێت.

وەرماش: ماکوان ئەزانی بۆچی خۆشم ئەوێیت؟

ماکوان: بڕواناکەم منت خۆش بوێت، بەڵام نازانم بۆ؟

وەرماش: کەسێکی واقیعیت و زوو درك بەشت دەکەیت.

ماکوان: بڵێ بزانم چیت دەوێت؟

وەرماش: سەرەتا نابێت هیچ پەیوەندیت هەبێت بە جنۆکە موسوڵمانەکانەوە.

ماکوان: ئەگەر بەقسەم نەکردی، چی دەبێت؟

وەرماش: ئازاری زۆرت دەدەم، ئەوانیش لەناو دەبەم، لەگەڵ ئێمە بە، واز لەوان بهێنە، هاوڕێیەتی ئێمە بکە.

ماکوان: وابەقسەم کردی، چیم بۆ دەکەیت لەبەرانبەر ئەوەدا؟

وەرماش: بەدڵمە، داوا بکە و بۆت جێبەجێ بکەم.

ماکوان: دڵنیایت ئەوەی داوای دەکەم ئەنجامی دەدەیت؟

وەرماش: بەدڵنیاییەوە، بەو مەرجەی دووربیت لەکاری ئیسلام و دینداری!

ماواکن: ئەزانم ئێوە شەیتان و خوانەناس و بێدینن، منیش داوادەکەم و داواکەم هیچ پەیوەندی بەوانەوە نییە.

وەرماش: تۆ داوا بکە و ئەنجامی بدەین بۆت.

ماکوان: ئەمەوێت ببمە خاوەن چەکی ئەتۆم و ئەو دەسەڵاتەم بدەرێ، بەلای کەمەوە خاوەن ١٠ مووشەکی ئەتۆم بم!

وەرماش: وامزانی دەڵێیت باڵەخانە و پارەی زۆرم دەوێت و لەگەڵ ئافرەت بیت، ئەتوانیت هێزی فڕین بە ئاسمان دا و جۆرەها سیحر و جادوو بخەینە بەردەستت، بەڵام ئەوەی داوای دەکەیت من هیچ دەسەڵاتم نییە و ناتوانم ئەنجامی بدەم بۆت.

ماکوان: کەواتە هیچ! ئێوە نەتوانن داواکەم قبوڵ بکەن ئەوا منیش هیچ داوایەکی ئێوە قبوڵ ناکەم. ئەوەی داوام کردووە ئەوەندە شتێکی قورس نییە بۆ ئێوە.

وەرماش: وەڵامت لێ دەگێڕمەوە.

ماکوان: تا وەڵامم بۆ نەهێنیتەوە ئەوا من ئامادە نیم هیچ کۆنتراکێکتان لەگەڵ ببەستم.

وەرماش: نا، تۆ دەبێت هەرکارێکمان لەگەڵ بکەیت و ئێمەش داوایەکت بۆ جێبەجێ بکەین وەك دیاری، ئەو داوایەت ئەگەیەنمە سەرووی خۆم، بزانم چی دەڵێن؟

ماکوان: سیامەندم بۆ بنێرن بزانم بۆ دەیەوێت سیحر لەمن بکات؟

وەرماش: ئەوە زۆر ئاسانە بەسەرچاو.

ماکوان: ئەوە داواکاری من نییە، بەڵکو وەك دیارییەك لێتان وەردەگرم، باشە؟!

وەرماش: بەسەرچاو، وەکو ئێوەی کورد دەڵێن، منیش دەمەوێت تۆش دیارییەکمان پێشکەش بکەیت.

ماکوان: دیاری من ئەوەیە کە هاتووم بۆلاتان لەگەڵتان کار دەکەم.

وەرماش: نا کوڕی باش ئەوە دیاری نەبوو، بەڵکو ئەنجامی ئازادکردنی ئەو کۆمەڵە کەسە بوو، وایە؟

ماکوان: بڕۆ بە دوسیرمان بڵێ، کە کێ ناونیشان و جێگا و مەکانی ئەوانی دانێ؟

وەرماش: بەڵام تۆ بۆ ئێمەت نەنارد، نووسیت و ئێمە خۆمان زانیارییەکانمان وەرگرت.

ئیتر زانیم سەسیل ڕاستی کردووە کە برا جنۆکەکان لەڕێگای منەوە دەستبەسەر کراون.

ماکوان: گرنگ ئەوەیە منتان دەستکەوت، من دیاری خۆمم پێشکەش کردوون، چاوەڕوانی دیاری ئێوەم، ماندووم دەگەڕێمەوە.

وەرماش: زۆرباشە، بڕۆ ئیسراحەت بکە، فەرموو بگەڕێرەوە.

بەپەلە بە ترسەوە چوومەوە بۆ ماڵەوە، دەستنوێژم گرت و نوێژی مەغریب و عیشام کرد، دەستم کرد بە قورئان خوێندن بەدەنگی بەرز، زوو زووش خێزانم بانگی دەکردم و دەیوت ئەوە داوای جنۆکەکانت دەکەیت یان ڕاویان دەنێیت؟ دەنگت زۆر بەرزە کەمێك هێواشتر لەبەر دراوسێکان.

ماوەی مانگێك تێپەڕی و هیچ دەنگ و باسێك ڕووینەدا، منیش بەردەوام بووم لەنوێژ و بەندایەتی و قورئان خوێندن، لە دڵی خۆمدا دەموت، بەڵکو خوای گەورە لەم بەڵا و موسیبەتە ڕزگارم بکات.

ئێوارەیەکی ڕۆژی شەممە لەبازاڕدا دەگەڕام بۆ کڕینی مۆبایل، سەرقاڵ بووم و خەیاڵم لای جۆری مۆبایل بوو، لەدوکانێکدا بووم بەناوی (ئێڵ چوێپ)، لەپڕ وەرماش-م بینی و بەپێکەنینەوە هات بۆلام.

وەرماش: ماڵت ئاوابێت ئەوەندە سەرقاڵی بە خۆت و بەندایەتی لەم ئیسلامەدا کەس ناتوانێت لێت نزیك ببێتەوە.

منیش هیچ لەقسەکانی تێنەگەیشتم و وتم وەرماش ماوەیەکە دەنگت نییە، منتان بیرچۆتەوە. ها چیت کرد؟ چەکی ئەتۆمت پەیدا کرد بۆم؟

وەرماش: دە موشەکەکە بخەینە بەردەستت، تۆ چیمان بۆ دەکەیت؟

ماکوان: هەرچیتان بوێت بۆتان دەکەم، لە دڵی خۆم دا دەمزانی توانایان نییە ئەو کارە ئەنجام بدەن.

چوونکە شەوێك بەدیار بەرنامەیەکی دیکۆمێنتارییەوە دانیشتووبم باسی هێزی وزەی ئەتۆمی دەکرد، کە چەند قۆناغێك تێپەڕ دەکات، پاشان جۆرێك لە ماددەی بەهێزتر لە ئاسن پاشەڕۆی دەبێت کە ناوی پۆڵایە.

ڕۆژێك حەزقیل بۆی باسکردم کە جنۆکە توانای خۆگونجاندنی هەیە لەگەڵ هەموو ماددە و وزەیەکدا تەنها ئاسن نەبێت، کە وزەی ئەوان لەگەڵ ئاسندا موجەب و سالب دروست دەکەن، زۆر جار جنۆکەکان بەهۆکاری ئاسن لەناو دەچن.

ئەم زانیارییەم لە مێشکی خۆم دا هەڵگرتبوو، وتم حەتمەن دوورن لەبواری ئەتۆم و ئەو ناوچانەی کە کارگەی ئاسنی تێدایە.

هەربۆیە نەترسام لەوەی کە وتم چیتان بوویێت دەیکەم، زانیم تاقیکردنەوەیە.

وەرماش: ئەگەر دە موشەکەکەت بدەینێ چۆن بەکاری دەهێنیت؟

ماکوان: ئەوە کێشەی تۆ نییە، زانیم پرسیارەکەی منداڵانەیە و بەس فشەکردنە وەك کوردەواری دەڵێن.

وەرماش: واز لە ئیسلام دەهێنیت بۆ ئەو کارە ئێمە بۆت ئەنجام بدەین.

ماکوان: زانیم زۆر لاوازە، بۆم دووبارە کردەوە کە وتم ئێوە چیتان بوویێت دەیکەم، بێگومان دڵنیانەبوومایە بەو شێوەیە وەڵامم نەدەدایەوە، چوونکە دانتان بەوەی بڵێم واز لە ئیسلام دەهێنم جائیز نییە و کوفرە، چوونکە من لەو کاتەدا هیچ فشارێکم لەسەر نەبوو دەشمزانی درۆ دەکات.

وەرماش: ناکرێت داوایەکی تر بکەیت، بۆ ئەوەی واز لە ئایینەکەت نەهێنی من لەبەر خۆت دەڵێم.

ماکوان: ئێوە بە منتان دەوت داوابکە بۆت جێبەجی بکەین، داوای دیارییەکم کرد هیچتان نەکرد تا ١١ ڕۆژی تر وەڵام نەدەنەوە هەموو پەیوەندییەك دەپچڕێنم و دەگەڕێمەوە بۆلای براکانم.

لەدڵی خۆمدا وتم ئێوە ئەوەندە شەریف نین و خەمی دینی منتان بێت، دەمزانی پێی ناکرێت و کارێکی ئاستەمە.

لەدوکانەکە بەجێی هێشتم و سەرقاڵ بووم بەتەماشای تەلەفۆن، لەو ساتەدا تەلەفۆنێکم بۆ هات ژمارەکەم نەناسی و هەڵم نەگرت.

لەسەریەك چەند جارێك ئەو ژمارەیە پەیوەندی کرد، منیش هەڵمگرت کەسێك بەنەرویجی قسەی کرد و خۆی ناساند وتی: من خەڵکی ئێرانم پێم خۆشە بتناسم و ئەو تەلەفۆنەی بە شووێنیدا دەگەڕێیت من بۆت دەهێنم بەدیاری.

ماکوان: سوپاسم کرد و پێم وت پێویست ناکات، خۆی وا نیشان دا کە زۆر موهیمە و ئاگاداری کردارەکانی منە، نەیدەزانی من لەوسەری فرتوفێڵەکانی ئەوانەوە هاتوومەتەوە، بە توڕەییەوە بە کوردی پێم وت وەرە دەمەوێت بتبینم!

بەنەرویجی وتی من نازانم بە کوردی قسە بکەم!

ماکوان: خەڵکی کوێیت؟

سیامەند: من خەڵکی ئێرانم و فارسم لە شاری تاران لەدایك بووم.

بەفارسی قسەم لەگەڵ کرد وتم وەرە با بتبینم، کەهاتی ئەو سۆزانییەش لەگەڵ خۆت بهێنە.

سیامەند: ئاغا ماکوان مەبەستت کێیە؟

ماکوان: مەبەستم کرۆنیکایە، کەوام وت تفێکی قووت دا گوێم لە دەنگی تف قوتدانەکەی بوو شلەژا، وای زانی من هیچ نازانم، چوونکە دیاربوو کرۆنیکا هیچی پێنەوتبوو لەوەی کە ڕوویدا بوو.

سیامەند: بەسەرچاو بێینە كوێ؟

وا هەستی دەكرد مەبەستم ئەوەیە كە كرۆنیكا بهێنێت بۆ من لەگەڵی ڕابوێرم، بەڵام من نەمدەزانی ئەو ساحیرە خوێڕییە گەوادە وا بیردەكاتەوە، من مەبەستم لە قسەكەم ئەوەبوو كە ئەویش هەست بكات كە منیش توانای زانینی شتم هەیە و مەبەستم بوو كاتێك هاتن هەردووكیان بچوك بكەمەوە لەبەردەم یەكتردا، ئیتر قیمەتی خۆیان و منیش بزانن.

ماكوان: ئەو ژمارە تەلەفۆنە لای خۆم یاداشت دەكەم ئاگادارت دەكەمەوە كەی بێنە لام.

سیامەند: باشە ئاغا ماكوان.

لە دوكانەكە هاتمە دەرەوە تەلەفۆنم كرد بۆ كاوە لەگەڵ چەند هاوڕێیەكی ترم ئاگادارم كردنەوە كە بیانبینم لە مزگەوت، كاوە نەبێت هەموویان وتیان باشە دێین بۆ مزگەوت، لێم پرسی بۆ نایتە مزگەوت؟

كاوە: لەشــم پیسە، نایەم بۆ مزگەوت.

لەبەرخاتری كاوە من و سێ هاوڕێكەی ترم چووین بۆ پاركێك لەوێ دانیشتین.

داوای هاوكاری و یارمەتیم كرد كەلە كێشەی ئەم سیامەندە ڕزگارم بێت و بزانم بۆچی دەیەوێت سیحر یاخود من ناشیرین بكات و سكانداڵ (ئابڕووچوون)م بۆ دروست بكات.

هەموویان ئامادەییان دەربڕی بۆ هاوکاری، بەڵام پلانمان هیچ پێ نەبوو، نە من نە ئەوانی تر لەوکاتەدا هیچ بەخەیاڵماندا نەدەهات، بەڵام هەموو لەسەر ئەوە کۆك بووین کە تۆڵە لە سیامەند بکەینەوە.

یەکترمان بەجێ هێشت من بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە لەدڵی خۆمدا دەموت چی بکەم باشە، خوایە هاوکارم بە، فریام بکەوە لەدەستی ئەم شەیتانانە ڕزگارم بکە.

لەم قسەو باس و هاتوچۆیەدا بوم لەگەڵ خۆم چیمەن، یاخود کرۆنیکا تەلەفۆنی بۆکردم.

کرۆنیکا: ماکوان چۆنی؟

ماکوان: سوپاس بۆخوا زۆر باشم!

کرۆنیکا: چی بوو بە قسەی من ڕازی نەبوویت بۆ لەڕێگای سیامەندەوە ئەو کارەم لەگەڵ دەکەیت، من خۆم ڕازی بووم بەوەی لەگەڵم بخەویت.

ماکوان: ئەوە باسی چی دەکەیت، کێ وتوویەتی من لەگەڵت دەخەوم، جا من چۆن کاری قێزەونی وا دەکەم، کێ ئەم بێجاییەی کردووە؟

کرۆنیکا: تۆزێک بەر لە ئێستا سیامەند پەیوەندي پێوە کردم، وتی ماکوان داوای کردوویت لەگەڵی بخەویت، منیش وتم ماکوان کاری واناکات، لەوەڵامدا وتی ماکوان خۆی وتوویەتی.

ماکوان: وەکو خۆت دەڵێیت، من ئەگەر لەو کارانەم بکردایە خۆت باش دەزانیت لە تۆ ئاسانتر نەبوو بۆ ئەو کارە، تۆ خۆت ڕازیت ئیتر بۆ بە خوێڕی

وا دەڵێم. درۆ دەکات من تەنها وتم ئەو سۆزانییە لەگەڵ خۆت بهێنە کە هاتیت بۆلام.

کرۆنیکا: زۆر بە ڕێزەوە باسی کردیت، بەڵام تۆ ئەو کەسەی کە باوەڕت پێیەتی (مەبەستی خوای گەورە بوو) پێم مەڵێ سۆزانی، پێم ناخۆشە.

ماکوان: هەستم کرد بریندارم کردووە بەو قسەیە، زۆر کاریگەری لەسەر دروست کردبوو، بەڵام من زۆر پەشیمان بووم لەوەی کە وتم، هیچم نەوت و داوای لێبووردنیشم لێ نەکرد، لەسەر باسەکە ڕۆشتم و باسەکەم گۆڕی لەگەڵیدا، وتم کچی خۆم کە هاتی هەرچیم وت بە سیامەند تۆ تەداخول مەکە و بێ دەنگ بە.

کەوتم کچی خۆم دایە قاقای پێکەنین وتی باشە باوکە ماکوان، من ئەو کات تەمەنم ٣٨ ساڵ بوو، ئەویش ٣٢ ساڵ بوو، بۆوەی زۆرمان فەرق نەبوو، بۆیە وەکو کچ و باوك بەیەکمان نەدەخوارد. بەقسەی زل و سەرسەرییەکەی خۆیەوە کاتمان بەسەر برد تا گەیشتمە بەردەرگای ماڵەوە تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

کە چوومە باخەکەی خۆمان یەکێك لە جنۆکە هاوڕێکانم هات بۆلام بەناوی (کازۆل).

کازۆل بەعەرەبی قسەی دەکرد و کوردی نەدەزانی، وتی ئەبو ثاناء لەلایەن جەماعەتەوە هاتووم بۆ لات، زۆر سەلامیان لی دەکردی، شێخ بەرقان دەیوت ئەگەر سێ مانگ خۆی دووربخاتەوە لە کۆنتراکتی نێوان خۆی و وەرماش ئێمە لەوەرزی پاییز دا واتا ناوەڕاستی پاییز خۆمان دەگەیەنینەوە ماکوان.

ماکوان: ئەی ئێستا لەکوێیە، بۆچی سێ مانگی تر؟ من لەهیچ تێناگەم.

کازۆل: ئەوە شێخ بەرقان خۆی بۆت باس دەکات، میا و سەسیل لەم دەوروبەرەدان سڵاویان بۆت هەیە، دەیانوت ئەتۆمەکەی ئەوەندەی ئەتۆمێك بەهێز بوو بۆ وەرماش.

ماکوان: ئاخر پێیان بڵێ وانابێت، بۆچی خۆیان ئاشکرا ناکەن و منیان لەناو جیهانی خۆیان بەجێ هێشتووم.

کازۆل: باسی ئەوەمان کرد کە هەڵەیەکی زۆر گەورەیان کردووە لەسەرەتاوە خۆیان ناساندووە، پاش ئەوەش کە خۆیان بەتۆ ناساندووە باسی ژیان و جۆری ژیانی جنۆکەکانیان بۆ تۆ نەکردووە، تۆ وەك خۆتان تەماشای ئێمە دەکەیت، بەڵام ژیان و گوزەرانی ئێمە زۆر جیاوازە.

ماکوان: بەڕاستی من هیچ شارەزاییم نییە، مەگەر ئەوەی لەدەمی خۆتانەوە زانیبێتم جا لەبەر ئەوە کازۆل؛ ئەگەر دەکرێت هەمیشە هەواڵی ئەوانم بۆ بهێنە.

کازۆل: من بەردەوام لەگەڵت دەبم، بەڵام شەوانێك کە مانگ پڕە واتا لە ٨-٢٢ی مانگی عەرەبی من ناتوانم بە شەو دەربکەوم، بە ڕۆژیش دەتوانم لە مزگەوت یان لەماڵی خۆت کە ئەو ڕۆژەی سوڕەتی (البقرة) دەخوێنیت بێم بتبینم.

ماکوان: ئەم کاتەی کە باست کرد سەیرە بەلامەوە کازۆل ئەم حساباتی مانگە چییە؟

کازۆل: شەوانی مانگەشەو هەموو جنۆکەی کافر لەدەرەوەن و سەما و گۆرانی و چالاکی خۆیان هەیە، بەمانگە شەو زۆر دڵ خۆشن، سوڕەتی

(البقرة)ش بخوێنیت تا سێ ڕۆژ هیچ جنۆکەیەکی کافر نزیك ماڵەکەت ناکەوێتەوە. ئەم بەیانییە سوڕەتی (البقرة) ت تەواو کرد بە دوو ڕۆژ وابوو؟

ماکوان: بەڵێ، وابوو.

کازۆل: لات سەیر نەبێت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە خاتوو عائیشە دایکی ئیمانداران فەرموو: شەوێکی مانگە شەو بوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی ڕاکێشا بۆ مانگی چواردە و فەرمووی عائیشە پەنا بەخوا لەو مانگە!!

ماکوان: ڕاست دەفەرمووی وەڵڵاهی ئێمەی کورد زۆرترین شیعر بۆ مانگ دەنووسین!

کازۆل: ئاخر من لەبەر ئەوەی خۆری کوردستان سووتێنەرە، بەڵام ئەوروپییەکان یان سکەندەناڤییەکان بەگشتی چوونکە خۆریان کەمە، ئەوان شیعر بۆ خۆر و ڕۆژ دەنووسن.

ماکوان: وەڵڵاهی ڕاست دەفەرمویت، قسەکانی سەرنجی ڕاکێشام، خۆشەویستی چووە ناو دڵم زۆر جنۆکەیەکی بەهێز و خاوەن کەسایەتییەکی تایبەت بە خۆی بوو، هەستم کرد زانیاری پێیە.

کازۆل: من بەجێت دەهێڵم بەڵام هیچ کەس لە هاوڕێکانت تا سێ مانگی تر نابینیتەوە، بەو مەرجەی ئەگەر هیچ کۆنتراکتێک لەگەڵ وەرماش نەکەیت، دوای ئەو کاتە دێینەوە بۆلات، بە پشتیوانی خوا.

ماکوان: ئەی جەنابت؟!

کازۆل: وەکو پێم وتی من دێم بۆ لات، بەڵام ئاگاداری کاتەکانی من بە بزانە کەی دەتوانم بتبینم، زیاتر لەمزگەوت یەکتر ببینین باشترە دوای نوێژی عەسر، نێوانی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر.

ماکوان: زۆر خۆشحاڵ دەبم، جزاك الله خيرا.

کازۆل: السلام عليكم و رحمة الله و بركاته.

ماکوان: وعليكم السلام و رحمة الله و بركاته.

ماوەی چەند ڕۆژێك مامەوە هیچ دەنگێك نەبوو، نەلە تەرەفی جنۆکەکان، نەسیامەند و نەکرۆنیکاش، منیش خۆم بێزار بووم تەنانەت نەدەچووم بۆکاریش.

ئێوارەیەك کرۆنیکا تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی پێویستە بتبینم!

ماکوان: ببوورە مەجالم نییە و زۆر بێکاتم، لەڕاستیدا واش نەبوو، نازانم منیش زۆر حەزم بەبینینی کرۆنیکا دەکرد، ئەو چەند ڕۆژەش هەر لە خەیاڵمدا بوو، لەبەرچاوم ون نەدەبوو.

کرۆنیکا: ئەگەر ڕازیش نابیت، دێم بۆماڵتان!

ماکوان: وتم ئاساییە، جا کەهاتی لەماڵ بووم بەخێر بێیت، بەڵام ئەم ماوەیە زۆر سەرقاڵم بیخە کاتێکی کە.

کرۆنیکا: تەنها یەك سەعات دەمەوێت بتبینم، قسەی زۆرم پێیە بۆت.

ماکوان: بە تەلەفۆن قسەم بۆ بکە.

کرۆنیکا: بەتەلەفۆن نابێت، دەبێت خۆت ببینم.

ماکوان: باشە بەزوویی ئاگادارت دەکەمەوە کەی یەکتر ببینین.

## ونبوون لەناو کرۆنیکادا

دەڵێن پیاو بە چاو عاشق دەبێت ژنیش بە دڵ، بەڵام من سەر لەخۆم دەرناکەم هەندێك جار دڵم عاشق دەبێت هەندێك جاریش چاوم.

لەناو ئەم هەموو جەنجاڵی جنۆکە و سەرقاڵی ژیانەدا هەستێکی زۆر نامۆم هەبوو بۆ کرۆنیکا!

نازانم جوانییەکەی، ناسکی و لەشوولاری زۆر وروژێنەر بوو، لەبەرچاوم ون نەدەبوو. زۆرجار دەموت توخوا شەرم ناکەیت لەخۆت ماکوان کە دڵت بۆ ئەو ئافرەتە لێ دەدات، لەکاتێکدا خۆت خاوەنی ژن و ماڵ ومندالی. شەیتان دەهات و دەیوت خۆ کەس نەیوتوە بیهێنە و بیکەرە خێزانت، تەنها حەز و ئارەزووی خۆتی پێ بەتاڵ بکەوە کێ دەزانێت؟

لەدوای چەند جار وتنی (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) ئارام دەبوومەوە و فێنکایی ئیمان دەهاتەوە بە گیانمدا.

زۆری پێنەدەچوو خەیاڵی کرۆنیکا دەهاتەوە ماچێکی دەکردم و دەڕۆشت، کەسێك دەیچپاند بە گوێمدا دەیوت ئاخر کام مرۆڤ هەیە ئەو ناسک و نازدارە لەدەست خۆی بدات، بەپێی خۆی هاتووە لە پەریی دەریا دەچێت، تەماشای پێکەنینەکەی بکە، چەند جوانە خەندە و چاو و ڕوومەت و لێوی. کە دەڕوات دەڵیی ئەسپی عەرەبییە، گوێ لەو دەنگە بگرە و سەیری پێستی بکە چەندە جوانە.

جارێکی تر و چەند جارێک دەموتەوە (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) ئاخر ماکوان شەرم بکە لەخۆت شووێن ئافرەتێکی سۆزانی دەکەویت و ئاوا کاریگەری لەسەر دڵت داناوە، ئەمە هەموو ئیمان و خواناسی و عارفی و پاکییت بوو؟ کوا وەرع و بەندایەتیت؟

دیسان هێور دەبوومەوە و دەهاتمە سەرخۆ، بەڵام لەپڕ کەسێکی تر دەیچپاند بە مێشك و دڵم دا و دەیوت، ئاخر ماکوان ئەوە کێ هەیە لەم دنیایەدا وا پاك و فریشتە ئاسا؟ هەموو کەس هەڵە دەکات، خۆ ئەویش مرۆڤە لەوانەیە هۆکار هەبێت بۆیە وا گلاوم لەم هەموو تاوانەوە.

زوو زوو دەپارامەوە لە خوای پەروەردگار، دەموت خوایە گیان ڕزگارم بکە لەدەستی، خۆ ئاگات لێیە چۆن گیرم خواردووە بەدەسبت خۆمەوە، هەموو خەڵکی گیرۆدەی کێشەیەکە لەخۆی بەدەر، من کێشەم خۆمە. خوایە گیان ڕزگارم بکە لەدەست خۆم!.

بەیانییەك بەرەو کار دەچووم نزیکی هەفتەیەك بوو لە پەیوەندییەکەی کرۆنیکا تێپەڕیبوو، من هەر لەهەوڵی ئەوەدا بووم لە بیری خۆمی بەرمەوە، بەلام لەبیرم نەدەچوو تەنانەت لە بەرچاوم ون نەدەبوو.

ئەمجارە من گلاراوم گرتوو تەلەفۆنم بۆ کرد، بەیانی زوو بوو نزیکی کاتژمێر ٨:٣٠ی بەیانی بوو، دوای چۆنی و چاکی، دیاربوو لە خەو خەبەرم کردبووە بە تەلەفۆنەکە ماندوو دیاربوو، وتی ماکوان پاش کەمێکی کە خۆم پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە، لە ژوورەکەی دایکم خەوتووم با خەبەری نەبێتەوە.

ماکوان: باشە فەرموو ئیسراحەتی خۆت وەربگرە.

من چوومە سەرکار کاتژمێر بوو بە دە تەلەفۆنی نەکردەوە، بوو بە یانزە هەر دەنگ نەبوو، ئەوەندە تەلەفۆنەکەم دەرهێنابوو سەیری کاتژمێرەکەم دەکرد خۆم لە حاڵی خۆم تەریق دەبوومەوە، بە خۆمم دەوت بۆ وا ئارامت لێبڕاوە، شەرم بکە لە ڕیش و ناوەکەت.

کاتژمێر دووی نیوەڕۆ بوو تەلەفۆنی کرد، منیش زۆر بە لووتبەرزی و خۆبەزل زانییەکەوە وتم ئێستا خەبەرت بوویەوە، شەو ماندوویان کردوویت.

بەدەنگێکی نەرم و ناسك وتی: نا، دایکم هێناوە بۆ نەخۆشخانە، زۆر ناساغە. بەقوربانت بم ماکوان گیان تۆ کەسێکی پاکی، دوعای خێر بۆ دایکم بکە با چاك بێتەوە، بەخوا زۆر بێکەسم.

ماکوان: لەکام نەخۆشخانەی؟

کرۆنیکا: لە نەخۆشخانەی شارەکەی خۆمانم.

ماکوان: تەلەفۆنەکەت با کراوە بێت، پاش کەمێکی تر دەکەومە ڕێ بۆلات.

کەوام وت هەستم بە دڵخۆشی کرد لە دەنگیدا.

کرۆنیکا: وەی بەساقەت بم ماکوان گیان بەڕاستە؟

ماکوان: بەڵێ، جارێ نیو کاتژمێرم ماوە لەکارەکم، دوای ئەوە دەکەومە ڕێ.

کە بیرم کردەوە کە وتی ماکوان تۆ کەسێکی باش و پاکیت، دەستم کرد بە گریان و زۆر شەرمم لە خوای خۆم کرد، سوپاسی خوای گەورەم کرد بەو ئیسلامەی پێی بەخشیوم، قسەکەی کرۆنیکا دیسانەوە ئیمانی لەخەو

هەڵساندمەوە، بەڵام ئەم جارە سۆفێیانە کەوتمە ڕێ بۆلای کرۆنیکا بە ئومێدی هیدایەت و هاوکاری خێر و چاکە نییەتم دامەزراو کرد و کەوتمە ڕێ.

گەیشتمە ناو نەخۆشخانەکە و گوڵێکم کڕی لەنزیك پرسگە تەلەفۆنم بۆ کرد هات، کە بینیم هەموو گیانی لە خۆشیاندا پێدەکەنی.

سڵاوم لێکرد و پرسیم: دایکی بەڕێزتان چۆنە؟

کرۆنیکا سەری خستە سەرشانم و دەستی کرد بە گریان و وتی: تەندروستی زۆر خراپە، نازانم چی بکەم.

دووجار کۆکیم وەك ئەوەی پێی بڵێم کە خۆی دووربخاتەوە لەمن، من تەوقەم لەگەڵ نەکردوویت، وا سەرت خستۆتە سەرشانم و ڕوومەتت ناوە بە گەردنی ملمەوە!

کرۆنیکا: بووره ماکوان گیان بەخوا ئۆتۆماتیکی بوو.

ماکوان: ئەزانم بەس وامەکە، با بڕۆین بۆلای دایکت.

کە چوومە ژوورەوە بینیم دایکی ئۆکسجینی بۆ دانرابوو، منیش لەبەر خوای پەروەردگار دەستم کرد بە قورئان خوێندن، چەند ئایەتێکی سوڕەتی (الطور)م خوێند، دایکی چاوی بەرزکردەوە و بەچاو ئیشارەتی کرد کە بەردەوام بم.

لەو کاتەدا کە چاوی بەرز کردەوە کرۆنیکا لە خۆشیا قیژاندی و هاواری کرد وتی: وەی بەساقەت بم ماکوان.

دوکتۆر و پەرەستارەکان هاتنە ژوورەوە، لایان سەیر بوو.

کرۆنیکا بەو پەڕی هێز و توانا و قوەتەوە هاواری کرد کە ئەوە ماکوان قورئانی بەرسەردا خوێند، ببینن کە دایکم هۆشی هاتەوە، زوو زووش دەیوت وەی بەقوربانت بم ماکوان گیان.

ماکوان: ئەرێ بەسە ئەم هەموو بەقوربان و بەساقەیە چییە.

چوومە لای دایکی ناوی فاتمە خان بوو، لێم پرسی: چۆنی فاتمە خان، باشی دایکی من؟

فاتمە: چۆنی باوکەکەم، تۆ کێیت؟

ماکوان: من برای چیمەنی کچتم و کوڕی جەنابتم، ناوم ماکوان-ە.

فاتمە: یاخوا بێوەی بیت ماکوان کوڕە جوانەکەم.

کرۆنیکا: دایەگیان باشی شووکر؟ بەیانی زۆر ناڕەحەت بوویت، ئێستا باشی؟

فاتمە: وەڵڵا چیمەن گیان، لە خەومدا لەسەر حەوزێك بووم، ئەموویست ئاوی لێ بخۆمەوە، بەڵام کە ئاوەکەم بە مشت هەڵدەگرت بۆ ئەوەی بیخۆمەوە لە دەستم دەبوو بەخوێن، زۆر تینووم بوو، زۆر بەدوای ئاودا گەڕام، وەك بڵێی ئاو و زۆر بوو لە چواردەورم، بەڵام کە من ئەمویست بیخۆمەوە هەمووی دەبوو بە خوێن، تا کەسێك بانگی کردم وتی وەرە ئێرە ئاوەکەی سازگارە، چوومە سەر حەوزەکە و تێروپڕ ئاوم خواردەوە. ئەوەندە ئاوەکەی فێنك و خۆش بوو تینوێتیم نەدەشکا لە تاواندا خۆم فڕێ دایە ناو حەوزەکە، کە چاوم کردەوە ئەم کاکەیە قورئانی بەسەردا دەخوێندم، ڕۆڵە

خوا لە دایکت نەسێنێت، ڕەحمەت لەو دایك و باوکەی تۆیان پەروەردە کرد.

منیش سوپاسم کرد و وتم: من ئیتر دەڕۆم ئەگەر کارێکتان نییە.

لەماڵئاوایدا بووم لەگەڵیان، پەرستارێك هاتە ژوورەوە پێی وتن کەوا تەندروستی جێگیرە و ئەتوانن بڕۆنەوە بۆماڵەوە.

کرۆنیکا: ماکوان هەرگیز چاکەت لەبیر ناکەم، فەرموو بڕۆ با کات دڕەنگ نەبێت بۆ تۆ، منیش دایکم دەبەمەوە ماڵەوە، دوایی قسە دەکەینەوە.

ماڵئاوایم کرد و ئەوانیش لەگەڵ من هاتنە دەرەوە، کەمێك دوور بووم لێیان گوێم لێ بوو بە دایکی وت، لێرە بووەستە ئێستا ئەچم داوا دەکەم کە تەکسیمان بۆ بگرن.

کە گوێم لێ بوو گەڕامەوە وتم: ئەی خۆت سەیارەت پێ نییە؟

کرۆنیکا: نا، بە ئەمبولانس هاتین.

پێم وتن کەوایە من ئەتانبەمەوە.

کرۆنیکا: نا پێویست ناکات، تۆ لەکارەوە هاتوویت بڕۆ ماڵەوە پشووو بدە.

ماکوان: ئەزانم حەزیش دەکەیت، ئامادە بن تا من دەچم سەیارەکە دەهێنمە بەردەم دەرگای نەخۆشخانەکە.

کرۆنیکا: ئەرێ وەڵڵا زۆریشمان پێ خۆشە.

ئەوانم بردەوە بۆ ماڵەوە، كە گەیشتن داوایان كرد لەگەڵیان بچمە ژوورەوە، بەڵام سوپاسم كردن و نەچووم، وتم پێیان بوورن ماندووم و ماڵومنداڵیش چاوەڕێمن تا من نەگەڕێمەوە نان ناخۆن.

بەجێم هێشتن، بەڵام دایكی زۆر دوعای خێری بۆ كردم و خۆشەویستی دەربڕی، هەر ئەیوت بەخوا ڕۆڵە بەقەدەر ئاوات-ی كوڕم خۆشەویستی.

گەڕامەوە ماڵەوە، بەردەوام بووم لە كاروباوی ڕۆژانەم، لە كەمینی مردن دا دەژیان، بێزار بووم لەو واقیعەی تێیدا دەژیام، لە ترس و دڵەڕاوكێیەكی زۆردا بووم، زیاتر هۆكارەكەی ئەوەبوو كە حەزقیل و شێخ بەرقان و هاوڕێ جنۆكەكانم لێم دوور بوون.

ئێوارەیەك لەدوای نوێژی عەسر لە مزگەوت مامەوە، بەهیوای ئەوەی كازۆڵ بێت، سەرقاڵ بووم بە خوێندنی سورەتی الأعراف، لە پڕ قڕەی دەنگی جنۆكەكان هات، ئەوەندەم زانی میا، سەسیل و كازۆڵ پەیا بوون.

دوای چۆنی چاكی و هەواڵپرسین سەسیل وتی: شێخ بەرقان سەلامی لێدەكردیت و دەیوت بە ماكوان بلێن ئەو حاڵ و گوزەرانەی بەسەریدا هات لەناو كەشتییەكەی ئەڵمانیا دووبارەی نەكاتەوە.

ماكوان: مەبەستی كرۆنیكایە؟!

سەسیل: بەڵێ، ئاگادارین كە زۆر كاریگەری لەسەر داناویت و كازۆڵ بۆی باسكردوویت، جا تكایە ئاگات لە خۆت بێت.

كازۆڵ: ئاگادار بە لە ئێستادا وەرماش هیچ خاڵێكی لاوازی تۆی لانییە، بەدوای هەلێكدا دەگەڕێت بۆ زانیاریت هەلێكی دەست بكەویت، دڵنیا

بە دەستت لێ ناپارێزێت و زۆر بێڕەحمانە مامەڵەت لەگەڵ دەکات، چوونکە دڵنیابە زۆر ڕقی لێتە.

ماکوان: چیم لێ دەکات، ئەوپەڕی هەوڵی کوشتنم دەدات.

میا: ئاستەمە بیر لە کوشتنت بکەنەوە، ئەگەر کەسێکیش بیەوێت بتکوژێت ئەوا ناهێڵن و ئاگادارت دەکەنەوە، ئەوان هەموو ئاواتیان ئەوەیە کە تۆ کاریان لەگەڵ بکەیت.

ماکوان: من نازانم ئەم چاو فۆکسە چییە لەسەر من دانراوە کاریگەری ئەوتۆم لە چییدا هەیە وا ئەوان منیان مەبەستە.

کازۆڵ: ئەوان بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن کە ناسراو بێت، پاشان زوو تێبگات و بۆ پارە هەموو شتێك بکات، توانای قسەکردنی هەبێت و خەڵکی گوێی بۆ بگرێت، کاریزمای هەبێت.

ماکوان: جا من ئەوانەم تێدایە؟

کازۆڵ: بەڵێ ئەوەندەی من بزانم و ئەم ماوەیەی کە تۆم ناسیووە، هەموو ئەوەی باسم کرد لە تۆدا هەیە تەنانەت ئەوان گیریان بەدەست ئەوەوە خواردووە کە تۆ بۆ پارە و ماڵ و سامان کار ناکەیت، لە هەمووی گرنگتر سوپاس بۆ خوا ترسی خوا لە دڵتدایە (نحسبك كذلك).

ماکوان: خوای گەورە زیاتر هیدایەتمان بدات و ڕوناکی ئیمان و خواناسی زیاتر و زیاتر بچەسپێنێت لە دڵ و دەروونماندا.

کازۆڵ: ئاگاداری ئەوەبە وەرماش، سەرپەرشتیاری خانەوادە و خێزانە ساحیرەکانە.

ماکوان: خێزانی ساحیر؟!

کازۆڵ: بەڵێ، لە ئێستادا خانەوادە و خێزانەکان بەگشتی ئەو کارە ئەنجام دەدەن لە باوکەوە بۆ کوڕ و برا و دایك و کچ.. هتد.

ماکوان: ئەمە بۆ من نوێ بوو، وام دەزانی ساحیرەکان تەنها بەدوای خانەوادەوە نین.

کازۆڵ: بڕوا بکە ئەبو ئاناء، تەنانەت ئێستا لەهەموو شتێکدا جادوو و تەلیسم و شەیتان و جنۆکەی خوانەناس دەستیان هەیە لە چێشتخانە بەناوبانگەکانیشدا لە لاس ڤێگاس لە قومار بەکاردەهێنرێت، لە بۆرسە و بانقەکان لە دادگا و تەنانەت لە وەزارەت و حکومەت و سیاسەتی نیودەوڵەتیشدا.

ماکوان: کازۆڵ، برا یەکجار وا مەمانترسێنە.

میا: قسەکانی کازۆڵ ڕاستە، تەنانەت خێزانە جادووبازەکان لەناو خۆیاندا شەڕ بۆ دەسەڵات دەکەن.

کازۆڵ: باسی چەند خێزانێکت بۆ دەکەم، هەر بۆ زانیاریت، لەشاری پاریس لە وڵاتی فڕەنسادا پۆلیس خانەوادەیەکی ساحیری دەستگیر کرد، کە زیاد لە ٦٠ منداڵیان ڕفاندبوو، کردبوونیان بە قوربانی بۆ شەیتانەکان.

ماکوان: ئەی چۆن پێیان زانین؟

کازۆڵ: ئەم خێزانە لە باوباپیرانیانەوە ساحیر و جادووباز بوون، باپیرە گەورەیان یەکێك بووە لە قەشە و کاردیناڵ ناسراوەکانی پاریس، سیحریان لەوەوە بۆ ماوەتەوە، پاشان کوڕ و کچەکانیان لەلایەن شەیتانەکانەوە

داوای ئەوەیان لێ كراوە كە هەر منداڵێكیان بینی بەتەنها بوو بیدزن و بیبەنە دەرەوەی شاری پاریس خانوویەكی بچووكیان كڕیووە، هەموو منداڵەكانیان لەوێ داناوە و هەموو جارێك ١٠-١٢ منداڵیان سەربڕیوە بۆ شەیتانەكان تاوەكو پۆلیسی فڕەنسا لە ڕێگای (دی ئێن ئەی) تاوانەكانیانی دۆزیوەتەوە كە نزیكی شەش مانگی پێچوو.

لەدوای ئەوەی دەستگیركران لەبەر ئەوەی خانەوادەكە ناودار بوون نەیانهێشت هیچ میدیایەك باسی بكات، دوای چەند ساڵێك كوڕ و كچی ئەو خانەوادەیە سەفەریان پێ كرا بۆ ئەمەریكا، كاتێك لەوێ زانرا كێن دەركران، دوای ئەوە بەرەو ئەمەریكای لاتین ڕۆیشتن و ئێستا لەوێ دەژین، كەس ناونیشانیان نازانێت.

ماكوان: ئەی ئەمانە باپیرەیان كاردیناڵ بووە چۆن بووە بە ساحیر؟

كازۆڵ: ئەی نازانیت زۆربەی ساحیرەكان، قەشە و كاردیناڵەكانن؟!

ماكوان: دەمزانی ساحیریان هەیە، بەڵام نەمزانیبوو بەو ئەندازەیە زۆرن.

كازۆڵ: یەك پێوەرت دەدەمێ كە بزانیت، چۆن قەشە و كاردیناڵ یان قەسیسە (سەنت)ە ئافرەتەكانیان دەناسیت كە ساحیرن.

ماكوان: وەڵڵا مەمنون دەبم، تۆ دەزانیت ئێمە لەم ولاتانە دەژین، ڕاستە ڕێمان تێناكەوێت سوپاس بۆ خوا، بەڵام هەر بزانم باشە.

كازۆڵ: ئەو قەشە و كاردیناڵانە دوو جۆرن، یاخود هیچ پلەیەكی كڵێساییان نییە، بەڵام زۆریان زوو تێدەگەن لە ئینجیل، ئیتر شەیتانەكان دەیانكەنە ساحیر.

سەسیل: داوای ئیزن دەكەم كازۆڵی برام، با من بۆی ڕوون بكەمەوە، باشتر تێدەگات و زوتر بیرۆكەكە دەگات. ماكوان بیرتە كاتێك من بێدین بووم، هاتمە لات لەسەر ئەم شێوەیە كە خۆم كرد بە فریشتە و كەرامات بۆ تۆ؟!

ماكوان بە پێكەنینەوە: بەڵێ باشم بیرە، ئەوكات لەدڵی خۆمدا سوپاسی خوام كرد كە من لە پیاوچاكانم و بووم بە خاوەن كەرامات.

سەسیل: ئەویش پێدەكەنی، هاوشێوەی ئەو كارەی منە، چوونكە هەموو جنۆكەكان، مەبەستم كافرەكانە بەیەك شێوە كار دەكەن.

ماكوان: باشە بەڵام چۆن دەچنە لای مەسیحییەكان؟

سەسیل: هەروەكو من چۆن هاتم بۆلای تۆ، ئاوا شەیتانیش دەچێت بۆلای قەشەیەك یان كاردینالێك دەڵێت من عیسام تۆم هەڵبژاردووە، ڕۆحی پیرۆز دەخەمە ناو لاشەتەوە.

كازۆڵ: لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە تەنها ناچنە لاشەی ئەوان، بەڵكو دەچنە لاشەی ئەوانەش كە بڕوایەكی كەمیان هەیە بە مەسیحییەت، كەخۆیان ئاشكرا دەكەن ئیتر ئەو كەسانە دەبنە كەسێكی زۆر پابەند بە ئایینەكەوە، زۆرجار وەكو (سێباستیان) لە سوید هەموو ژیانی لە خراپە و دەرمان فرۆیشتن و كاری قێزەون بەسەر دەبات، كەچی لەم دواییەدا خۆی نەخۆش چاك دەكاتەوە.

ماكوان: من سەرم لە شتێك دەرناچێت، بۆ ئەوانەی كە پابەند دەبن بە مەسیحییەت خێرا دەڵێن نەخۆش چاك دەكەین و كوێر و شەل.. هتد چارەسەر دەكەن، هەندێكیشیان بە ڕاستی دەیكەن، چەندیشم دیووە لە كەناڵەكانی ڕاگەیاندن و تۆڕەكۆمەڵایەتییەكان.

کازۆڵ: ڕاستە ئەوە هەموو سیحر و جادووی شەیتانەکانە، هەموو ئینجیل لە ئێستادا ناچێتە ٣٠ لاپەڕە، ئەوان دەڵێن هەمووی بەهێزی عیسا و ئینجیل ئەو کارە دەکەین، بەڵام بەڕاستی هەموو فرت و فێڵە.

ماکوان: بەڵام ئەو کەسانە بەڕاستی چارەسەر دەبن؟!

کازۆڵ: بەشی زۆری وەکو خۆی لێدێتەوە کە ماوەی سیحرەکە بەسەر دەچێت، یان سیحرەکە کۆتایی دێت، یاخود ئەو جنۆکانەی هاوکاریان دەکەن دەمرن یان دەڕۆن، کە دەچنەوە بۆلای ساحیرەکە زیاتر ئەم قسە بەکار دەهێنن دەڵێن پابەند نەبوویت و تاوانت کردووە، خۆ ئەگەر بڵێت تاوانم نەکردووە، پێی دەڵێن کەوابێ کەسێکی تر کردوویەتی و تۆش بەشدار بوویت، ئەگەر ئەوەش نەبێت ئەوا دەڵێن کەواتە ئیمانت لاوازە بە عیسا.

ماکوان: ئەی ئەوانەی کە چاك دەبنەوە بەڕاستی ئەی ئەوە چییە؟

سەسیل: بڕوا بکە لە ٨٠٪ ی مەسیحییەکان خەریکی ئەو کارەن و هەموو گیرۆدەی ئەو جادووە بوون بەدەست ئەم جنۆکە خوانەناسانەوە.

ماکوان: من سەرم لە شتێکی ئێوە دەرناچێت، باشە شەیتانە کافرەکان بەهێزی قورئان ڕادەکەن لە موسوڵمانان دەترسن کە زیکر دەکەن یان قورئان دەخوینن یاخود نوێژ دەکەن ناتوانن بێن بەلایاندا، باشە ئەم شەیتان و عفریت و ناوانەی ناو ئێوە، باشە ئەمە بۆخۆی بەس نییە بۆ بڕوا هێنان بە ئیسلام؟

کازۆڵ: پرسیارێکی زیرەکانەیە لە تۆوە، بەڵام جیهانی ئێمە وەکو جیهانی ئێوە نییە، تۆ ناتوانیت وەکو ئێمەی جنۆکە بیربکەیتەوە، من هەندێکت بۆ

باس دەکەم تا تێبگەیت، ئەویش زۆرینەی جنۆکە جاهیلن، پاشان ئێمە زۆر لە مرۆڤ زیاترین، ئەوانەی کە دەبنە خاوەنی ژیری و ئەقڵ وریا دەبن، زۆر زوو موسوڵمان دەبن و سوپاسی خوا و موسوڵمانان دەکەن.

ماکوان: واتا وەرماش جاهیلە یان ویرسان جاهیلە، من پێم وایە زۆر وریا و زیرەک و لێهاتوون.

کازۆڵ: بەدڵنیاییەوە خەڵکی وریا و زیرەکیان هەیە، من لێرە باسی گشتی دەکەم، لەناو بێدین و خوانەناسەکاندا، جنۆکەی وریا و لێزان و خاوەن پلانیان هەیە، هەروەکو ئێوەی مرۆڤ چەند پرۆفیسۆر و زانا و خاوەن توانا هەیە، تەنانەت بڕوای بە وجودی خواش نییە.

جنۆکە شەیتانەکانیش وان، هەندێکیان بۆ سروشتی دەگەڕێننەوە، هەندێکیان دەزانن حەقە، بەڵام دەسەڵات و خۆشیی ژیان کوێری کردوون، هەندێکیان بەخەستی هەڵخڵەتێنراون ئیتر ژیان لە نێوان ئێمە و ئێوەدا بەو شێوەیە یان چاك یان خراپ، جا لەکۆتایی بۆ بەهەشتە یان دۆزەخ.

ماکوان: ڕاستە بەڵام بەڵگە لای ئێوە بەهێزتر هەیە بۆ ئیمان و ئیسلام.

کازۆڵ: ڕاستە، بەڵام جەهلی جنۆکە زۆر خەستە، بەهەرحاڵ لەناو ئێمەش دا بزووتنەوەیەکی بانگەوازکار بۆ ئیسلام هەیە زۆر بەهێزە، دەزانی چەندین لە ئێمە ڕۆژانە دەگەڕێنەوە بۆ ئیسلام سوپاس بۆ خوا.

ماکوان: الحمد لله، باسەکەی خۆمان بیرنەچێتەوە، باسی خێزانە ساحیرەکانمان کرد، زیاتر زانیاریم بدەرێ لەو بارەیەوە؟

کازۆڵ: بەگشتی زۆرن ئەو خێزانانە، هەیانە لەناو دەسەڵات و سیاسەت دا بەهێزە، هەیە لە پارە و سەروەت و سامان دا، هەر خێزانە و جۆرێک لە

کازۆڵ: ڕاستە ئەوە هەموو سیحر و جادووی شەیتانەکانە، هەموو ئینجیل لە ئێستادا ناچێتە ٣٠ لاپەڕە، ئەوان دەڵێن هەمووی بەهێزی عیسا و ئینجیل ئەو کارە دەکەین، بەڵام بەڕاستی هەموو فرت و فێڵە.

ماکوان: بەڵام ئەو کەسانە بەڕاستی چارەسەر دەبن؟!

کازۆڵ: بەشی زۆری وەکو خۆی لێدێتەوە کە ماوەی سیحرەکە بەسەر دەچێت، یان سیحرەکە کۆتایی دێت، یاخود ئەو جنۆکانەی هاوکاریان دەکەن دەمرن یان دەڕۆن، کە دەچنەوە بۆلای ساحیرەکە زیاتر ئەم قسە بەکار دەهێنن دەڵێن پابەند نەبوویت و تاوانت کردووە، خۆ ئەگەر بڵێت تاوانم نەکردووە، پێی دەڵێن کەوابێ کەسێکی تر کردوویەتی و تۆش بەشدار بوویت، ئەگەر ئەوەش نەبێت ئەوا دەڵێن کەواتە ئیمانت لاوازە بە عیسا.

ماکوان: ئەی ئەوانەی کە چاك دەبنەوە بەڕاستی ئەی ئەوە چییە؟

سەسیل: بڕوا بکە لە ٨٠٪ ی مەسیحییەکان خەریکی ئەو کارەن و هەموو گیرۆدەی ئەو جادووە بوون بەدەست ئەم جنۆکە خوانەناسانەوە.

ماکوان: من سەرم لە شتێکی ئێوە دەرناچێت، باشە شەیتانە کافرەکان بەهێزی قورئان ڕادەکەن لە موسوڵمانان دەترسن کە زیکر دەکەن یان قورئان دەخوینن یاخود نوێژ دەکەن ناتوانن بێن بەلایاندا، باشە ئەم شەیتان و عفریت و ناوانەی ناو ئێوە، باشە ئەمە بۆخۆی بەس نییە بۆ بڕوا هێنان بە ئیسلام؟

کازۆڵ: پرسیارێکی زیرەکانەیە لە تۆوە، بەڵام جیهانی ئێمە وەکو جیهانی ئێوە نییە، تۆ ناتوانیت وەکو ئێمەی جنۆکە بیربکەیتەوە، من هەندێکت بۆ

باس دەکەم تا تێبگەیت، ئەویش زۆرینەی جنۆکە جاهیلن، پاشان ئێمە زۆر لە مرۆڤ زیاترین، ئەوانەی کە دەبنە خاوەنی ژیری و ئەقڵ وریا دەبن، زۆر زوو موسوڵمان دەبن و سوپاسی خوا و موسوڵمانان دەکەن.

ماکوان: واتا وەرماش جاهیلە یان ویرسان جاهیلە، من پێم وایە زۆر وریا و زیرەک و لێهاتوون.

کازۆڵ: بەدڵنیاییەوە خەڵکی وریا و زیرەکیان هەیە، من لێرە باسی گشتی دەکەم، لەناو بێدین و خوانەناسەکاندا، جنۆکەی وریا و لێزان و خاوەن پلانیان هەیە، هەروەکو ئێوەی مرۆڤ چەند پرۆفیسۆر و زانا و خاوەن توانا هەیە، تەنانەت بڕوای بە وجودی خواش نییە.

جنۆکە شەیتانەکانیش وان، هەندێکیان بۆ سروشتی دەگەڕێننەوە، هەندێکیان دەزانن حەقە، بەڵام دەسەڵات و خۆشیی ژیان کوێری کردوون، هەندێکیان بەخەستی هەڵخڵەتێنراون ئیتر ژیان لە نێوان ئێمە و ئێوەدا بەو شێوەیە یان چاك یان خراپ، جا لەکۆتایی بۆ بەهەشتە یان دۆزەخ.

ماکوان: ڕاستە بەڵام بەڵگە لای ئێوە بەهێزتر هەیە بۆ ئیمان و ئیسلام.

کازۆڵ: ڕاستە، بەڵام جەهلی جنۆکە زۆر خەستە، بەهەرحاڵ لەناو ئێمەش دا بزووتنەوەیەکی بانگەوازکار بۆ ئیسلام هەیە زۆر بەهێزە، دەزانی چەندین لە ئێمە ڕۆژانە دەگەڕێنەوە بۆ ئیسلام سوپاس بۆ خوا.

ماکوان: الحمد لله، باسەکەی خۆمان بیرنەچێتەوە، باسی خێزانە ساحیرەکانمان کرد، زیاتر زانیاریم بدەرێ لەو بارەیەوە؟

کازۆڵ: بەگشتی زۆرن ئەو خێزانانە، هەیانە لەناو دەسەڵات و سیاسەت دا بەهێزە، هەیە لە پارە و سەروەت و سامان دا، هەر خێزانە و جۆرێک لە

دەسەڵاتی دنیایی و ساحیری هەیە، بۆ زانیاریت هەر خێزانێك لە و خێزانە ساحیرانە نزێك بین لەیەکەوە و هەوڵی کوشتن و لەناوبردنی یەکتری ئەدەن.

ماکوان: وەڵام من وامزانی هاوکاری یەکتری دەکەن، بۆ یەکتر لەناو دەبەن، سەیرە!!

کازۆڵ: وەکو وتم جیهانی جنۆکە جیاوازە لە جیهانی مرۆڤ، لەوە گرنگتر دەبێت بزانیت کە جنۆکە شەیتانەکان، بە شووێن وێرانکاری لەسەر ئەم زەویە و خەڵکەکەیەوەن، ئەوان دەیانەوێت بیکەنە دۆزەخ.

ماکوان: ڕاستە دوژمنایەتییەکەیان زۆر کۆنە لەگەڵ مرۆڤ لە باوکە ئادەمەوە دەست پێدەکات.

میا: ئەوەی بۆی هاتبووین خەریکە لەبیرمان دەچیتەوە، پێویستە ماکوان ئاگاداری ئەوە بێت کە وەرماش ئەو هەموو ماوەیە بێ دەنگە بۆ ئەوەیە ماکوان هێور بکاتەوە هاوڕێیەتییەکی ئاسایی لەگەڵ ببەستێت، چوونکە کاتمان درەنگ کردووە ماکوان ئێمەش پێویستە بڕۆین.

ماکوان: سوپاس میا گیان، دانیشتنەکەمان خۆش بوو، زانیاری باشی تێدا بوو، بەڵام نەگەیشتمە ئەنجامێکی کۆنکرێتی.

کازۆڵ: من لە خزمەتام، هەرجارێکی تر یەکترمان بینی بەچڕ و سەختی باس و خواستی نوێت لەسەر ئەم جۆرە خێزانانە و سیحر و کەسایەتییە بەناو بانگەکانت بۆ دەکەم، بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

ماکوان: زۆرباشە، مۆبایلەکەم زەنگی لێدا تا دەستم کرد بە گیرفانمدا و دەرمهێنا و سەرقاڵ بووم بە دەرهێنانی مۆبایلەکەم ئەوان دیار نەمان، کە تەماشای ژمارەکەم کرد، کرۆنیکا بوو.

بەڵێ، فەرموو..

کرۆنیکا: ماکوان، چۆنی باشیت؟ دایکم دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات.

ماکوان: بابفەرموێت لە خزمەتیام.

فاتمە: ماکوان کوڕی خۆم، وەرە بۆ ماڵمان من دەعوەتت دەکەم بۆتان بۆ خواردن.

## گەیشتن بەیەك لەگەڵ سیامەند دا

فاتمە خان قسەی لەگەڵ کردم بەتەلەفۆن داوای لێکردم بچم بۆ مالیان.

پێم وت فاتمە خان بە دڵنیاییەوە دێمە خزمەتیان، بەڵام ئەم ماوەیە سەرقاڵم چەند ڕۆژ ئیجازەم بدە با کەمێك کاتم هەبێت بەسەرچاو دێمە خزمەتتان.

فاتمە: ماکوان کوڕم بیکە لەڕای خوا وەرە دڵم خەریکە ئەتەقێت، وەرە تۆزێ قورئانم بۆ بخوێنە، ئەگەر بێیت خێرت ئەگات.

ماکوان: بەسەرچاو خۆم ئاگادارت دەکەمەوە بەم نزیکانە دێمە خزمەتت وەعد بێت.

فاتمە: باشە باوکەکەم یاخوا مەحفوز بیت.

ماکوان: خوا ئاگادارت بێت.

بەڕاستی من دەترسام لە چوونم بۆ ماڵیان، بیرم لەوە دەکردەوە ماڵومناڵ ببەم لەگەڵ خۆم، بەڵام دەترسام دەمویست کرۆنیکا نە منداڵ و نە خێزانم نەناسن و نەیانبینێت ، چوونکە متمانەم پێی نەبوو. لەکۆتاییدا بیرم لەوە کردەوە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم بڕۆم، خۆم بەتەنها هەرگیز نەدەڕۆشتم، چوونکە کە سەسیل وتی ماڵەکەی کامێرای هەیە، ئەوەندەی تر خۆم بەدوور دەگرت لەوەی کە بەتەنهایش قسەی لەگەڵ بکەم.

خەیاڵم بۆ ئەوە دەچوو كە كرۆنیكا دایكی هان دابێت بۆ چوونی من بۆ ماڵیان لەڕێگای دایكییەوە من بانگ بكات و دەشمزانی دایكی بەڕاستگۆیی من بانگ دەكات وەكو كوڕی خۆی تەماشای من دەكات، چوونكە ئافرەتێكی بەتەمەن بوو، نزیك ٦٢-٦٥ ساڵ دەبوو.

سێ ڕۆژ بەسەر تەلەفۆنەكەی فاتمە خان تێپەڕیبوو ڕۆژی شەممە بوو تەلەفۆنم كرد بۆ كاوە و بەختیاری هاوڕێم، وتم وەرنە بازاڕ با بەیەكەوە نانێك بخۆین و هەندێك كارم پێتانە.

لەبازاڕ هەردووكیانم بینی چووین بۆ كەباب خواردن، بەدەم نانخواردنەوە باسی ئەوەم بۆ دەكردن كە ئەو ساحیرە بانگ دەكەم و دەمەوێت لێیبەم، بزانم بۆچی سیحر لەمن دەكات و كرۆنیكای ناردووە، ئەگەر لە ڕێگای جنۆكەكانی ئەوەوە بووە ئەوا زۆر گوێی پێ نادەم.

بینیم كاوە و بەختیار هەردووكیان چاویان زەق بووە و سەیرم ئەكەن.

بەختیار: جنۆكەی چی ماكوان؟

ماكوان: دەستم كرد بە پێكەنین، چوونكە لەدەمم دەرچوو قسەكەم چاك كردەوە و وتم مەبەستم لە كرۆنیكا خۆیەتی، چوونكە لە جنۆكە ئەچێت.

كاوە: كورە وەڵڵاهی زۆر جوانە، جنۆكەی چی.

ماكوان: بەهەرحاڵ ئەگەر زانیمان لەلایەن خەڵكێكی بێدینە ئەوا ئەیكوتم و بەلایەنی كەمەوە قاچ و دەستێكی دەشكێنم.

كاوە: گریمان قاچ و دەستی من شكاندم، تۆ مەیكە ئەگەر شتێك بوو با من بگیرێم.

ماکوان: کێشە من و تۆ نییە، ئەوەنییە بانگم کردوویت پێت خۆش بێت یان ناخۆش بێت کە پێمان زانرا هەموو بەشدارین، بەڵام پلان چیبێت و چۆن بانگی بکەم و بۆکوێی بانگ بکەم؟

هەموو کەمێك بێدەنگ بووین...

بەختیار: بانگی بکە بۆ غەسلەکەی من، لەوێ بڵێ سەیارەکەم دەشۆم و دوایی دەچینە شووێنێك پێکەوە دادەنیشین.

ماکوان: ئەی دوایی بۆ تۆ و کارەکەت خراپ نییە؟

بەختیار: بەقوربانی پێڵاوەکانت بێت.

ماکوان: قوربانی تۆ بم مامە بەخە گیان.

لەبەرچاوی ئەوان تەلەفۆنم کرد بۆ سیامەند. بەڕێزەوە وتم ئاغا سیامەند بەیانی وەرە بۆلام تا بەیەکەوە نانێك بخۆین.

سیامەند: بەسەرچاو بەڵام بێمە کوێ؟

ماکوان: وەرە بۆ شارەکەی من، ئەدرەسی ڕێستورانتەکەم لانییە بەیانی بەنامەیەك بۆت دەنێرم.

سیامەند: زۆر باشە.

بۆ سبەینێ کاتژمێر ١٢:٠٠ سیامەند تەلەفۆنی بۆ کردم وتی ئاغا ماکوان لەکوێیت بت بینم؟

ماکوان: لەماڵەوەم وەرە، چەندی تر دەگەیتە لام؟

سیامەند: پانزە خولەکی تر لەلاتم.

ماکوان: وەرە بۆ ئەم ئەدرەسە، من سەیارەکەم دەشۆم، چوونکە ڕۆژانی تر لەکارم سەرقاڵم و مەجالم نییە، ئەمڕۆ لەبەر من هاوڕێکەم غەسلەکەی کردۆتەوە تا سەیارەکەی من بشووات، هەمووی نیو کاتژمێرم پێدەچێت، لەوێ سەیارەکەشت بشۆ و دوایی بەیەکەوە دەڕۆین.

سیامەند: زۆرباشە واهاتم.

منیش تەلەفۆنم کرد بۆ بەختیار و کاوە، خێرا چووم بۆلایان و هەموو بەیەکەوە چووین بۆ غەسلەکەی بەختیار، لەوێ چاوەڕێ بووم تا سیامەند بێت.

چاوەڕێم دەکرد، وام دانابوو سیامەند کوڕێکی چوارشانەی زلی لە تەمەنی خۆمدا بێت، کە هات چاوم پەڕییە پشتی سەرم، کە بینیم کرۆنیکای هێناوە لەگەڵ خۆیا. کەسێکی زەعیف و داماو قژ هاتوو، باڵا کورت، پەنجەکانی بۆنی جگەرەی لێ دەهات، خۆی بۆنی بیرەی لێدەهات.

ماکوان: ئەوە تۆ بۆ هاتوویت کرۆنیکا؟

سیامەند: ئەی خۆت نەتوت بۆم بهێنە؟

بیرم کەوتەوە ڕاستی کرد، بەڵام من ئەو قسەیەم لەبیر چوبوویەوە، بۆیە چارەم نەبوو دەبوو کارەکەی خۆم هەر بکەم، بە قسەی خۆش و پیکەنین بردمە ئۆفیسەکەی بەختیار.

کاوە هات بۆلام وتی: ماکوان بە ئاغا سیامەند بڵێ با سەیارەکەی بهێنێتە ژوورەوە لەبەر پۆلیس، ڕۆژی یەك شەمە قەدەغەیە دەرگای غەسل کراوە بێت، با ئەویش بیهێنێتە ژوورەوە بۆشی دەشۆین.

سیامەند: بەسەرچاو.

ماکوان: ئەوە لە مندا دەبینی کرۆنیکا کە من ئەو کارە لەگەڵ تۆ بکەم، بڵێم لەبەر دەمی من پیاو لەگەڵ تۆ ڕابوێرێت، هەموو کات ئەگەر بە چاوی سۆزانی سەیرم کردبێتیت، بەڵام ئێستا خوشکی منیت، بۆیە دووبارەی دەکەمەوە تۆ ئێستا خوشکی منیت، تکایە ڕاستگۆ بە لەگەڵم لە پشتەوە خەنجەرم لێ مەدە.

کرۆنیکا: وەعد بێت تۆش ئاواتی برام بیت، با بڵێم وەکو باوکمی ئێستا.

ماکوان: باشە ئیستا نواندنێك دەکەین، بەلاتەوە ئاسایی بێت، بەڵام مەشهەدەکەی تۆزێك قورسە، مەقیژێنە و بێدەنگ بە با دەمت نەبەستم بە تیپ، باشە؟!

کرۆنیکا: خۆ نایکوژیت؟

ماکوان: نا، بەڵام نیوە مردووی دەکەین، ئاقڵی دەکەین بۆ پشتاوپشتی.

سیامەند هاتەوە بۆلای من و کرۆنیکا، لە کرۆنیکام پرسی جۆری تەلەفۆنەکەی چییە. من تەلەفۆنی خۆم پێبوو.

کرۆنیکا وەڵامی دایەوە وتی: سامسۆنگە.

لە سیامندم پرسی ئەی تۆ ئاغا سیامەند؟

سیامەند: ئەوەی من زۆر کۆنە، مۆتۆرۆلایە، ببوورە بیرم چوو تەلەفۆنەکەت بۆ بهێنم کە وەعدم پێ دابوویت.

ماکوان: گوێی مەیەرێ، کام جۆرەیە تەلەفۆنەکەت ئاغا سیامەند.

تەلەفۆنەکەی دەرهێنا و دایەدەستم، کاوە و بەختیار هاتنە ژوورەوە، منیش تەلەفۆنەکەیم کردەوە کۆدی لەسەر بوو، دامەوە دەستی و وتم تەلەفۆنێکم بۆ بکە، نازانم بۆچی زۆر جار ژمارەکەت لای من دەرناچێت.

تەلەفۆنی کرد جەرەس هات، تەلەفۆنەکەم لەدەستی وەرگرت و دانەیەکم کێشا بە-دەمیا، دەمی پڕ بوو لە خوێن. خێرا بەختیار تۆپەڵێك کلێنکسی خنی بە دەمیاو بە تێپ بەستی، کاوەش لە دواوە دەستی بە قەیدێکی لاستیك بەست.

قژیم گرت و کێشام بە زەویدا.

خوای گەورە شتێکی تری خستە دڵم، ئەوەی دامنابوو بیرم چووەوە، بە کرۆنیکام وت ئەمەبوو بەزۆر لەگەڵتا ڕایبوارد؟ داوای لێ کردیت کە شەرەفی من بشکێنیت و وێنەم بگریت؟

کرۆنیکا: بەڵێ!

ماکوان: سیامەند ئێستا دەمت دەکەمەوە، پێم بڵێ بۆ وات کرد و کار بۆ کێ دەکەیت؟

لەبەرچی لەگەڵ مندا ئەوە دکەیت؟

بەڵام پێش ئەوەی بتکەمەوە ڕاستیم پێ بڵێ، چەکوشێکم بەدەستەوە بوو، پێم وت ئەگەر درۆ بکەیت بەو چەکوشە هەرچی دانت هەیە دەیشکێنم.

بەسەر ئیشارەتی کرد، وتی باشە.

بەکاوەم وت کە تیپەکە بە دەمیەوە لابات.

کاوە تیپەکەی لابرد وتی: ئاغا ماکوان چەند مانگێك پێش ئێستا کەسێك داوای لێ کردم سیحرت لێ بکەم.

ماکوان: کەسەکە کێ بوو؟

سیامەند: بڕوا بکە تۆ نایناسیت.

ماکوان: حەیوان، کەسێک سیحر لەمن بکات چۆن نایناسم.

سیامەند: سوێندی شیعانەی بۆ خواردم، پەنا بەخوا وتی (بە زەهرا قەسەم) تۆ نایناسیت.

کە وتی زەهرا، من وتم استغفرالله.

کاوە وتی: ماکوان، زەهرا کێیە؟

ماکوان: کچی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەم درۆزنە شیرك دەکات و سوێند بە پاکترین ئافرەت دەخوات کە (فاطمە زەهرا)یە.

کاوە: باشە، خەریك بوو پیای بکێشم وامزانی شتی ترە.

ماکوان: نانا، ئەم فارسانە کە سوێند دەخۆن بەو شیوەیە سوێند دەخۆن.

بەختیار: ماکوان، بڕوای پێ دەکەیت؟

ماکوان: کوڕە نەوەڵڵا، بزانین کێیە ئەو کەسە با ناوەکەی بڵێت پێمان.

کاوە بۆکسێکی پیا کێشا و دەستی بادا، نەك خەریك بوو بیشکێنێت بەڵکو دەیویست لەبنا دەری بهێنێت.

بەکاوەم وت کاکە هێواش وا ئەقیرێنێت.

سیامەند: ئاغا ماکوان تۆ دەزانی من ڕۆحانیم، بەخوا ناوی ویرسان-ە، بەڵام شێخێکی گەورەترم هەیە ناوی وەرماش-ە، ئەو وتی کۆنتراکتمان لەگەڵ ماکوان هەیە، سیحری لێ مەکە.

ئەوە هەموو داستانەکە بوو!

کاوە: ئەو سەگ بابانە کێن؟ ڕاست ئەکات؟

ماکوان: ڕاست دەکات، ئەوە خەڵکی پۆڵەندان، نەمزانی چی بڵێم. کەچی سیامەندیش درۆکەی پشتڕاست کردمەوە و وتی ئائا خەڵکی ئەوێن.

بە سیامەندم وت تۆ ئەزانی کرۆنیکا چی منە؟

سیامەند: هەم شەهریتە، دەزانم

ماکوان: خوێری ئەوە کچی پوورمە، وەکو خوشکم وایە، من چۆن کاری خراپ لەگەڵ ئەودا دەکەم، کە وام وت کرۆنیکا خۆشحاڵ بوو سەری داخست.

وێنەی ئەوت گرتووە بە ڤیدیۆ لەتەلەفۆنەکەتدایە؟

کرۆنیکا: نا لەناو کۆپیوتەری ماڵەکەیدایە، چوونکە کامێرای ژوورەکەی پەیوەیست کردووە بە کۆمپیەتەرەکەیەوە.

ماکوان: ماڵەکەی دەزانیت؟

کرۆنیکا: بەڵی، هەر لە شارەکەی منە.

ماکوان: من سەیارەکەی لێ دەخوڕم، ئیوەش بە دوامدا بێن، خۆشی بخەنە سنووقی سەیارەکەی من، بەختیار تۆ لێخوڕە.

بەختیار: بەسەرچاو.

کاوە ویستی دەمی ببەستێت، سیامەند وتی ئاغا ماکوان پێی بڵێ با نەیبەستێت هەناسەم بۆ نادرێت، بەخوا نەشمخەنە ناو سنووقی سەیارەکە هیچ ناکەم لە ماڵێ خۆشم هەموو فیلمەکانت ئەیەمێ، بەڵام توخوا ئیتر لێم مەیەن.

ماکوان: وەعدی شەرەف، هەرچەند نیشتە؟

سیامەند: وەعد بێت.

ماکوان: کێشە نییە، با کاوە و کرۆنیکا لە پێشەوە دابنیشن من و سیامەندیش لە دواوە، بەڵام با کرۆنیکا لێ بخوڕێت و بەختیاریش بەدواماندا بێت، کەوتینە ڕێ بەرەو ماڵی سیامەند.

لەناو سەیارەکە دەیوت ئاغا ماکوان وەرماش تۆی زۆر خۆش دەوێت، بۆ؟

منیش هیچ وەڵامم نەدایەوە، جارێکی تر وتی: ئاغا ماکوان هەرچیت لێکردووم فیدای سەرت بێ، بەڵام بە وەرماش بڵێ، بەڵکو هاوکاریم بکات.

ماکوان: بێدەنگ بە، با جارێ هەموو شتی ئەو کچەت لێ وەربگرم دوای ئەوە قسە دەکەین، بزانم درۆم لەگەڵ دەکەیت ڕێک ئەونێرم بۆ قەبرسانی (ساپسبۆرگ) خۆ باش دەزانی کوێیە؟

سیامەند: هەرچی تۆ ئەتەوێت بەسەرچاو، تەنها وەرماش هاوکارم بێت.

ماکوان: دەمت داخە و بێدەنگ بە حەوصەڵەم نییە، با لێت تووڕە نەبم.

سیامەند: ئۆکەی ئاغا جان.

بەکرۆنیکام وت کەنزیک ماڵەکەی بوویتەوە پێم بڵێ، ڕاستەوخۆ مەچۆرە بەر دەرگاکەی، پاشان پرسیم لە شووقەدایە یان خانووە.

کرۆنیکا: خانووە، دەوروپشتەکەی چۆڵە

ماکوان: ئەو شووێنە کامێرای تیایە؟

کرۆنیکا: نازانم.

تەلەفۆنم کرد بۆ بەختیار ناونیشانی ماڵی سیامەندم دایە، پێم وت کە پێش بکەوێت و پێش ئێمە بڕواتە ئەوێ.

سیامەند: نا بڕوابکە تەنها ژووری نوستنەکەم کامێرای تیایە، ئەو ناوچەیە هیچ کامیرای تیا نییە، هەرچەند قسەکەی ڕاست بوو بەڵام هەرباوەڕم پێ نەکرد.

بە کرۆنیکام وت خۆی دوابخات تا بەختیار تەلەفۆن دەکات، بەختیار ئاگاداری کردینەوە کە هیچی لێ نییە.

لەناو سەیارەکە دەستیم کردەوە و پێم وت ناچارمان مەکە کە لێت بەین بە ئاقڵی و پیاوانە کارەکەت بکە با ئێمەش بڕۆین.

سیامەند: ئاغا ماکوان ماڵەکەشم بسووتێنن هیچ ناڵێم.

دەستیم کردەوە بە کرۆنیکام وت لەگەڵی بڕۆ ئێمەش بە دواتا دێین، لە چاوم ون نەبیت لەماڵەکەیدا چوونکە ئێمە شارەزا نین.

سیامەند خۆی زۆر بە جوانی پێشوازی لێ کردین وەك ئەوەی بە میوانی چووبین بۆ ماڵی، وا هەستم کرد دەترسێت، هەستم کرد ئەترسێت نەوەك دەمانچەمان پێ بێت، کە لەڕاستیدا نەك دەمانچە تەنانەت چەقۆشمان پێ نەبوو.

چوینە ژوورەوە من و کاوە و کرۆنیکا، تەلەفۆنم کرد بۆ بەختیار لەناو سەیارەکەدابێت و ئەو نەیەتە ژوورەوە، چووینە ناو ماڵەکەی بۆن بۆگەنی دەهات، ئەوندە پیس و پۆخڵ بوو، پڕ بوو لە ئەدەواتی جادوو سیحر و تەلیسم.

سیامەند: چی دەخۆن، بیرە ویسکی، وەرن بچینە باڕەکەم لەوێ خزمەتتان بکەم.

ماکوان: با سەرەتا کارەکەمان ئەنجام بدەین، دوایی دەبینە هاوڕێ، باشە؟

سیامەند: بەسەرچاو ماکوانی ئازیز تۆ هەرچی بڵێیت وادەکەین.

ماکوان: کوا، کۆمپیەتەرەکەت؟

سیامەند چوو هەمووی هێنا و خستیە بەردەستما و ئەو بێقیمەتە وێنەی ڕابواردنی خۆی و کرۆنیکای نیشاندام، منیش خێرا لامبرد، کرۆنیکام بانگ کرد کە بەدەستی خۆی هەموو فۆڵدەرەکان بسڕێتەوە، کۆمپیوتەرەکە و کامێراکە دەشکێنم.

کرۆنیکا: ماکوان، هەرگیز ئەو چاکەیەت لەبیر ناکەم.

ماکوان: وەختی ئەو قسانە نییە کارەکەت بکە.

باشە ئەگەر لە ئیمەیڵ یان لەناو هاردێکی تر دایانابێت چی بکەین؟

کرۆنیکا: وەڵلاهی نازانم، خۆ ئەشێت واشی کردبێت.

سیامەندم بانگ کرد پێم وت: کوڕی باش واخەریکە متمانەم بۆ دروست دەبێت، یەك پرسیارت لێ دەکەم ڕاستگۆبە لەگەڵم، چوونکە درۆ بکەیت دوو کارت لەگەڵ دەکەم.

یەکەم: بە هاوڕێکانمان دەڵێم بتدۆزنەوە

دووەم: بە وەرماش دەڵێم نەك هاوکاریت نەکات، بەڵکو تۆڵەشت لی بکاتەوە.

پێم بڵێ بێجگە لەناو فۆڵدەر و کۆمپیەتەرەکەت لە جێگای تر وێنەی ئەم کچەت هەڵنەگرتووە؟

سیامەند: بەچی دەڵێیت سوێندت بۆ پێ دەخۆم لێرە زیاتر لە هێچ جێگایەکی تر نیمە.

ماکوان: وەرماش بانگ بکەم یان ڕاستگۆیت؟

سیامەند: دڵنیابە، ڕاستگۆم لەگەلت.

ماکوان: زۆرباشە.

بە کرۆنیکام وت کە کارەکەی خۆی ئەنجام بدات، دوای ئەوە هارددیسکی کۆمپیوتەرەکەیمان دەرهێنا و لەگەڵ خۆمان هێنامان.

کامێراکەشمان لە دیوارەکەی کردەوە و ئەویشمان برد لەگەڵ خۆمان، وتم چاوەڕێ بە هەوڵت بۆ ئەیەم وەرماش دەنێرم بۆلات.

سویچەکانمان دایەوە دەستی و سواری سەیارەکەی خۆمان بووین، بەختیار پرسی بۆکوێ؟

ماکوان: کرۆنیکا بەرنەوە بۆ ماڵەوە.

هاردەکە و کامێراکەم دایە کرۆنیکا و پێم وت ئەوە بۆ تۆ.

کرۆنیکا: وەرە بۆلای دایکم.

ماکوان: نایەم ماڵەکەی تۆش وەك ماڵی سیامەند هەر کامێرایە.

کرۆنیکا: وەی باوکە گیان، چۆن دەزانیت ماکوان؟

ماکوان: کەی بوویت بە بەشەر و ئیحترامی منت گرت، ئەوکات دێمە خزمەتی دایکت.

کرۆنیکا: بەچاوی ماکوان هەمووی لادەبەم.

ماکوان: پەنا بەخوا، گوو بەچاوی من، سوێند بە من نەخۆیت جارێکی تر باشە.

كرۆنیكا: وە بەخوا نەمزانی، خۆ خراپم نەوتووە.

ماكوان: با خراپت وت، سوێند تەنها بە خوا دەخورێت،من خوا نیم، من دروستكراوی خوام و مرۆڤم.

كرۆنیكا: بەخوا لایدەبەم تەواو.

ماكوان: ئێستا ماندووم، ڕۆژێكی تر دێم بۆمالتان، من و بەختیار و كاوە، باشە؟

كرۆنیكا: یاخوا بەخێربێیت.

كرۆنیكا دابەزی و ئێمەش بەرەو شاری خۆمان بەڕێ كەوتین.

لەڕێگا كاوە پرسی باشە ئەو كچە بۆ وای كردووە لەگەڵ ئەو سیامەندە خویڕییە؟

بەختیار: ئەی باشە وەرماش كێیە؟ ئەی ویرسان كێیە؟

كاوە و بەختیار ئەیانوت بەخوا ماكوان هیچ تێناگەین، نە لە تۆ نە لە سیامەند نە لەو كچەش.

هەمووتان بەكۆد قسەتان دەكرد، بەڕاستی مەوزوع چییە؟

ماكوان: ئەگەر بۆتان باس بكەم بڕوام پێ دەكەن؟

هەردووكیان وتیان: ئەرێ وەڵڵا بڕوات پێ دەكەین.

دەوەرن بۆ ماڵەوە با كتێبی مەملەكەتی شەیتانتان بەمێ بیخوێننەوە دواتر قسە دەكەینەوە.

بەختیار: ئاخر ماكوان من لە ژیانما یەك كتێبم نەخوێندوەتەوە بۆیە وازم لە مەكتەب هێنا لەداخی سەعی كردن، ئێستا تۆ سەعیم پێ دەكەیت.

كاوە: وەڵڵاهی منیش لەژیانما كتێبێكم تەواو نەكردووە.

ماكوان: دەكەواتە تێناگەن، تەنها سەرەتا ئیرادەی خوێندنەوەتان هەبێت، بڕوا بكەن دواتر حەزتان بۆ خوێندنەوە دروست دەبێت و كتێبەكە ئێوە دەخوێنێتەوە، باشە؟!

بەختیار: كتێبەكە ئێمە دەخوێنێتەوە؟!

ماكوان: بەڵێ تاقی بكەرەوە؟.

كاوە: بەخوا قسەی سەیر دەكەیت، یان پێمان ڕادەبوێریت.

ماكوان: ئێ تاقی بكەنەوە بزانن وایە یان نا

كاوە: ئەی بۆچی بۆمان باس ناكەیت و ئیتر لەم خوێندنەوەیە ڕزگارمان ببێت.

ماكوان: كاوە تۆ دەزانیت من چەندە ڕێز و خۆشەویستی ئێوەم لایە، دەشزانم هەمووتان زیاد لە پێویست ڕێز و متمانەی منتان لایە، جا بەس ئەمەم بە قسە بكەن مەمنوونتان دەبم.

هەردووكیان وتیان: بەسەرچاو.

چووینە ماڵەوە كتێبەكانم پێشكەش كردن، وەعدم لێ وەرگرتن كە چوونەوە دەست بكەن بە خوێندنەوەی.

شەو کاتژمێر ٩ بەختیار تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی بەرگی یەکەمم بە دوو سەعات تەواو کردووە وا خەریکی بەرگی دووەمم، خۆشترین کتێبە لە ژیانما خوێندبێتمەوە.

ماکوان بەپێکەنینەوە: جا کوا تۆ لە ژیانتا کتێبت خوێندۆتەوە؟

بەختیار: بەڕاست ئەوە ڕاستییە؟

ماکوان: ئەی ئەوە نییە تۆ خۆت ئەمڕۆ بەشێك بوویت لەو ڕووداوانە.

بەختیار: بەڕاست؟

ماکوان: بەڵێ خۆ درۆ ناکەم.

بەختیار: پێیان بڵێ بێن بۆلای منیش.

ماکوان: ئەوە بەتەنها داوای تۆ نییە، زۆر کەسی تر ئەو داوایە دەکەن، بەڵام بە دەست من نییە.

هەندێك قسەمان کرد و ماڵئاواییمان لەیەکتر کرد.

بەڵام کاوە دەنگی نەبوو، لە دڵی خۆما وتم کورە کوا کاوە تاقەتی ئەو شتانەی هەیە.

بەیانی هەڵسام لەخەو بۆ نوێژی بەیانی، تەماشای تەلەفۆنەکەم کرد کاوە کاتژمێر ٢ی شەو زیاتر لە دە جار تەلەفۆنی بۆ کردبووم، منیش ترسام وتم حەتمەن شتێك ڕوویداوە.

خێرا بەو بەیانییە تەلەفۆنم بۆ کرد، یەکسەر جوابی یایەوە، لێم پرسی کاوە چییە خێر خۆ هیچ نەبووە؟

بەو نیوە شەوە ئەو هەموو تەلەفۆنە چییە کردوتە؟

کاوە: بەرێوەڵلا چۆن شت ڕووینەیاوە، من شێت بووم بە دیارتەوە، بەڕاست ئەوە ڕاستییە؟

ماکوان: تۆ خۆت بەشێکی لەو ڕاستییە، بەیەکەوە نەچووینە سەر ساحیرەکە؟

## گەیشتن بە فرانك دۆستی کرۆنیکا

لەنوێژی بەیانی دا تەلەفۆنم کردەوە بۆ کاوە، شەو هەر نەخەوتبوو خەریکی خوێندنەوەی کتێبی مەملەکەتی شەیتان ببوو، کە قسەم لەگەڵ کرد داوای ئەوەی لێکردم کە چیرۆکە یان ڕاستییە ئەم ڕووداوانە.

ماکوان: ئاخر کوڕی باش کاوەی برام، تۆ خۆت لەواقعەکەدا دەژیت لەگەڵمدا بووی، ئیتر درۆی چی و چیرۆکی چی برای من. دەبینیت چۆن سیحر و جادووم لێدەکەن و دەبینیت چۆن لەگەڵمدا شەڕ دەکەن.

کاوە: ئەی ئەم کرۆنیکایە کێیە؟ جنۆکەیە، شەیتانە یان فریشتەیە؟

ماکوان: هیچییان، مرۆڤە کە کڕین و فرۆیشتن بە جوانییەکەیەوە دەکات.

کاوە: واتە سۆزانییە؟

ماکوان: نا بەو مانایە نا کە لاشەی خۆی بفرۆشێت، بەڵام هەڵخەڵەتێنراوە، گیرۆدەیە بەدەست جوانی و لەش و لاری خۆیەوە کە ڕۆژ بوویەوە قسە دەکەین کاتی نوێژە، جارێ خوات لەگەڵ.

کاوە: ماکوان دەمەوێت فێری نوێژم بکەیت نایزانم.

ماکوان: وەی بەسەرچاو لە خزمەتام تۆ داوا بکە، من لە خزمەتام.

کاوە: کەی هاتیتەوە لەکار بایەکتر ببینین، باشە برا؟

ماکوان: لە خزمەتام ان شاء الله.

نوێژی بەیانیم کرد و وەکو هەموو ڕۆژانی تر سەرقاڵی ژیان و ڕۆتینەکانی بووم.

لەکار گەڕامەوە چووم بۆ مزگەوت دوای نوێژی عەسر چاوەڕێی کاوەم دەکرد بێت بۆ مزگەوت، پەیمان وابوو لەمزگەوت یەکتر ببینین، بەڵام لە جیاتی کاوە کازۆڵ هات بۆلام سڵاوی لێکردم، زۆر خۆشحاڵی خۆمم بۆ دەربڕی بە هاتنی.

کازۆڵ: ئەمەوێت بپرسم چۆن ئەو سیامەندت ڕسوا کرد، یەکێکە لە ساحیرە پیسەکان، چۆن شەیتانەکانی هاوڕێی هاوکاریان نەکرد.

ماکوان: خۆم پێشتر دراسەی ئەوەم کرد، زانیم هیچ ناڵێت چوونکە وەکو دیارییەك بوو لەلایەن وەرماش بۆ من بۆ ئەوەی زیاتر لێیان نزیك ببمەوە، لە ڕاستیدا خۆیان وایان کرد کە ڕسوای بکەم، چوونکە بۆ ئەوەی دوایی بیکەن بە منەت، بەسەرمەوە داوای ئیشم لێبکەن.

کازۆڵ: داوای چیت لێ دەکەن؟

ماکوان: تا ئێستا داوای هیچییان نەکردووە، بەس تەنها من داوای موشەکی ئەتۆمم کردووە.

کازۆڵ: ئاگاداری ئەوە هەم، ئەی دوای ئەوە هیچ ڕووی نەداوە؟

ماکوان: نا، بەڵام ئەوەندەی هەستم پێ کردبێت ئەوان لە کەمیندان بۆ من و بەدوای خاڵی لاوازدا دەگەڕێن، کە منی پێ کۆیلە بکەن؟

کازۆڵ: ئاگاداری خواردن و خواردنەوە بە لەدەستی هیچ کەسێکی نەناسراو هیچ خواردن و خواردنەوەیەك وەرنەگریت.

ماکوان: بەسەرچاو، بەڵام ماوەی چەند مانگ لەمەوبەر ئەو وەرماش-ە سەخیفە نوقڵێکی دامێ، زۆر زوو بوورامەوە، نەمزانی ئەوە چیبوو؟

کازۆڵ: نا، ئەوە هیچ نییە، ئەوە سیحر نییە. بەڵکو جۆرێکە لە پێدانی وزە و توانا بۆچوون بۆ جێگا و مەنزڵگا و وڵاتی ئەوان، بە زمانی ئێوەی مرۆڤ.

ماکوان: بەڕاست، من لە جێگا و شووێنی ئێوە تێناگەم، مەگەر ئێوەش لەسەر زەوی ناژین وەکو ئێمەی مرۆڤ.

کازۆڵ: با وەکو ئێوە لەسەر زەوی دەژین، هەشمانە لەسەر ئەستێرە و جێگاکانی تر دەتوانێت بژین، بەڵام وەکو سەرزەوی جوان و خواردن و ئاوو هەوای پاك و خۆش نییە.

ماکوان: واتا ئێوە ژیان دەبنە سەر لەسەر ئەستێرە و هەسارەکانی تر؟

کازۆڵ: ئێ بەڵێ بەدڵنیاییەوە، خۆ ئێمە خاوەن لاشە نین وەکو ئێوەی مرۆڤ، ئێمە زیاتر وزەین تا ماددە، بەڵام توانای ئەوەمان هەیە وزەکان بکەین بە ماددە بەپێچەوانەشەوە.

ماکوان: وەڵڵاهی سەیرە، ئەمە یەکەم جارە دەبیستم ئەو توانایەتان هەیە.

کازۆڵ: نا، یەکەم جار نییە لەبیرت چۆتەوە، ئیوەی مرۆڤیش ئەو کارە دەکەن، ماددە دەکەن بە وزە و بە پێچەوانەشەوە.

ماکوان: بەڵێ دەزانم ئەوە مەبەستم خودی مرۆڤ ناتوانێت ئەو کارە لە خۆیدا ئەنجام بدات.

کازۆڵ: بەڵێ بە دڵنیاییەوە ناتوانن ئەو کارە لە خودی مرۆڤەکان ئەنجام بدەن، ئەوەش بزانە کە خوای گەورە لەچەند جێگادا لە قورئاندا باسی ئەوەی کردووە کە جنۆکەکان دەتوانن بچنە ئاسمانەکان و هەواڵ بهێننەوە بۆ ساحیرەکان، هەندێکیان لەناو دەچن بەهۆکاری ئەو نەیزەکانەی کە فریشتەکان تێیان دەگرن.

ماکوان: ڕاستە لە سوڕەتی (الملك)دا ئایەتی (٥) خوای گەورە دەفەرمووێت:

وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ ﴿٥﴾

واتە بێگومان ئێمە دنیامان کردووە بە چراخان (بەهۆی ئەستێرەکانەوە کە بە شەوگاردا بەدی دەکرێن) بەو ئەستێرانە شەیتانەکان ڕاو دەکەین، لە قیامەتیشدا سزا و ئەشکەنجەی دۆزەخمان بۆ ئامادە کردوو.

هەروەها لە سوڕەتی (الجن) لەوێدا ڕوون کراوەتەوە زیاتر و دەفەرمووێت:

وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾

واتە: ئێمە بەرەو ئاسمان کشاین و هەست و هۆشمان خستە کار، (سەرنجمان دا) کە پڕهە لە پاسەوانی بەتواناو بێ شوومار، نەیزەکیش (بە هەموو لایەکدا دەکشا، دیاربوو کە ڕووداوێکی گەورە ڕووی دابوو).

وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾

واتە: ئێمە جاران لە هەندێک شووێن خۆمان حەشار دەدا بۆ گوێگرتن و دەنگوباس بیستن، بەڵام ئێستا ئەوەی بیەوێت گوێ بگرێت یەکسەر نەیزەکێکی بۆ ئامادەیە و بۆی دەهاوێژێت و (لەناوی دەبات).

کازۆڵ: لەزۆر جێگای تردا خوای پەروەردگار ئەو توانایەی ئێمەی بۆ ئێوە ڕوونکردۆتەوە.

ماکوان: واتا تۆش دەتوانیت بڕۆیت بۆ ئەو ئاسمان و ئەستێرە و هەسارانە؟

کازۆڵ: بەڵێ بە دڵنیاییەوە چووم، هەرکاتێکیش بمەوێت دەچم.

ماکوان: هیچ مەخلوقاتی تر هەیە لە ئاسماندا بێجگە زەوی؟

کازۆڵ: بەڵێ بەدڵنیاییەوە هەیە، بەڵام وەکو ئەوەی مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە نییە.

ماکوان: وەڵڵاهی تێناگەم مەبەستت چییە؟

کازۆڵ: مەبەستم ئاسمان پڕە لە مەخلوقاتی خوای پەروەردگار، بەڵام هیچییان خەلیفە نین، ئەوە تەنها مرۆڤە سەرداری ئەم گەردوونەیە. ئەم گەردوونە بۆ پێشووازی مرۆڤ دروستکراوە، بەڵام بەداخەوە مرۆڤ قەدری ئەو سەرداری و خەلیفە بوونە نازانێت، بەگشتی!!

ماکوان: ڕاستە، مەبەست فریشتە و جنۆکەیە کە تەنها ئەوان لە ئاسماندان.

کازۆڵ: بەڵێ، لەگەڵ هەندێك وزە و ماددەی زیندوو.

ماکوان: ڕاستە، کازۆڵ باسی ئەو خانەوادە ساحیرانەم بۆ بکە؟

کازۆڵ: بەسەرچاو، بەڵام کاوەی هاوڕێت هات، هەڵیبگرە بۆ کاتێکی تر.

گوێم لە کاوە بوو لە دەرگای مزگەوتەکەوە هاواری دەکرد ماکوان لەکوێیت؟ چووم بە دەمیەوە.

ماکوان: ئەو هات و هاوارەت لە چییە؟ ئەڵێی لە ئەشکەوتیت، وەرە ژوورەوە و تەواو.

کاوە: دەی چوزانم یەکەم جارمە بێمە مزگەوت.

ماکوان: دەی یاخوا بەخێر بێیت بۆ ماڵی خوا.

کاوە: بەساقەی تۆ بم ماکوان، ڕۆحەکەیت؟

ماکوان:خۆ ماڵی من نییە، ماڵی خوایە.

کاوە: دەی بەساقەی خوا گیان بم.

دامە قاقای پێکەنین.

کاوە: بۆ دەتوانیت لە مزگەوت پێبکەنیت؟

ماکوان: ئەی تۆ بەتەمای بگرین برا؟

تا نوێژی مەغریب لە مزگەوت بەیەکەوە بووین، فێرم کرد و بۆم نووسییەوە کە چۆن نوێژ بکات.

دیاربوو زۆر خۆشحاڵ بوو، مەملەکەتی شەیتان کاری تێکردووە، وتم کاوە تکایە بەردەوام بە لەسەر دینداری و هەوڵ بدە گەرمە تەریقەت نەبێت.

سەرەتا بەسۆزی عاتیفە شووێن شتێك بكەویت و دوایی کە تاقەتت نەما وازی لێ بهێنیت، ئەم دینە یاری منالآن نییە یان پیاوانە و مەردانە بیگرە، یان لە ئێستاوە بڕۆ واز بهێنە.

کاوە: تەواو سوێند بەخوا واز ناهێنم و تەواو، تەمەنم بەسەرچوو لە هیچدا سەرفم کرد، دڵم بەهیچ ڕابردووم خۆش نییە. ئەو تەمەنەی ماوە، بەڵکو خوای گەورە لێم خۆش بێت، قیامەتم ئاوەدان بێت. نوێژی مەغریبمان کرد و هەردووکمان بەرەو ماڵ ڕۆشتینەوە و ماڵئاوایمان لەیەکتر کرد.

کاوە پێشبڕکێی لەگەڵ کات و زەمەندا دەکرد، ڕۆژی کتێبێکی دەخوێندەوە، لە ڕۆژێکدا چوار پێنج جار تەلەفۆنی بۆ دەکردم، پرسیاری دەکرد لە سەر دین و عەقیدە و قورئان و فەرموودە..هتد.

زۆر گەرم و گوڕ بوو لە دینداری، منیش وا هەستم دەکرد سەرەتایە، وردە وردە خاو دەبێتەوە، بەڵام هەرچۆن بوو دەبوو ئاگاداری بم و بەردەوام بێت لە خواناسییەکەی.

ڕۆژێك لە غەسلەکەی بەختیار دانیشتبووم، تەماشای تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانم دەکرد، کاوە خۆی کرد بە ژوورا وتی با بڕۆین بۆ مزگەوت.

ماکوان: جارێ ماویەتی بۆ نوێژی عەسر، کاوە باشە بەختیار پێویستی بە خەڵکە بۆ ئیشی لاناکەیت؟

کاوە: وەڵلا پێم خۆشە، هاوڕێی تۆیە پێی بڵی، بزانە کارم نایاتێ؟

ماکوان: بەسەرچاو!

چووم بۆلای بەختیار وتم کاوە بێ ئیشە و کوڕێکی ئیشکەرە بۆ کاری نایەیتێ؟

بەختیار: بەسەرچاو، ئەگەر ئەو بەمن ڕازی بێت ئەوا من دەیخەمە سەرچاوم، کاوە کوڕی چاکە و خۆشم ئەوێت.

بەیەکەوە چووین بۆ مزگەوت و بڕیار درا کە بەیانی دەست بکات بە کارکردن لای بەختیار، لە ڕێگای مزگەوت کرۆنیکا تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی لە شارەکەی تۆم لەگەڵ دایکم، ئەگەر کاتت هەیە دایکم حەز ئەکات بتبینێت.

ماکوان: ئێستا لە کوێیت؟

کرۆنیکا: تۆ لەکوێیت؟

ماکوان: من لە ڕێگای مزگەوتم، پانزە خولەکم بدەنێ با نوێژی عەسر بکەم دێمە خزمەتی دایکت.

کرۆنیکا، دایکم ئەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات.

ماکوان: با بفەرموێت لە خزمەتیدام.

فاتمە: ماکوان چۆنی باوکەکەم.

ماکوان: خوای گەورە سەرفرازی دنیا و قیامەتت بکات فاتمە خان، تۆ باشی؟

فاتمە: باوکی من بۆ خۆتم لێ ئەشاریتەوە، بەخوا بەقەدەر ئاوات خۆشم ئەوێیت، دەرۆڵە وەرە بۆلام کەمێك قورئانم بەسەردا بخوێنە.

ماکوان: بەسەرچاو تەنها ١٥ خولەکم بەنێ با نوێژەکەم بکەم دێمە خزمەتت.

ئێستا کاتی نوێژە و لە مزگەوتم، پشتیوان بە خوا دوای نوێژ دێمە خزمەتت.

نوێژمان کرد و بەکاوەم وت وەرە با بەیەکەوە بڕۆین بۆلای کرۆنیکا و دایکی، هاتوون بۆ ئێرە حەز دەکەن بمان بینن.

کاوە: وەڵڵا من نایەم، کاکە جائیز نییە ئەو ئافرەتە زۆر ڕووت و قووتە، پیاو تەحەمول ناکات.

ماکوان: ئاخر با منیش بەتەنها نەچم، کاوە پیاوی چاك بە وەرە لەگەڵم.

کاوە: نایەم ئیزعاج، خۆت بچۆ.

ماکوان: کورە پیاوی چاك بە، ئەو ئافرەتە خەتەرە، هەرچی خۆم دوور دەخەمەوە کەچی بەشتێك زیاتر نزیك دەبێتەوە، دایکی دەڵێت وەرە بۆلام قورئانم بەسەردا بخوێنە.

کاوە: بەخوا مادام دایکی ئەو کچەی پەروەردە کردووە ، دایکیشی هەروەکو ئەو وایە

ماکوان: کورە دایکی پیرە و نەخۆشە، داوای خوێندنی ڕوقیەی شەرعیم لێدەکات، مەردی خوا بە بابەیەکەوە بین، باش بوو قەناعەتم پێکرد کە بەیەکەوە بین و ئەوان ببینین.

تەلەفۆنم کرد بۆ کرۆنیکا و لێم پرسی لەکوێن؟ ئێمە تەواو بووین بێینە خزمەتی دایکت.

کرۆنیکا بە پێکەنینەوە: ئەی خزمەتی من؟

ماکوان: تۆ دەبێت لە خزمەتی مندا بیت، جارێکی تر وا نەڵێیت، ئەگینا نایەم بەخوا.

کرۆنیکا: دەباشە هەر بۆ خۆشی وام وت، بۆ ئەوەندە دڵت ناسکە، ببوورە هەڵە بووم.

ماکوان: چوزانم ئاوا دان بەهەڵەی خۆتا بنێ، لەکوێن؟

کرۆنیکا: لە (ئوێستفۆڵد هاڵەنە)ین.

ماکوان: واهاتین.

ئوێستفۆڵد هاڵەنە بازاڕێکە لە شارەکەی ئێمە، گەیشتینە ئەوێ، من و کاوە بەدوایاندا دەگەڕاین لەناو بازارەکەدا، لەدوورەوە کرۆنیکا دەستی بۆ بەرز کردمەوە و بانگی کرد ماکوان!

خوایە چیم دی، کرۆنیکا دەستێك جلی پرتەقاڵی کاڵی لەبەردا بوو، گوڵێکی سپی دابو لە قژی، کە منی بینی هەموو گیانی پێدەکەنی، منیش کە بینیم چاوم زەق بوو و تووشی شۆك بووم.

کاوە: باوکەڕۆ ماکوان ئەوە چییە؟

ماکوان: وەڵڵا ئەوە کرۆنیکایە کاوەی برام.

کاوە: هەرچی نەزەر و تاوانەکانمە بە ملی تۆ، تۆ منت بە زۆر هێناوە.

چووین دانیشتین لە کافتێریایەك، فاتمە خان بەخێرهاتنی کردین و بەمنی وت کوڕم وەرە ماچێکم بەرێ ماشاءالله کە موبارەکی، سەرم بردە لایەوە سەری ماچ کردم و منیش دەستم ماچ کرد. کەچی کرۆنیکا بەمنی وت ماچێکیش بە بەمن ماکوان.

مۆرەیەکم لێ کرد و دانیشتم و دوو قاوەمان بانگ کرد، لەگەڵ فاتمە خان هەندێك موجامەلەی یەکمان کرد و لە تەندروستیم پرسی، وتی بەخوا کوڕم باش نیم.

ماکوان: باش دەبیت ان شاءالله، فاتمە خان حەجت کردووە ؟

فاتمە: نەوەڵڵا ڕۆڵە کەس نییە لەگەڵی بڕۆم، زۆر حەز ئەکەم بڕۆم.

ماکوان: ئەی ئاواتی کوڕت، یان چیمەنی کچت؟

فاتمە: بەخوا ڕۆڵە ئاوات سەری ساڵ و سەری ساڵ ئەیبینم، چیمەنیش بێدینە هەر خەریکی سوراو و سپیاوی خۆیتی.

ماکوان: خوا هیدایەتیان بات.

فاتمە: باوکەکەم ئەمەوێت قسەت بۆ بکەم دوو بەدوو.

ماکوان: لەخزمەتام.

تەماشام کرد کاوە و کرۆنیکا تەماشامان دەکەن.

ماکوان: ئێمە هەڵسین بڕۆین یان ئیوە دەڕۆن؟

کاوە هەڵسا چوو بۆ تەماشای شتومەك، کرۆنیکاش چووە دوکانێك تەماشای جلوبەرگی ژنانە بکات.

ماکوان: فاتمە خان فەرموو لەخزمەتام!

فاتمە: ماکوان، من نازانم کەی دەمرم، بەڵام دەزانم مەرگم نزیکە. پارەیەکی زۆرم هەیە دەمەوێت بیدەم بەوەی موحتاجە، چوونکە بمرم نە ئاوات و نە چیمەن بۆم ناکەن بەخێر، جا باوکەکەم تۆ وەکیلم بە بە ئارەزووی خۆت ئەوەی ئەزانیت موحتاجە بیدەرێ.

ماکوان: پارەکەت نزیکی چەند دەبێت؟

فاتمە: ٤٠٠ هەزار کرۆن، نزیکی چوار دەفتەر دۆلار.

ماکوان: ئەی منداڵەکانی خۆت پێویستیان نییە؟

فاتمە: کوڕی خۆم چیمەن کار ئەکات، وەکو خۆی باس ئەکات بە ملیۆن کرۆن پارە لەسەر حسابەکەیەتی، ئاواتیش ملیۆن، لێرە ئیتر پارەی چییان بدەمێ.

ماکوان: وەڵڵا من دەڵێم مادام پارەت هەیە بچۆ بۆ حەج.

فاتمە: ئەوە من ئامادەم، دە بمبەن.

ماکوان: من ئەو کارەت بۆ جۆر دەکەم، ئەوەشی مایەوە لەدوای حەجەکەت بە کۆمپانیاکە دەڵێم لە مەککە و مەدینە لەگەڵت بن، لەوێ خەڵکی لێیە بۆ خوێندن لەوێن پارەکە بدە بەوان خێرت دەگات و

هاوکاریت دەکەن هەموو دروشمەکانی حەجت لەگەڵ دەکەن و بە عەرەبانە و کورسی هەموو طەوافەکانت پێ دەکەن.

جۆری دووهەم لێرەوە کەسێک لەگەڵت بێت و پارەی حەجەکەی بۆ بدە، بەڵام مەسرەفی ئەوێی با عایدی خۆی بێت.

فاتمە: ئەوە من لە ئێستاوە ڕازیم، سەرەتا سەد هەزار کرۆنم بۆ هێناویت، بۆم دابەش بکە و تۆ وەکیل بە فەرموو ئەوە پارەکە.

ماکوان: خوای گەورە خێرت بنووسێت.

لێم وەرگرت و خستمە گیرفانم...

فاتمە: باوکەکەم کەی دێیت بۆ ماڵمان، تۆزێ قورئانم بەسەردا بخوێنە.

ماکوان: من ئەتنێرم بۆ حەج، لە قورئان خوێندنەکەی من باشترە.

فاتمە: وەڵلا کوڕم ئەوەم بۆ بکەیت هەتا ماوم مەمنونت دەبم.

ماکوان: ئەوە لەسەر من ڕەمەزان مانگێکی ماوە، لەمانگی رەمەزان ناوت دەنووسم و پاسپۆرتەکەتم بۆ بنێرە بۆ ئەوەی کاتی حەج هەموو شتێك ئامادە بێت، ان شاءالله.

فاتمە: بەسەرچاو.

ماکوان: با کاوە و کرۆنیکا بانگ بکەینەوە.

لێمان نزیك بوون، هەرچی بەدوای کاوەدا گەڕام دیار نەمابوو.

فاتمە: دابنیشن ئێستا دێمەوە.

كرۆنیكا: بۆ كوێ دەچیت دایكە؟

فاتمە: ڕۆڵە دەچم، بۆ دەستشۆری.

ماكوان: بڕۆ لەگەڵ دایكت.

كرۆنیكا: خۆ منداڵ نییە خۆی دەڕوات.

كە دایكی هەڵسا ڕۆشت من و ئەو بەتەنها ماینەوە، بۆیە وتم منیش ئەڕۆم بەدوای كاوەدا دەگەڕێم.

كرۆنیكا: ئەوە لێم دەترسیت بۆیە ئەڕۆیت؟

ماكوان: ڕاستت دەوێت، زۆرت لێ دەترسم.

كرۆنیكا: وەی ماكوان بۆ لێم ئەترسیت بۆ ئەوەندە ناشیرینم؟

ماكوان: نا- پێچەوانەكەی لەبەر ئەوەی زۆر جوانی.

كرۆنیكا: بەخوا كەس لەتۆ تێناگات

ماكوان: بۆ تێناگەیت لەو چاوانەت دەترسم، لەبۆنەكەت دەترسم، لە قسەكردنت دەترسم، ئەزانی چەندە خەتەر و ترسناكی، وەكو موشەكی ئەتۆم وایت بۆ من لە تەوقیت دایت و پیامدا بتەقیتەوە، تەواو من وێران دەبم.

كرۆنیكا: ئەڵڵا ئەو قسانەی چەندە خۆشە و چەندە ماناداره.

ماكوان: ئەڕۆم بەدوای كاوەدا دەگەڕێم، ئێستا دێمەوە.

زۆر گەڕام بەدوای کاوەدا نەبوو، ناچار تەلەفۆنم بۆ کرد و لێم پرسی لە کوێی؟

کاوە: لای سەیارەکە دانیشتووم

ماکوان: بگەڕێوە تەواو بووین لە قسەکردن.

کاوە: باشە.

منیش گەڕامەوە لای کرۆنیکا و دایکی بۆ ئەوەی ماڵئاواییان لێ بکەم، کە گەڕامەوە سەیرم کرد سێ پیاو لەسەر هەمان مێز دانیشتوون، کە نزیك بوومەوە کرۆنیکا منی ناساند بەوان، یەکێکیان تەمەنی لە چلەکاندا بوو وتی ئەوە فرانکی دۆستمە ئەوانەی تریش هاوکارەکانین.

منیش خۆم پێ ناساندن، زانیم زۆر لووتبەرزە لەو لووتبەرز تر خۆم نیشان داو بە نەرویجی ڕوومکردە فاتمە خان و پێم وت کاتم نەماوە و ئەمانە هاتن من دەڕۆم، دەستیم ماچ کرد و ئەویش سەری ماچ کردم، خوا حافیزیمان لەیەکتری کرد.

گەڕامەوە بۆلای کاوە، خەمۆکییەك دایگرتبووم نەمدەزانی چییە، دوایی کە شیکاریم بۆ خەمۆکییەکەم کرد زانیم بەخیلیە کە ئەو ئافرەتە جوانە لای ئەو فرانکە بێ قیمەتە لووتبەرزەیە.

کاوە: وامزانی قسەی تایبەتت لەگەڵ کرۆنیکا هەیە، ئەمە تومەس دایکی حەزت لێدەکات (ڕایدەبوارد و بۆ سوعبەت وای دەوت).

ماکوان: دابەزە وەرە ئیشم پێتە، با بڕۆین ئەو کوڕە ببینە و بیناسە جا دوایی پێت ئەڵێم چی بکەیت.

لەگەڵ کاوە ڕۆشتین بەدوای فرانک و هاوڕێکانی دەستی کرۆنیکای گرتبوو، بە کاوەیم نیشان دا، لەگەڵ کاوە گەڕاینەوە بۆ مزگەوت بۆ نوێژی مەغریب.

ماکوان: حەز ئەکەیت بڕۆیت بۆ حەج کاوەی برام؟

کاوە: جا کێ حەز ناکات، بەڵام بەچی؟

ماکوان: بە پارە.

کاوە: جارێ من ژنم نییە، ژن هێنان بۆ من باشترە، ئەی مەگەر وانییە؟

ماکوان: نەوەڵڵا وانییە، حەج فەرزی خوایە، مرۆڤ دەتوانێت ژنیشی نەبێت و بڕوات بۆ حەج، ئیتر ئەم قسەیە نە شەرعییە و نە هیچ، قسەیەکی بێمانایە.

کاوە: ئێ خۆ من پارەی هیچیانم نییە.

ماکوان: ئەگەر پارەکەت بۆ پەیدا بکەم، ئەڕۆیت؟

کاوە: پێم ڕائەبوێریت؟

ماکوان: نەبەخوا بەڕاستمە، کوا لەبابەتی دینیدا گاڵتەوگەپ دەکەم من؟

کاوە: وەڵڵا مەمنون دەبم، بەڵام هیچی لێنازانم.

ماکوان: خۆم فێرت دەکەم، باشە؟

کاوە: نەك باشە بەڵکو هەر زۆر زۆر باشە.

ماكوان: كەواتە خۆت حازر بكە بۆ مەوسمی كاتی حەج.

لەوكاتەدا بە كاوەم نەوت لەگەڵ فاتمە خان دەینێرم، چوونكە دەمزانی كە ڕقی لێیانە، وتم بابەقسەی خۆیەوە بێت، بەڵام لەمێشكی خۆمدا دوو كەسی ترم دانابوو پێیان بڵێم، ئەگەر كاوە قبوڵی نەكرد.

دوای چەند ڕۆژێك لەسەركار بووم وەرماشم بینی، بەگەرمی چووم بۆلای وتم چییە كوڕی باش منت لەبیرچۆتەوە، خۆ من و تۆ ڕەفیق بوین لای خۆی.

هاوڕێ چۆنی باشی دەنگ و باست؟ ئەوە بۆ لێمان ناپرسیت؟

چییە تا جنە موسوڵمانەكان هاوڕێم بوون ئێوە شەڕنەما پێم نەگێڕن، ئێستا ئەوان ڕۆیشتن كەچی ئێوەش خۆتان لەمن ون كردووە.

وەرماش: وانییە ماكوان دوور و نزیك ئاگام لێتە، بەڵام حەزم نەكرد ئیزعاجت بكەم، ئاگادار بووم كە سیامەندت ڕسوا كرد.

ماكوان: ئاخر ئیحترامی تۆم لابوو دەنا دەمكوشت، كە وتی ویرسان وتوویەتی سیحری لێبكە و تۆش پێچەوانەی ئەو بوویت، ئیتر زانیم بۆ هاوڕێیەتی دەزانیت لەبەر تۆ خاترم گرت، تەنها كەمێك ئازارمان دا، ئەگەر تۆ نەبوویتایە زۆر خراپترم لێ دەكرد.

وەرماش: دڵنیابە لەوە زیاتر هاوڕێیەتیت دەكەم و دڵسۆزت دەبم كە خۆت بیری لێ دەكەیتەوە.

ماكوان: سوپاس دەزانم، ئەی كوا ئەوەی پێم وتی بۆت كردم؟

وەرماش: ئەوە لەبیر بکە، بە من و دەسەڵات و خەڵکەکەم ناکرێت.

ماکوان: ئەی تۆ خۆت نەتوت چیت دەوێت داوای بکە؟

وەرماش: بەڵی، بەڵام وەکو وتم ئەوەم پێ ناکرێت.

ماکوان: ئەی من داوای چی بکەم، هەرچی داوا بکەم و تۆ بڵێی ناتوانم. ئەی کاری چی بکەین بەیەکەوە، من و تۆ بۆ هاوڕێین بۆ ئەوەی هاوکاری یەکتر بین.

دەمزانی ئەوان چاوەڕێی ئەوە دەکەن من داوای شتیکیان لێ بکەم تا ئەوانیش داوای خۆیان بکەن.

وەرماش: باشە ئەم جارە داوایەکی تر بکە، تا بۆت بکەین.

ماکوان: ئاخر ئێوەش بوون بە وەعدی ئەندام پەرلەمانەکان، ئەوانیش تا ئەچنە پەرلەمان پڕۆژە و بەرنامەی جوانیان پێیە، کە چوونە ئەوێ هەموو پڕۆژەکانیان ئەبێتە تۆز و با!، ئێوەش لەگەڵ مندا وان، باشە پێویستم بە ئەڵماسی کێوی نوورە.

وەرماش: ئەوەی باسی دەکەیت نازانم چییە؟

ماکوان: ئەڵماسی کێوی نوور لەسەردەمی ساسانی و بوهەییەکانەوە تا سەفەویەکان و زەندییەکان لە ئێران بووە، بەڵام ئیستا نازانرێت لە کوێیە، ئەڵماسەکە ناسراوە بە ئەڵماسی کیوی نوور.

وەرماش: (هەناسەیەکی هەڵکێشا) باشە کاتم بدەرێ بزانم چییە و چۆن بیدۆزینەوە بزانین لەکوێیە؟

ماکوان: فەرموو کاتی خۆت وەربگرە، بەڵام تکایە زوو وەڵام بدەرەوە ئەوەندە خۆت بەدوور مەگرە وەرماشی هاوڕێم، باشە؟

وەرماش: هاوڕێیەتی و سەرچاو و سەرسەرم، داواکانت قورسن.

ماکوان: داواکانم ئاسانن، ئێوە توانای کردن و هاوڕێیەتیتان نییە.

# داوای ترسناکی کرۆنیکا

لەگەڵ وەرماش بەردەوام بووین لە گفتوگۆکەمان، من دەمویست سێ مانگ کاتی پێ بەسەر بەرم، چوونکە داوای شێخ بەرقان بوو. هەرچەندە هۆکارەکەیم نەدەزانی، بەڵام دەمزانی ئەم دە ڕۆژەی لەبەردەممدا مانگی شەعبانە، کە مانگی دوای ئەوە ڕەمەزانە. دڵنیابووم لەوەی کە مانگی ڕەمەزان هەموویان دووردەکەونەوە لە موسوڵمانان و زیندانی دەکرێن بە ئەمری خوای پەروەدگار، دەشمزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەی سەحیح دا باسی کردووە، چوونکە ئەو مانگە ئەوەندە بەهێزە لە ڕووی تاقە و وزەی ئیمانەوە کە شەیتانەکان لەئاستی موسوڵماناندا هەموو زیندانین و کەلەپچە دەکرێن.

زۆر باشیش دەمزانی کە وەرماش درۆ لەگەڵ من دەکات، منیش هەموو قسەکانم دوور بوون لە ڕاستییەوە بەهەمان کرداری ئەوم دەکرد، هەرچۆن بوو دەمویست یاری بکەم لەگەڵی بەهەمان شێوەی خۆی، وەرماش بەردەوامبوو لەگەڵم.

وەرماش: ماکوان هەوڵئەدەم ئەم جارە زۆر گرنگی بدەم بەم داوایەت، هەرچیم کردووە بۆت پەیدا دەکەم.

ماکوان: دەی خۆشحاڵم دەکەیت ئەگەر وابێت، متمانەی تەواو لەنێوانماندا دروست دەبێت، بەڵام ئەی ئەگەر نەتکرد؟

وەرماش: ئەگەر نەمکرد دوو داوا بکە یەك لەدوای یەك لە داهاتوودا.

ماکوان: نا، شتی واناکەم، ئەوە لە ئێستاوە پێم دەڵێیت لەتوانامدا نییە.

بۆ ئەوەی کارەکەم بە جددی بۆ بکەیت ئەلێم ئەگەر نەتتوانی بۆم ئەنجام بدەیت، ئەوا چوار داوا بەداوایەکی ئێوە دەکەم، باشە؟

وەرماش: با سیان بێت.

ماکوان: باشە لەبەر خاتری تۆ با سیان بێت، بەڵام لە یەك مانگ زیاترت پێ نەچێت، ڕازیت؟

وەرماش: مانگێك زۆرە زووتر هەوڵت بۆ ئەیەم.

ماکوان: پەلە مەکە و بە هێمنی بگەڕێ، وەڵامەکەم بۆ بهێنەوە.

وەرماش: باشە من دەڕۆم قسە دەکەینەوە.

ماکوان: چاوەڕێم...

تۆپەکەم خستە گۆڕەپانی ئەوان، دەمزانی ئەوەی من داوای دەکەم ناوی هەیە، بەڵام بوونی نییە و دیارنەماوە، دەیان وڵاتی گەورەی وەك بەریتانیا، فڕەنسا، ئەمەریکا، یابان و ڕووسیا بەشووێنیدا دەگەڕێن، کاتی خۆی لە ئێران بوو لە نێوانی زەندی و شاعەباسی سەفەویدا پرتوگالیەکان ون بووە، تا ئەم ساتەش بەشووێنیدا دەگەڕێن.

خۆ ئەگەر دۆزییەوە من داوای دەکەم بۆم بهێنێت کە ئەوەش نەك لە سەرسوڕینەرەکانی جیهانە، بەڵکو ئاستەمی ئاستەمەکانە.

چووم بۆلای کاوە بۆ غەسلەکەی بەختیار، کاوە ببوو بە وەستا و بەختیاریش ڕۆشتبووەوە بۆ کوردستان. بەکاوەم وت: بەڕاست ئەچیت بۆ حەج؟

کاوە: لەو ڕۆژەوەی پێت وتوم خەوی پێوە دەبینم، بەڵی ئەچم، بەڵێ ئەچم، چەند جار ئەتەوێت بۆت دووبارە دەکەمەوە.

ماکوان: هەوڵ بە تا سێ چوار مانگی تر ٣٠ هەزار کرۆن کۆبکەرەوە، باقی لەسەر من پارەی حەجەکەت بۆ دابین دەکەم، تۆ تەنها ئەو پارەیەی لەوی بەکاری دەهێنیت بۆ پێداویستی و مەسروفاتی خۆت کۆ بکەرەوە، باشە؟

کاوە: باشە، بەڵام لێت تێناگەم ئەمە لەبەرخاتری منە؟

ماکوان: نا لەبەرخاتری کرۆنیکایە.

کاوە: پێم ڕائەبوێریت؟

ماکوان: نەبەخوا بەجددیمە، تۆ لەگەڵ ئەو دەنێرم بۆ حەج، ئەو ڕۆژەی کە چووین بۆلایان تۆ و کرۆنیکا ڕۆیشتن، من لەگەڵ دایکی باسی ئەوەمان کرد، هەندێك شتی تایبەتی تر. ئەو ئافرەتە پیرە گوناهە حەز بە چوون بۆ حەج دەکات، مناڵەکانی خۆی بینیت چۆنن، بێ قیمەتن. جا تۆ حەجی خۆت دەکەیت، بەپارەی ئەو پاشان هاوکاری دەکەیت هەموو خێر و ئەجر و پاداشتە، ئەگەر نایکەیت خەڵکی تر زۆرە، لەپێش هەموویانەوە تۆ بڕیار بدە، بە بەڵێ یان نەخێر.

کاوە: بەڵێ، ئەو ژنە وەك دایکم ئەیخەمە سەرچاوم دەیبەم و دەشیهێنمەوە، بەڵام لە حەج نازانم، فێرم دەکەیت؟

ماکوان: بێخەمبە هەموویت فێر دەکەم لە یەکەم هەنگاو تا گەڕانەوەت بۆ غەسلەکە.

زۆر خۆشحاڵ بووم بە ڕازی بوونی کاوە، هەر لە غەسلەکەوە تەلەفۆنم کرد بۆ کرۆنیکا و وتم دەمەوێت لەگەڵ دایکی بەڕێزت قسە بکەم.

کرۆنیکا: ئەی لەگەڵ منی بەڕێز بۆ قسە ناکەیت؟

ماکوان: تۆ پێویستت بە من نییە، خاوەنی فرانکی خۆتیت.

کرۆنیکا: حەزت دەکرد لەجێگای ئەو بوویتایە ماکوان، دەستم لەناو دەستی تۆ بوایە؟

ماکوان: قسەی بێمانا مەکە و دایکتم بدەرێ کارم پێیەتی.

تەلەفۆنەکەی دایە دەستی دایکی، دوای هەوال پرسین وتم مژدەی خۆشم پێیە بۆت، حەجەکەم بۆ ڕێکخستوویت، بەپشتیوانی خوا ئەمساڵ دەچیت بۆ حەج، بەڵام بە ئاوات و کرۆنیکا بڵێ کە من کارەکەت بۆ دەکەم و ئەو کەسەش کە دێت لەگەڵت کاوەیە وەکو برای من وایە و کوڕێکی ئازا و بەهێز و چاوکراوەیە و متمانەم پێیەتی وەکو خۆم.

فاتمە: ڕۆڵە ئەوەندە دەڵێم ڕەحمەت لە دایك و باوکت.

دوایی ماکوان: بە پێکەنینەوە، ئەی خۆم؟!

فاتمە: جا باوکەکەم خۆت هەر ڕەحمەتیت، قەزات لێم.

پێش ئەوەی ماڵئاوایی لێ بکەم بۆم دووبارە کردەوە کەوا ئەو مەسروفاتی خۆی دەکات، تۆ تەنها پارەی حەجەکەی بۆ بدە، فاتمە خان وتی وەڵڵا ڕۆڵە مەسروفەکەشی لەسەر من.

پێم وت کێشە نابێت، پارەکەشتم ناردەوە بۆ کوردستان کە لەوێ بییەن بە منالی بێ باوك و خانمانی بێسەرپەرشت..

فاتمە: ئەی کەی دێیت بۆ ئەوەی پارەکەی ترت بدەمێ؟

ماکوان: جارێ، کاتی نووسینی ناوەکەت بۆ حەج یەکتر دەبینین بە پشتیوانی خوا.

فاتمە: باشە باوکەکم، خوا حافیزت بێت.

ڕەمەزان نزیك بوو خەریکی خۆ ئامادە کردن بۆ مانگی ڕەمەزان بووم، چالاکی و وتنەوەی وانە و نووسین و ڕێکخستنی ستافەکەم زۆر سەرقاڵی کردبووم، هەروەها لە مزگەوتیش سەرقاڵی ئیدارە و کار و چالاکییەکان بووین، ئێوارەیەکی درەنگ پێش نوێژی مەغریب سەسیل و میا هاتن بۆلام.

دوای سەلام و ئەحواڵ پرسی، سەسیل پیدەکەنی و دەیوت ئەم شتانە لە کوێ پەیا دەکەیت، ئەڵماسی کێوی نوور؟! قاقای لێ ئەیا.

ماکوان: سەسیل پرسیارێك توخوا ڕاست وەڵام بەرەوە، ئەم شتانە کە ڕووئەدات لەنێوانی من و وەرماش تۆ چۆن یەکسەر دەیزانیت، وەرماش تۆ نابینێت؟

سەسیل: وەڵڵاهی هەر من نیم هەموو جەماعەتی خۆمان دەیزانن، شێخ بەرقان و ڕاقی و حەزقیل و هەموو زانیویانە بەو حیوارەی نێوان تۆ و وەرماش.

ماكوان: ئاخر چۆن؟

سەسیل: كە وەرماش دێتە لات ئەوان دوای ئەوە مەجلیسێک دەگرن و ئەوەی لەگەڵ تۆ باسكراوە شیكاری بۆ دەكەن، كەسێك لەناو ئەو مەجلیسەدا كار بۆ شێخ بەرقان دەكات، لە ڕێگای ئەوەوە هەواڵەكەمان پێ دەگات.

ماكوان: ئەی هەواڵ چییە لەو مەجلیسە لەسەر من؟

سەسیل: ئەمجارە وەرماش وتوویەتی ماكوان تینووە بۆكاركردن لەگەڵمدا، بەڵام داواكانی زۆر قورس و سەخیفن و بێ مانان، وەرماش دەڵێت یان ماكوان تاقیمان دەكاتەوە یان داوای شتی ئاستەم دەكات، تا ئێمە كاری نەدەین بەسەردا.

ماكوان: كەواتە تا ڕادەیەك دەزانن منیش یاری دەكەم لەگەڵیاندا؟

سەسیل: نا دڵنیانین، بەڵام چاوەڕێی هەلێكن بۆ قۆستنەوەی.

ماكوان: هەلی چی؟

سەسیل: كرۆنیكایەك، سیحرێك، تاوانێك، غافڵ بوونێك لەخوا...هتد.

ماكوان: خوای گەورە پشتوپەنامان بێت و فریامان بكەوێت لەدەستی شەیتانان، آمین.

سەسیل: جەماعەت سڵاویان لێ دەکردیت و دەیان وت با مزگەوتەکە بگۆڕێت بۆ قسەکردن لەگەڵماندا بەتایبەت لەگەڵ کازۆڵ، نەوەکو پێیان بزانن.

سەسیل: بەدڵنیاییەو لە مزگەوت دا نامێننەوە، بەڵام دێن بۆ وەسوەسە و سەرلێشێواندنی خەڵکی و دروستکردنی کێشە بۆ موسوڵمانان.

ماکوان: وەڵڵا بەلامەوە سەیرە کازۆڵ بۆیە ئێرەی هەڵبژارد کە ئەوان ناتوانن بێنە مزگەوت.

سەسیل: کازۆڵ لەگەڵماندایە..

وەڵڵا کە هەرواى وت کازۆڵ پەیا بوو...

کازۆڵ: بەڵێ من وام وت، ئێستاش بەردەوامم لە سەر قسەکەی خۆم. شەیتان ناتوانن لێرە بمێننەوە، دێن و دەڕۆن تەنها لەکاتی نوێژی جەماعەت و بۆنەکانی موسوڵمانان لە مزگەوت کۆ دەبنەوە.

ماکوان: تێناگەم، وامزانی شەیتان ناتوانیت بچێتە مزگەوت و ماڵی خوا!

کازۆڵ باسی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺی بۆ کردم کە لەوانەیە بەهەزاران جار لە مامۆستایان و مەلاکان گوێم لێ بووبێت و خۆشم دووبارەم کردۆتەوە، بەڵام کە باسی کرد سبحان الله وەکو وا بیت یەکەم جارم بێت گوێم لێبوبێت.

فەرموودەکەش دەفەرمووێت: شان بنێن بە شانی یەکترییەوە و پاژنەی پێکانتان بنێن بە پاژنەی یەکترەوە، قولە پێتان توند بکەن لە قولەپێی یەکتر چوونکە شەیتان دەبینم بە نێوانتاندا دەڕوات.

لە مزگەوتی پێغەمبەردا شەیتانەکان هەبوو لە نیوانی هاوەڵلاندا وەسوەسە و دڵەراوکێیان دروست دەکرد، موسوڵمانانی ئێستا چۆن بەوان پێوەر دەکرێن.

ماکوان: وەڵلاهی ڕاست دەکەیت، تاکە مەرجی نەچوونی شەیتان بە نیوانی موسوڵمانان و دروست نەبوونی دڵەڕاوکێی و وەسوەسە لە نوێژدا شان نان بەشانی یەکتر و قولەپێ توند کردنە لە یەکتری.

سەسیل: جا لەبەر ئەو هۆکارە جاروبار بڕۆ بۆ مزگەوتی (لیشلەبی).

ماکوان: بەسەرچاو ئەمجارە وا دەکەین، خوا جەزای خێرتان باتەوە.

کاتی نوێژی مەغریب بوو، وردە وردە مزگەوت قەرەباڵغ بوو، سەسیل و میا و کازۆڵ ڕۆیشتن.

بەرەو ماڵ دەگەڕامەوە دوای نوێژی مەغریب،لە ڕێگا تەلەفۆنی کرۆنیکام بۆ هات، گوێم لە دەنگی بوو دەگریا.

ماکوان: ئەوە نەخۆشی لووتت گیراوە یان دەگریت؟

کرۆنیکا: نا، دەگریم زۆر بێتاقەت و بێزارم.

ماکوان: دایکت سەلامەتە، هیچ ڕووی نەداوە لە دایکت؟

کرۆنیکا: نا ئەو عەیبی نییە.

ماکوان: الحمد لله، ئەی تۆ چ دەردێکتە؟

کرۆنیکا: فرانک دەیەوێت بمبات بۆ بولگاریا لەوێ یاریم پێ بکات.

بڕیار بوو شەش کچی هیندی ببات، پێنجی دەست کەوتووە دانەیەکی کەمە من دەبات لەجیاتی، بۆ ئەوەی فینالی ئەمجارە بەمن بکات.

ماکوان: جا کەی ئەوە کێشەی منە، خوای دەکرد فینالی دە جاری پێ دەکردیت، واتا دەرخواردی سەگ و گورگ و ورچی ئەیات؟

کرۆنیکا: بەڵێ، چۆن ئەزانیت؟

ماکوان: ئەو پارە زۆرەی لەسەر حسابەکەتە و ئەو سەیارەی پێتە دەبێت باجەکەی بدەیت، ئێوارەیەکی خۆش، بە ئاواتی برات بڵێ فریات بکەوێت.

کرۆنیکا: باشە ئاگات لە دایکم بێت، سوپاست دەکەم.

ماکوان: دایکت، دایکی منە.

کرۆنیکا: بۆ دواجار دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم، تکایە دڵم مەشکێنە.

ماکوان:باشە بەسەرچاو، بەس دایکتم بەرێ با قسەی لەگەڵ بکەم.

کرۆنیکا: ئەوەتا ئەویش هەر دەڵێ بمدەرێ با قسەی لەگەڵ بکەم، فەرموو ئەوە دایکمە.

فاتمە: باشی ماکوان گیان، چۆنی باوکەکەم؟

ماکوان: فاتمە خان تۆ چۆنی باشی شووکر، تەندروستیت باشە؟ مژدەیەکی خۆشم پییە بۆت.

فاتمە: باوکەکەم خۆش موژدە بیت، هەر تۆ چاك بیت و قسەم لەگەڵ بکەیت بۆ من موژدەیە.

ماکوان: خوای گەورە سەربەرزی دنیا و قیامەتت بکات، چوونی حەجەکەتم ڕێکخست، لەگەڵ کۆمپانیاکە قسەم کرد، داوای پاسپۆرت و ئەدرەسی نیشتەجێ بوونی دەکەن، هەمووی ئامادە بکە و دەرزی ئەنفلۆنزا لەخۆت بە، کە دەرزییەکەت لەخۆتدا، وەرەقەیەکیان لێ وەربگرە وەکو بەڵگە بۆ ئەوەی تەسلیمی کۆمپانیاکەی بکەم، چوونکە ئەوان بیمەت دەکەن.

فاتمە: هەموویت بۆ ئامادە دەکەم، بەسەرچاو ماکوان گیان، لەم وڵاتە بێ کەسم، چیمەن برای لێرە نییە و تۆش فەرقت نییە برای ئەویت، لە بەیانییەوە دەگری و هیچم پێ ناڵێت، کوڕەکەم یارمەتی چیمەن بە لەبەر خوا، توخوا زۆر بێکەسین.

ماکوان: بەسەرچاو فاتمە خان، بەڵام بۆ پاسپۆرتەکەت و وەرەقەکانی تر تا پێش جەژنی ڕەمەزان کاتمان هەیە، بۆ چیمەنیش ئەگەر من بە برای خۆی بزانێت، ئەوەی بوێت بۆی دەکەم، بەڵام ئەویش دەبێت بە قسەم بکات.

فاتمە: وەڵڵاهی چیمەن تۆی زۆر خۆش ئەوێت، باوکەکەم دڵنیا بە کە بە قسەت دەکات، لە منەوە وەعد بێت.

ماکوان: لەبەرخاتری تۆ لە خزمەتیدام، وەکو خوشکەکانی خۆم تەماشای دەکەم، ئەگەر ڕازی بێت بە برایەتی من.

فاتمە: ڕۆڵە خوا لە ئێمەت نەسێنێت، ئەوە چیمەنە لەگەڵت قسە دەکات.

تەلەفۆنەکەی دوور خستەوە لە دایکی و بە کوڵ دەگریا.

کرۆنیکا: ماکوان: تۆ چی بڵێیت لە قسەت دەرناچم، بەس با تەنها بەیانی بتبینم و قسەی دڵمت بۆ بکەم.

ماکوان: بەیانی دوای کار من دەچم بۆ ئۆسلۆ، وەعدم داوە بە ماڵومناڵ شیرینییان بۆ بکڕم، مەجالم نییە. بیخەرە کاتێکی کە.

کرۆنیکا: منیش دێم بۆ ئۆسلۆ لەوێ چاوەڕێت دەکەم!

ماکوان: بەڵام دەستێك جلی داپۆشراو لەبەر بکە، لە ئۆسلۆ خەڵك من زۆر دەناسن، وەڵڵاهی تەریق دەبمەوە بەو جلوبەرگەوە لەگەڵ مندا بیت.

کرۆنیکا: باشە بەسەرچاو.

ناونیشانم دایە و ماڵئاوایم لێکرد، بەیانی چووم بۆ کار کە تەواو بووم ڕاستەوخۆ بەرەو ئۆسلۆ بەڕێ کەوتم، لە ڕێگادا تەلەفۆنم بۆ کرد و پێم وت لە کوێیت؟

کرۆنیکا: لە ئۆسلۆم لە شەقامی کارل یۆهان.

ئەو ناونیشانەی کە پێم دابوو گۆڕیم بانگم کرد بۆ جێگایەك بازاڕێکی گەورەی ناو سەنتەری ئۆسلۆیە بەناوی (ئۆسلۆ سیتی).

لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم لەناو بازاڕ قسەم دەکرد لەپڕ ئافرەتێکی موحەجەبە دەرکەوت. کوڕە هاوڕێکانم تەماشایان دەکرد لە جوانیدا، منیش ئۆتۆماتیکی چاوم چووە سەری و سەرم داخست.

کەچی لێمان نزیك بوویەوە و سڵاوی لێکردین، وتی کاك ماکوان باشی؟

سلاوی لە هاوڕێکانیشم کرد.

کە لێی ورد بوومەوە سەیرم کرد ئەمە کرۆنیکایە و بە حیجابەوە لەجاران جوانتر بوو، من بەدیارییەوە تفم قووت ئەدا، پرسیم ئەرێ تۆ چیمەنی؟

کەوام وت هاوڕێکانم بەجێیان هێشتم، منیش وتم (ماشاءالله، تبارك الله أحسن الخالقین)، تەماشی خۆتت کردووە چەندە جوانی بەم جلانەوە، بە ڕاستی تۆ کرۆنیکایت؟

کرۆنیکا: لەبەر خاتری تۆ لەبەرم کردووە، خەریکە ئەخنکێم.

ماکوان: ئەی بەخێر نەیتەوە وامزانی ئەڵێی تەوبەم کردووە و تەواو ئیتر بەردەوام وا دەمبینیت.

کرۆنیکا: جارێ دادگایم مەکە، با بچینە جێگایەك دابنیشین، ئەوە بۆ ئەوەندە ئاغا و دەرەبەگانە لەگەڵم ڕەفتار دەکەیت؟

ماکوان: هەرخۆم ئاغام و عیززەتی نەفسم هەیە، تۆ وا هەست دەکەیت، ئەگەر واش بم خۆ کەس هەڵناخلەتێنم و کەسیش نافرۆشم وەکو کوردەواری دەڵێت خەنجەریش لە پشتی کەس نادەم.

کرۆنیکا: هیچ جێگایەکت حیجز کردووە بۆ ئەوەی دابنیشین؟

ماکوان: نەوەڵڵا من کوڕی هەژارم، ئەچینە ئەو قاوەخانەیە دادەنیشین.

کرۆنیکا: باشە بابڕۆین.

ماکوان: فەرموو، ئەوە بۆ وا سترێسی کرۆنیکا؟

کرۆنیکا: زۆر حاڵم خراپە، تکایە گوێم بۆ بگرە، ئەم دانیشتنە وەکو وەسیەت وایە بۆت دەکەم.

ماکوان: بۆ بەتەمای بمریت؟

کرۆنیکا: بڕوا بکە زۆر جدیم، تکایە با بچینە جێگایەك دابنیشین.

ماکوان: فەرموو، بچینە ئەو قاوەخانەیە.

کرۆنیکا: ماکوان تکایە لەگەڵم وەرە چەند دەقیقەیەك دەچینە کافتریای هوتێل (SAS)

ئەوێ هێمنە، ئێرە بازاڕە و نە گوێت لێم دەبێت و نەگوێم لێت دەبێت کاتێك قسە دەکەین.

ماکوان: بۆ کەڕی؟ باشە بابڕۆین، لەگەڵیدا چووم بردمیە کافتێریایەك کە بەرزترین باڵەخانە بوو لە نەرویج، کافتێریاکە لە نهۆمی کۆتاییدا بوو، لە ژیانمدا یەکەم جارمبوو شووێنی وا خۆش ببینم، نزیکەی نۆزدە ساڵە لە نەرویج و شەش ساڵ لە ئۆسلۆ ژیام توانا و بیرم لەوە نەکردبووەوە بچمە جێگا و شووێنی ئاوا، چوونە ژوورەوەکەشی بە پارە بوو، کوپ و پەرداخ و مێز و کورسییەکانی هەموو تایبەت بوو.

هەرچووینە ژوورەوە سەرپۆشی لابرد خستییە ناو جانتاکەی.

کرۆنیکا: ماکوان ببوورە زۆرێك لێرە دەمناسن، ناچارم لایبەم.

ماکوان: ئەگەر لەبەر منە من نامەوێت، بۆ خوا خۆت داپۆشە.

کرۆنیکا: فەرموو ماکوان با دابنیشین، خۆشترین جێگایە هەموو ئۆسلۆت لێ دیارە.

ماکوان: فەرموو قسەم بۆ بکە، کێشەت چییە و چیت دەوێت لەمن؟

کرۆنیکا: سوێندت دەدەم ماکوان، بە چی خۆشت دەوێت، چۆنت زانی ئەو فینالەی باسم کرد، فینالی مەرگە. من بۆیە وام وت بۆ ئەویە سەرنجت ڕابکێشم کەچی خۆت زانیت، چۆن دەزانیت فرانك کاری ئەوەیە؟

ماکوان: جارێ تۆ سوێندم مەیە، چوونکە من سوێند ناخۆم، خوای گەورەشم خۆش دەوێت و سوێند تەنها بەو دەخۆم. دڵنیاش بە پێت ناڵێم، ئەوە سەرچاوەی نهێنی منە.

کرۆنیکا: باشە واتا دەزانی، کە من دەچم بۆ مەرگ و یاریم پی دەکات فرانك؟ یاریەکەش لە بولگاریایە ئەم جارە، هەرچەندە پەیمانی داوە بەمن کە من بەشدار نیم، بەڵام دەزانم کۆمپانیاکەی لە نەرویج زۆر قەرزارە. دەیەوێت خۆی هەڵبسێنێتەوە، کەسێکی درۆزنە لێی دەترسم.

ماکوان: ڕاستیت دەوێت حەز دەکەم بڕۆیت و من و دایکیشت نەجاتمان بێت بەدەستتەوە، پڕ بەدڵ حەز دەکەم بڕۆیت و سەگ و گورگ یان پڵنگێك بتخوات، هەروایە ئەوە ڕاستی فەلسەفەی (کارما)یە.

کرۆنیکا: تۆ بڕوات بە (کارما) هەیە؟

ماکوان: نەوەڵڵا لای من قسەی قۆڕە، بەڵام وتم بەڵکو هەست بەهەڵەی خۆت بکەیت، ئەی نەتدەزانی ئەو پارەیەی دەستت دەکەوێت لەلایەن فرانکەوە هەمووی پارەی خوێن و لەشفرۆشییە؟!

کرۆنیکا: کاتی دادگایی نییە، ئەزانم هەڵەم، هیچوپوچم، هاوکاریم بکە چی بکەین؟

ماکوان: من چیم پێ دەکرێت بۆت بکەم؟ دەتوانیت لەگەڵی نەڕۆیت خۆ بەزۆر نییە، بڵێ نایەم، ئەو خوات؟

کرۆنیکا: ناتوانم بڵێم نایەم و چی پارەشی داومەتێ بۆی بگەڕێنمەوە، بەڵام دوایی زۆر بەئاسانی لەناوم دەبات، دەڵێت باشە مەیە، بەڵام لەناوم دەبات، بەدڵنیاییەوە.

ماکوان: ئەوەندە بەهێزە؟

کرۆنیکا: لەئەوروپادا یەکێکە لەوانەی کە خاوەنی پێشانگای سەیارە کۆنەکانە و سەیارەی پۆرش و فێراری و لامبورگینی دەکڕێت و دەفرۆشێت. لەوانەیە ٢٠ لیتوانی و ڕووسی لەبەردەستی دابێت، خەڵکیان پێ لەناو دەبات.

ماکوان: ئەگەر وابێت ئەمە زۆر خەتەرە، ئەی نەرویج و پۆلیس دەرەقەتی نایەن؟

کرۆنیکا: ئاخر خۆ نەرویج بەڵگە و دۆکۆمێنتی لەبەر دەست نییە.

ماکوان: تۆ دەکەین بە بەڵگە و لەڕێگای تۆوە پۆلیس ئاگادار دەکەینەوە تا بیخەنە ژێرچاودێری و ئاگاداری کارەکانی بن.

کرۆنیکا: ئاخر خۆ لە نەرویج هیچی لەسەر نییە، لە بولگاریا ئەو یارییە ئەنجام ئەدرێت، لە نەرویج نییە، ئەویش کۆمپانیای گەورەن لە ژێر ناوی نهێنی خۆیان شاردۆتەوە، بۆ زانیاریت کاتێک کە سەفەر دەکات ڕاستەوخۆ لە نەرویجەوە ناڕوات بەڵکو یان دەچێتە دانمارك یاخود سوید لەوێوە دەڕوات.

ماکوان: سەیرە، باشە کەی بەتەمان سەفەر بکەن؟

کرۆنیکا: بڕیاری داوە لەم هەفتەیەدا بڕۆین.

ماکوان: بلیتتان بڕیوە؟

کرۆنیکا: ئەو دەیبڕێت، کات و ڕۆژ نازانم من، هەر ئەوەندە وتی خۆت ئامادە بکە، بەخوا زۆر دەترسم.

ئەم قسانەی بەدەم گریانێکی بەکوڵەوە دەکرد، فرمێسکەکانی لە مرواری دەچوون بەسەرڕوومەتیەوە، زۆر بەزەیم پیا دەهاتەوە.

ماکوان: خوای گەورە ئاسانی بکات، من نازانم تۆ تەڕەفی کێیت؟

کرۆنیکا:من تەرەفی تۆم!

ماکوان: کێشەکە لەوەدایە کە من تەرەفی خوام.

کرۆنیکا: ئەی کێشە چییە؟

ماکوان: تۆ تەرەفی شەیتانی.

دەستی کرد بە گریان، پێم وت مەگری، ئێستا پۆلیسم بۆ بانگ دەکەن وا دەزانن من شتێکم لێکردوویت، کەم چڵم هەڵبلوشە.

کەوام وت بە دەم گریانەوە دەستی کرد بە پێکەنین.

ماکوان: ئەگەر هەرچیم وت بەقسەم دەکەیت؟

کرۆنیکا: بەچی بڕوات هەیە لە قسەت دەرناچم، باشە.

ماکوان: باشە تەنها وەڵامی پرسیارەکانم بەرەوە هیچی ترم ناوێت، تەنها ڕاستگۆ بە.

کرۆنیکا: دڵنیابە درۆت لەگەڵ ناکەم.

ماکوان: پرسیارەکانم دەربارەی فرانك-ه، سەرەتا دەمەوێت بزانم لە نەرویج دوژمن و ڕکابەر و موونافیسی هەیە، یان خەڵکێك هەیە ڕقی لێی بێت، شتی وا دەزانیت هەبێت؟

کرۆنیکا: زۆرن ئەوانەی لە نەرویج ڕقییان لێیەتی، بەڵام پێی ناوێرن.

ماکوان: تەواو من ئەوەندەم بەسە، بە وردی بۆم باس بکە دوایی پێت دەڵێم چی بکە.

کرۆنیکا ناوی دوو خانەوادەی وت لە نەرویج کە دژی ئەون، بە وردی بۆی باسکردم، هەرچەندە زۆر پێویستم پێی نەبوو بەو زانیاریانە، بەڵام سوودم لێوەرگت. لەوەی کە ٨ ملیۆن کرۆن قەرزاری ئەو دوو خانەوادەیە. تەنها ئەو زانیارییەم بەس بوو، بەڵام لەویا هیچم بە کرۆنیکا نەوت.

ماکوان: جوان گوێ بگرە چیت پێ دەڵێم، خۆت وا نیشان بە زۆر خۆشحاڵیت، زۆر ئاسایی بە لەجاران باشتر. با هیچ هەست نەکات بێزار و بێتاقەتی، بە پێچەوانەوە تەلەفۆنی بۆ بکە و بڵێ کەی دەڕۆیت؟

کرۆنیکا: ئەوە تۆ دەڵێیت چی؟

ماکوان: ئاقڵ بە بە قسەم بکە، متمانەت بە منە؟

کرۆنیکا: بەڵێ متمانەم پێتە و لەتۆ دڵنیام.

ماکوان: زۆر باشە هەڵسە با بڕۆین کات دڕەنگە، دڵنیابە چارەسەرێکی کاتیی باشم دۆزیوەتەوە.

کرۆنیکا: کاتیی؟

ماکوان: بەڵێ کاتیی، ئەی خۆ ناتوانم بڕۆم فرانك بکوژم یا کۆتایی بەهەموو شتەکان بهێنم، بە دڵنیاییەوە کاتییە، گرنگ ئەوەیە تۆ نەڕۆیت بۆ بولگاریا، بەڵام با نەزانێت کە تۆ دەستت تێدایە، بەڵکو بە پێچەوانەوە وا بزانێت تۆ زۆر حەز دەکەیت کە هاوسەفەری بیت و لەگەڵی بیت، تەنانەت داوای پارەی لێ بکە کە دیاری و جلوبەرگ دەکڕیت.

کرۆنیکا: ئاخر چۆن، توخوا شێتم مەکە.

ماکوان: جا تۆ شێتی ئەترسم وا هەست بکەیت و بڵێیت ئاقڵم (بەپێکەنینەوە).

هەستم کرد هێمن بوویەوە زۆر متمانەی بە من بوو.

کرۆنیکا: ماکوان تا ئەم چرکەساتەی بەیەکەوەین هیچت بە قسە نەکردووم، ئەوەی خۆت ویستوتە کردووتە، دەشزانم هەمووی لەبەرژەوەندی من بووە. تەنها یەك داوات لێدەکەم ئەزانم تۆ پێویستت پێی نییە و زۆر پیاو سالاریت، تەنها هاوکاریم بکە لەم داوایە.

ماکوان: (بەپێکەنینەوە) فەرموو خانمە دەرگیزی چیت دەوێت.

کرۆنیکا: دوو کارتی بانکم هەیە یەکێکیان ٦٠٠ هەزار کرۆنی لەسەرە ئەی تریش ٣٠ هەزار کرۆن ماستەرکارت و ڤیزە کارتە، با هەردووکیان لای تۆ بێت.

ماکوان: ئەی بۆ نایدەیت بە دایکت، بۆ ئەیەی بە من، من چی لێبکەم.

کرۆنیکا: ئەزانم تۆ خەڵك زۆر دەناسیت، حەتمەن ئەو پلانەش پێویستی بە پارەیە، جا تکام وایە لێم قبوڵ بکەیت.

ماکوان: دڵنیابە لە پلانەکەمدا بەیەکەوەین کە پێویستم پێ بوو داوات لێ دەکەم.

کرۆنیکا: وەعدی ماکوان.

ماکوان: بەتوڕەییەوە، وەعدی ماکوان چییە؟

کرۆنیکا: بەخوا ماکوان من زۆر بە پیاوت دەزانم، تۆش هەرچی جارە ئەڵێیت وەعدی پیاو، بۆیە ئەڵێم وەعدی ماکوان واتا وەعدی پیاو.

ماکوان: وەعدی ماکوان، با بڕۆینەوە دڕەنگە،ماڵومنداڵ چاوەڕێن.

کرۆنیکا: چاوی مناڵەکانت ماچ دەکەم، ناویان چییە؟

ماکوان: ئانا و لین، سوپاس بۆ تۆ، کە دەرچوویت بۆ ستۆکهۆڵم ئاگادارم بکەوە و عیلاقەی هیچت نەبێت.

کرۆنیکا: توخوا دەستم لێ بەرمەیە.

ماکوان: بێخەمبە.

ماڵئاوایم لێکرد و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، هەر ئەو شەوە جانتای جلم ئامادەکرد و خستمە ناو سەیارەکەم حازر بووم بۆ سەفەر، چاوەڕێی ئەوە بووم کە کرۆنیکا پەیوەندیم پێوە بکات، ماوەی ١٥ ڕۆژ پشووووم وەرگرت لەسەر کارەکەم، خێزانم ئاگادار کردەوە کە سەفەر دەکەم لەم ڕۆژانەدا کاری زەروورم هەیە لەسەر پێ بووم.

لەدوای دوو ڕۆژ لە دانیشتنەکەم لەگەڵ کرۆنیکا، ئێوارەیەك تەلەفۆنی بۆ کردم وتی بەیانی سەعات ١٠ فرانك دێت بە شووێنمدا و دەچین بۆ ستۆکهۆڵم نازانم کەی فڕۆکە دەڕوات.

ماکوان: زۆرباشە زۆر ئاساییە، بەڵام هەمیشە لە پەیوەندیدا بە لەگەڵ من، کە مەجالت هەبوو پێم بڵێ لەکوێیت گەیشتویتە کوێ لەشارو شارۆچکەکانی سوید، من دەڕۆم بۆ ستۆکهۆڵم.

## هاوسەرگیری ماکوان و کرۆنیکا

لەدوای ئەوەی ئاگاداری کردمەوە لە ڕۆیشتنیان بۆ ستۆکهۆڵم، پێم وت لە هەموو جێگاکان کە بۆی دەچن ئاگادارم بکاتەوە بەتەلەفۆن، بەنامە، لە فەیسبوك چۆنی توانی و بۆی گونجا دەبێت هەواڵم بداتێ کە گەیشتونەتە کوێ.

شەو پێش دەرچوونیان پلانەکەم بۆ باس کرد و پێم وت کە سەیارەیەك بەکرێ دەگرم، سەیارەی خۆم ناهێنم لە ستۆکهۆڵم ئەیدەمەوە بە کۆمپانیاکە.

بە کرۆنیکام وت کە من کاتژمێر شەشی بەیانی دەردەچم، هەوڵ بدە بزانە فڕۆکەکەتان کاتژمێر چەند دەردەچێت، بۆ ئەوەی من چەند کاتژمێرێك پێش گەیشتنی فڕۆکەکە بگەمە ستۆکهۆڵم. با هەمیشە تەلەفۆنت کراوە بێت، کاتێك شتێکی تایبەتت هەبوو بە گۆرانی پێم بڵێ.

چۆن بەرنامەمان دانابوو ئەنجامی دا، لە چوونیان بۆ شووێنەکان ئاگاداری کردمەوە، ئەوەشی پێ وتم کەوا فڕۆکەکەیان کاتژمێر (٤:٢٠) خولەك دەردەچێت.

من کاتژمێر یەکی دوا نیوەڕۆ گەیشتمە فڕۆکەخانەی (ئایرلەندا) لە ستۆکهۆڵم، ئاگام لێبوو فڕۆکەکەیان کاتژمێر (٢:٣٠) گەیشتە فڕۆکەخانە و کرۆنیکام ئاگادار کردەوە کە لە دواتەوەم، هەوڵ بدە مەچۆ ناو بەشی ترانزێت، خۆت سەرقاڵ بکە بە سەیرکردنی شتەوە لە دوکانەکان، گرنگە نەچیتە بەشی ترانزێت.

ئاگام لێبوو کە بە فرانک-ی وت جارێ زووە، حەز دەکەم بچم لەو ڕێستورانتە نانێك بخۆم، بەڵام پێشتر پێم وتبوو کە هیچ نەخوات لەناو ڕێگا و لە فڕۆکەکەدا، بەڵکو تەحەمول بکات لە فڕۆکەخانە نان بخوات.

فرانك و کرۆنیکا چوونە ناو ڕێستورانتەکە، گوێم لێبوو کە داوای بیرەیەکی کرد پێش نانخواردن، بەتەلەفۆنی ئاگادارم کردەوە ئەگەر بێتو مەشروب بخۆیت ئەوا لێرە بەجێت دەهێڵم، کەوام پێ وت خێرا کارمەندەکەی بانگ کرد پێی وت ببوورە پەشیمان بوومەوە، خواردنەوەکەم دەگۆڕم بۆ کۆلا.

فرانك: بۆ گۆڕیت؟

کرۆنیکا: ئەمەوێت لەناو فڕۆکەکە مەشروب بخۆمەوە، با تامەکەیم لێ تێکەڵ نەبێت.

چەند جار فرانکی دواخست، چوونکە زوو زوو پێی دەوت دڕەنگە با بچینە ناو ترانزێت و گەیتەکە بدۆزینەوە.

منیش بە تەلەفۆنی پێم دەوت دوای بخە چیت پێ دەڵێم ئەوە بکە.

خێرا بچۆ بۆ دەستشۆری و سیم کارتەکەت فڕێ بدە و وەرە دەرەوە.

کرۆنیکا: باشە بابڕۆین، بڕۆ واهاتم بەدواتا دەچم بۆ توالێت، پاسپۆرت و بلیتەکەم بەرێ با بەدواتا بێمە ژوورەوە.

پێم وت خێرا مەڕۆ با چەند کەسێکمان لە نیواندا بێت،جلی زیایەم بۆ کرۆنیکا هێنابوو، چاکەتێکی ڕەش و سەرپۆشێکم بۆ هێنابوو لە کۆڵە پشتەکەمدا بوو.

خۆی کرد بە توالێتەکەدا منیش بەدوایدا، کۆڵە پشتەکەم دایە دەستی، یەك دوو ئافرەت وتیان ببوورە هەڵە هاتوویت، ئێرە بەشی ئافرەتانە، بەشی پیاوان ئەودیووە.

پێم وتن ببوورن، تەنها ئەو کۆلەپشتە دەدەمە دەست ئەو ئافرەتە لە دەرەوە لە بیری چووبوو.

کرۆنیکا خۆی گۆڕی و هاتە دەرەوە، وتم قۆڵ بکە بە قۆڵمدا و ڕۆیشتنی خۆت بگۆڕە، بەپەلە دەرچووین لە فڕۆکەخانە بەرەو ستۆکهۆڵم، کاتژمێر شەشی ئێوارە بوو. کات درەنگی کرد تا سەیارەم تەسلیمی کۆمپانیا کرد و کارەکانیم تەواو کرد، دەنگی خۆمم تۆمار کرد کە بە نەرویجی قسەم دەکرد، ناردم بۆ ستافەکەم کە دەستکاری دەنگەکە بکەن و لە ژمارە تەلەفۆنێکی کوردستان تەلەفۆنیان بۆ فرانك کرد، بەڵام پێم وتبوون با ژمارەکە دەرنەکەوێت، دەنگەکەی منیان بۆ خستبووە سەری و منیش بەم شێوازە قسەم کردبوو...

فرانك هەروا بەئاسانی لەدەستمان دەرناچیت و ڕابکەیت کە هەشت ملیۆنەکەت گەڕاندەوە ئەوا ژنەکەت دەگەڕێنینەوە، دەنگی کرۆنیکاشم تۆمار کردبوو کە بە گریانەوە بە فرانك دەڵێت ئەمکوژن فریام بکەوە).

ئاگادارم کردبوونەوە کە بزانن دوای ئەوە فرانك چی دەڵێت، هیچ وەڵامی مەیەنەوە با ئەو قسە بکات، زوو زوو کۆکەیەك بکەن کە بزانێت گوێی بۆ گیراوە و دەنگەکەیم بۆ تۆمار بکەن، ئەوەشم پێ وتبوون کە کاتژمێر ٩ی شەو بەکاتی ئەوروپا تەلەفۆنەکەی بۆ بکەن.

کاتژمێر نزیکی ٧ی ئێوارە بوو من و کرۆنیکا لەناو سەنتەری ستۆکهۆڵم بەدوای هوتێل دا دەگەڕاین.

ماکوان: باشە لە فڕۆکەخانە کە وتم قۆڵ بکە بە قۆڵما بۆچی وا ئەوەندە بە توندی منت گرتبوو، وات دەزانی من ڕادەکەم؟

کرۆنیکا: بەخوا زۆر دەترسام.

ماکوان: دەی ئێستا قۆڵت لابە و مەیکە بە قۆڵمدا، کۆتایی هات.

کرۆنیکا: ببوورە ئۆتۆماتیکی بوو.

ماکوان: دەی کەوایە ئۆتۆماتیکیش قۆڵت لابەرە.

زیاد لە دوو کاتژمێر گەڕاین بەناو هوتێلەکانی ناو سەنتەری ستۆکهۆڵم هەموو وتیان جێگامان نییە و ئاستەمە بەبێ ڕێزێرڤەیشنی پێش وەختە هوتێل دەست بکەوێت ناو سەنتەر.

لە کۆتاییدا یەکێك پێی وتین ئەگەر بچن بۆ دەرەوەی شار لەوێ مۆتێلەکان یاخود هۆتێلەکانی دوور لە شار جێگا دەست دەکەوێت.

ماکوان: جا من چۆن ئەم هۆتێل و مۆتێلانە بدۆزمەوە؟

کارمەندی هوتێلەکە وتی تەکسی بگرن پێیان بڵێن ئەوان دەتانبەن بۆ ئەو شووێنانە.

زۆر ماندوو و تووڕە بووم، ماندوێتی زۆری بۆ هێنابووم، تەکسیەکمان گرت سایەقەکەی بێگانە بوو، لە خەڵکی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەچوو، پێم وت کە بمان بات بۆ هوتێلێك.

وەڵڵا هێشتا قسەکانم تەوو نەکردبوو، ئاوڕی دایەوە وتی: جەنابت کاك ماکوانیت؟

ماکوان: بەڵێ، بەڕێز گیان من ماکوان-م.

شۆفێرەکە: کە خۆشحاڵم بە بینینت، ئەزانی من چەندە ئاواتم بوو کە بە خزمەتی جەنابت بگەم، من ناوم شێخ عومەر-ە، خەڵکی بەرزنجەم.

ماکوان:من خزمەتکاری جەنابتم، قابیلە من چیم خۆ شێخ مەحمودی حەفید نیم برا.

شێخ عومەر: هوتێلی چی دەچێنە مالی خۆمان، ئەم بەڕێزە خێزانتە؟

ماکوان: بەڵێ، خێزانمە.

دەبوو هەروابڵێم، چوونکە ئەو منی بە ئیسلامەتی ناسیووە ئەی بڵێم کێیە؟ جا خوا رەحمی پێ کردم کە سەرپۆشەکەی هەر بەسەرەوە بوو.

شێخ عومەر: بۆ وا ماندووی کاك ماکوان.

ماکوان: کاکە شێخ گیان لەگەڵ خێزانم ویستمان بگەڕێینەوە بۆ کوردستان لە سەرقاڵی خۆمان لەناو تەکسی هەموو کەلوپەلەکانمان بیر چووە، بۆیە سەفەرەکەمان کانسڵ کردەوە و دەمانەوێت بەیانی بگەڕێینەوە بۆ نەرویج.

شێخ عومەر: یاخوا بەخێر بێیت، تەواو دەچینەوە ماڵی خۆمان، منیش کاتژمێر هەشت ئیشەکەم تەواو دەبیت زۆری نەماوە، نانم نەخواردووە بەیەکەوەش نان دەخۆین.

کرۆنیکا هەموو گیانی پێدەکەنی، منیش خەریکە دڵم دەتەقێت لە شەرم و لەو درۆیەی کە کردم.

ماکوان: نەوەڵلا برا، ئەیخەینە کاتێکی تر تۆ بمان بە بۆ هوتێلێك.

شێخ عومەر: کورە بەخوا ناچیت و دێنەوە بۆمالی خۆمان تەواو، لێیخوڕی لە جێگایەك تەکسیەکەی دایە دەست کوڕێکی تر و سەیارەکەی ئەوی وەرگرت.

کرۆنیکا لەکاتی دابەزینمان هاتە تەنیشتمەوە و وتی: بزانە چۆن تەمسیلێك دەکەم کە خێزانی تۆم.

ماکوان: بیکە بە خاتری خوا حەیام نەبەیت، چەند ساڵە کەسایەتی بونیاد دەنێم نەیڕوخینیت، یەك شتی نەخوازراو ببینم لەدەستی فرانك ڕزگارت بوو خۆم ئەوکوژم.

کرۆنیکا:باشە هاوسەرە خۆشەویستەکەم.

شێخ عومەر: کاك ماکوان با بڕۆین، خێزانت ناوی چییە؟

ماکوان: کرۆ-چیمەن

کرۆنیکا: ناوم چیمەن-ە.

شێخ عومەر: لە خزمەتاندام.

من چوومە پێشەوە دانیشتم و کرۆنیکاش لە دواوە دانیشت، لەگەڵ شێخ عومەر دەستمان کرد بە قسەکردن.

شێخ عومەر تەلەفۆنی کرد بۆ خێزانی و وتی میوانمان هەیە، خێزانیشی وتی یاخوا بەخێر بێن سەرچاو.

شێخ عومەر بە خێزانەکەی وت ئەی ناپرسیت مێوانەکەمان کێیە سەناریا؟

سەناریا: کێیە؟

شێخ عومەر: کاك ماکوان کەریم-ە.

سەناریا: گاڵتە دەکەیت؟

شێخ عومەر: بەڕێوەڵڵا خۆیەتی، ڕێگای لێ هەڵە بووە، هاتووە بۆ ماڵی ئێمە لەگەڵ خێزانی.

سەناریا: یاخوا بەخێر بێن، کەی دەگەنە ماڵەوە.

شێخ عومەر: دە خولەکی تر.

سەناریا: تۆزێک میوە و شیرینی بکڕە پێش ئەوەی بێنەوە، باشە؟

شێخ عومەر:باشە.

ماکوان: خوا جەزای خێرت باتەوە کاك شێخ گیان، چاك بووین بە عەزێت بۆ جەنابت و خانەوادە بەڕیزەکەت.

شێخ عومەر: توخوا وا مەڵێ من زۆر خۆشحاڵم، تۆ پەلە مەکە با تەلەفۆنیك بکەم بۆ کاکم، پەیوەندی کرد بە کەسێکەوە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت وتی کاکە چۆنی؟

وەڵامی داوە وتی شێخ عومەر باشی شووکر، خۆ هیچ نەبووە وا تەلەفۆنت کرد ئێستا؟

شێخ عومەر: وەڵڵا شتێکی خۆشت پێ دەڵێم.

خێر شێخ عومەر؟

شێخ عومەر: کاکە ئەزانی کێ میوانمە ئەمشەو؟

نەوەڵڵا نازانم.

شێخ عومەر: کاک ماکوان کەریم.

کوا بێنە با قسەی لەگەڵ بکەم ئەگەر ڕاست دەکەیت.

شێخ عومەر: فەرموو کاك ماکوان ئەوە کاکمە تۆی زۆر خۆش دەوێت.

ماکوان: ناوی کاکی بەڕێزت چییە؟

شێخ عومەر: ناوی شێخ موحسینە.

ماکوان: کاك شێخ موحسینی بەڕێز السلام علیکم.

شێخ موحسین: وەی سەر هەردوو چاوەکەم (وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته) یاخوا بەخێر بێیت، بەیانی منیش دێمە خزمەتان.

خۆشحاڵی خۆم دەربڕی و هەندێك قسەمان کرد و تەلەفۆنەکەم داخستەوە، شێخ عومەر دابەزی چوو بۆ شت کڕین من و کرۆنیکا ماینەوە لە سەیارەکەدا.

بە کرۆنیکام وت ئاگات لە شەخسێتم بێت، هەرچییان لێ پرسیت بڵێ دانم دێشێت ناتوانم قسە بکەم.

کرۆنیکا: هیچ قسەیەك نەکەم؟

ماکوان: زۆر مەمنونت دەبم ئەگەر هەوڵ بدەیت بێدەنگ بیت، کاتی نوێژ هەوڵ بدە نوێژەکانت بکە یان بڵێ نوێژم لەسەر نییە، باشە؟

کرۆنیکا: بۆ دەبێ نوێژیش بکەم؟

ماکوان: ئەی بە حساب ژنی منیت، ئەی خۆ دەبێت نوێژ بکەیت، ئەی خۆ ژنی من بیت نابێ کافر بیت.

کرۆنیکا: خەمت نەبێت ئاگام لێیە زۆر سترێسی، دڵنیابە ماکوان وەکو وتم هاوسەرێکی باش دەبم.

ماکوان: دە دەمت دابخە، هاوسەری باشی چی حەیام مەبە.

کرۆنیکا: باشە دەڕۆم، پێیان بڵێ ون بووە.

ماکوان: شتێکی وات بکردایە زۆر باش بوو.

کرۆنیکا: ئائا خۆ دەڵێت باش دەبوو.

ماکوان: بێدەنگ بە کاك شێخ هاتەوە.

شێخ عومەر: تەلەفۆنەکەی بە گوێوە بوو، وتی شێخ فەرەیدوون ئامۆزامە حەزدەکات قسەت لەگەڵ بکات.

ماکوان؛ لەخزمەتیدام کاك شێخ گیان السلام علیکم.

شێخ فەرەیدون: کاك ماکوان گیان بەخێر بێیت زۆر خۆشەویستی، بەخوا بوویت بە بەرد لەسەر دڵی ئەو بێ دینانە.

ماکوان: خوای گەورە لێت ڕازی بێت کاك شێخ گیان، خوا لێمان قبوڵ بکات.

دوای هەندێك گفتوگۆ ئەویش تەلەفۆنەکەی داخستەوە وتی بەیانی دێمە خزمەتت.

لەدڵی خۆمدا وتم بەیانی هەموو کوردانی ستۆکهۆڵم ئاگادار دەکەنەوە.

چووینە ماڵی کاك شێخ عومەر بەڕێز و حورمەتێکی زۆرەوە بەخێرهاتنیان کردین، دوای نان خواردن هەواڵی مناڵەکانی منیان پرسی وتم لەماڵی خەسوومن، خیرا کرۆنیکا وتی لای دایکمن.

دوو سەعاتیک دانیشتین، زۆر ماندوو بووم پێمەوە دیار بوو، خوا ڕەحمی کرد وتیان با بخەوین، بەیانی بەردەوام دەبین لە قسەکانمان، وتیان ئیوە بچنە ئەو ژوورە بخەون.

ماکوان: نا با پیاوان بەیەکەوە بخەون و ژنانێش ئیسراحەتی خۆیان وەربگرن.

شێخ عومەر دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: کاك ماکوان زۆر عەشایەری، یەکجار واش نا.

نابێت ئێوە بچنە ژووری کوڕەکەمان بخەون، کوڕەکە ئەمشەو لای ئێمە دەخەوێت.

کرۆنیکا: کاك شێخ من گیرم بەدەست ئەو عەشایەریەی ماکوانەوە خواردووە.

من و کرۆنیکایان کردە ژوورێك و کاتی خەوە!

ژوورەکە زۆر بچوکە و جێگاکەمان بەیەکەوە داخراوە لەسەر زەوی و سیسەمێکی یەك نەفەریشی تێدا بوو کە کوڕەکەیان لەسەری دەخەوێت. خێرا بەشی خۆم هەڵگرت و بەشی ئەویشم خستە سەر سیسەمی کوڕەکەیان و پێم وت بچۆ لەوێ بخەوە تۆ، بۆ بەیانی بڵێ لەبەر نوێژ جێگاکەم هەڵگرتووە.

کرۆنیکا بە پێکەنینەوە: ئەی مەگەر من و تۆ ژن و مێرد نین.

ماکوان: بخەوە زۆر ماندووم، تەماشای تەلەفۆنەکەم کرد دەنگەکەی فرانکیان بۆ ناردبووم، چوبوو بۆ بولگاریا، وام دانابوو کە سەفەرەکەی کانسڵ بکاتەوە.

بەکرۆنیکام وت کە فرانك چووە بۆ بولگاریا.

کرۆنیکا: دەبێت بڕوات نەیدەتوانی کانسڵ بکات، چوونکە پارەیەکی خەیاڵی وەرگرتووە.

ماکوان: خەوم دێت شەوت شاد بەیانی قسە دەکەین، بەڵام هەرچییان لێ پرسیت دەربارەی من دوایی یەکسەر بۆم باس بکە نەوەك قسەت لێ دەربهێنن.

کرۆنیکا: بێخەمبە! شەو شاد. ماندوویت بخەوە، بەڵام پرسیارێك بیرم کەوتەوە.

ماکوان: فەرموو، خێراکە خەوم دێت:

کرۆنیکا: ئەزانی ئەم ژن و مێردایەتییەی من و تۆ لەچی ئەچێت؟

ماکوان: قسە زۆر ئەکەیت، بخەوە.

کرۆنیکا: لەیاری ماڵە باجێنە ئەچێت، یانی تۆ پیاوەکەیت و منیش ژنەکەم، بەمناڵی ئەو یارییەت نەکردووە؟

ماکوان:، نا، بخەوە.

زۆر ماندوو بووم خەوم لێکەوت، کاتژمێر چواری بەیانی بوو خەبەرم بوویەوە و هەڵسام بۆ نوێژ، چووم دەست نوێژم گرت و هاتمەوە، کرۆنیکا دەرکەوتبوو دامپۆشی و نوێژی بەیانیم کرد، خەوم لێکەوتەوە.

کاتژمێر ٩ی بەیانی بوو کاك شێخ عومەر هات خەبەری کردمەوە و وتی: کاک ماکوان با نان و چای بەیانی بخۆین، ئێستا شێخ فەرەیدون دێت بۆ ئێرە.

هەر بەڕاستی من جلوبەرگەکەی خۆم لەناو سەیارەی کۆمپانیاکە بەجێ هێشتبوو، شەو بیرم کەوتەوە، کاك شێخ عومەر جلوبەرگی ژێرەوەی بۆ ئامادە کردم کە هەمووی تازە بوو بەکار نەهاتبوون. چووم دوشێك بگرم، چاوم گێرا کرۆنیکا دیار نەبوو.

هاوارم کرد، چیمەن!

شێخ عومەر: لەگەڵ سەناریا ڕۆیشتنە دەرەوە نانی گەرم بهێنن لە سەمونخانەی تورکەکان. پێم وابێ پێداویستی هەبوو چوون هەندێك شت بکڕن.

ماکوان: زۆرباشە، خوا جەزای خێرتان باتەوە بۆ ئەو میواندارییە، بەڕاستی قەرزاربارتان کردم. ئەگەر دەکرێت تەلەفۆنێك بکە بۆ سەناریا خان پێیان بڵێ کەمێك زوو بگەڕێنەوە.

خۆت ئەزانی ژن کە چوونە بازاڕ لە بیریان ئەچێتەوە بگەڕێنەوە ماڵەوە، ئەبی زوو دەربچین و بگەڕێینەوە بۆ نەرویج.

شێخ عومەر: ڕۆیشتنی چی کاك ماکوان، شێخ فەرەیدون کەمێکی کە دێتە ئێرە، کاکیشم چەند کاتژمێرێکی دیکە دەگاتە ئێرە، لە یۆتۆبۆریەوە بە ڕێکەوتووە کە تۆ ببینێت.

ماکوان: بۆ کاك شێخ موحسین لە یۆتۆبۆری دەژی؟ لەوێوە لەبەر من دێت بۆ ستۆکهۆڵم؟

شێخ عومەر:بەڵێ، بەخوا بە خوشکەکەم و زاواکەشمانم وتووە ئەوانێش دێن بۆ ئێرە.

چوون گۆشت و شتی وا بکڕن، زاواکەمان کەبابی جوان دروست دەکات، ئەمڕۆ دەچینە دەرەوە کەبابمان بۆ دروست دەکات.

ماکوان: برا پێویست ناکات، بەخوا کارم زۆرە دەبێت بگەڕێمەوە بۆ نەرویج.

شێخ عومەر: برا تۆ سەفەرت بۆ کوردستان دەکرد نەبوو بە قسمەت، ئەم چەند ڕۆژە لای ئێمە بمێنەرەوە، سەناریا و ئەوانیش کاتژمێر ١٠ دەگەڕێنەوە.

ماکوان: خوای گەورە لێت ڕازی بێت برا، من چۆن ئەو هەموو ئەرکە ئەخەمە سەر ئێوە، وەڵڵاهی خەجاڵەتم.

زۆری نەبرد سەناریا خان و کرۆنیکا هاتنەوە، گوێم لە خشەی عەلاگە بوو، گوێم لێبوو سەناریا خان شێخ عومەری بانگ کرد، وتی وەرە کەمێك کارم پێتە.

کەمێکی پێ چوو کرۆنیکا لەو ژوورەی لێی مابووینەوە بانگی کردم، ماکوان بێزەحمەت تا ئێرە وەرە کارم پێتە، وەك ئەوەی بڵێی بیست ساڵە ژن و مێردین. خەریك بوو هاوار بکەم بڵێم بڵێ کاك ماکوان بیرم کەوتەوە و چارم نەما ڕۆشتم، خۆم دوا دەخست بۆ ئەوەی نەڕۆم، بەڵام شێخ عومەر هات، وتی کاك ماکوان، چیمەن خان بانگت دەکات.

ماکوان: باشە قوربان وا دەچم.

هەناسەیەکم هەڵکێشا و لە دڵی خۆمدا وتم: کێشەیەکم بۆ دروست دەکات، چۆن خۆم گیرۆدە کرد.

کە چوومە ژوورەوە سەری لەناو چوار پێنج عەلاگەیا بوو، وتم ئەوە چییە

کرۆنیکا: جلم بۆ کڕیویت، بیکەرە بەرت بزانە چۆنە؟

ماکوان: جلم ناوێت، تۆ ئەسڵەن قیاسی من نازانیت چۆن جلم بۆ دەکڕیت؟

کرۆنیکا: بەیانی پێش ئەوەی بڕۆم سەیری قیاسەکەم کردیت، دەزانم چۆن نازانم، تۆ لەبەری بکە.

ماکوان: نامەوێت، جلەکانی خۆم لەبەر دەکەم.

کرۆنیکا: بەخوا لەبەری نەکەیت ئەچم پێیان دەڵێم من ژنی نیم.

ماکوان: خۆ لەدەستت دێ، لە ترسا کردمە بەرم، ئەشمزانی کە کاری وا ناکات، دوو پانتۆڵی کابۆ و قاتێک و دوو کراس و پێڵاوی بۆ کڕیبووم، کە سەیری وەسڵەکەم کرد ١٤ هەزار کرۆنی سویدی یابوو بەو جلانە.

کردمەدەرەوە تا جلەکانم لەبەر کرد، کە هاتە ژوورەوە ویستی یەخەی کراسەکەم بۆ چاك بکات، نەمهێشت وتم خۆم دەستم هەیە.

کرۆنیکا: خۆ ناتخۆم، بەس وانابێت لادێی، ئەو مۆدێلە بەو شێوەیە نییە.

ماکوان: من لادێیم و وا لەبەری دەکەم.

کرۆنیکا: حەیام مەبە وانابێت.

ماکوان: جاتۆ بۆ حەیات ئەچێت؟ من وا دەیکەمە بەرم لادێیم و تەواو.

کرۆنیکا: نابێت، دوایی ئەڵێن ئەو ژنە نازانێت خزمەتی مێردەکەی بکات.

ماکوان: ئێ خۆ تۆ ژنم نیت، ئیلاقەت نەبێت من وا لەبەری دەکەم.

کرۆنیکا: بەخوا بۆت چاك دەکەم، ئەگینا ئەچم پێیان ئەڵێم من ژنی ماکوان نیم.

ماکوان: جا چاوت دەرێ بچۆ پێیان بڵێ.

کرۆنیکا هاواری کرد سەناریا خان، سەناریا خان بێزەحمەت تا ئێرە وەرە.

کەوای وت ئەژنۆم هێزی نەما، وتم باشە وەرە چاکی بکە.

سەناریا خانیش وەك جنۆکەکانی هاوڕێم خێرا ئامادە بوو.

سەناریا: فەرموو چیمەن خان.

کرۆنیکا: لەو کاتەوە بە ماکوان ئەڵێم یەخەی ئەو کراسە نابێت ئاوا بێت بە قسەم ناکات، توخوا لە دوکانەکە لەبەر بووکەکە بوو وانەبوو؟

سەناریا: وەڵلا کاک ماکوان چیمەن خان ڕاست دەکات، دەبێت بە پێچەوانەوە بێت.

کرۆنیکا دەستی هێنا و یەخەی کراسەکەی بۆ چاك کردم و وتی سوپاس سەناریا خان ئەوە من یەك ماکوان سفر، بۆینباخێکی بۆ کڕیبووم هێنای وتی ببەستە.

ماکوان: من نازانم بۆینباخ ببەستم لایبەرە نایبەستم.

کرۆنیکا: من خۆم بۆت دەبەستم.

ماکوان: خوایە چۆن گیرم خواردووە.

بۆینباخەکەشی بۆ بەستم، تا کرۆنیکا گۆڕیمی شێخ فەرەیدون و ماڵی خوشکەکەی و زاواکەشیان گەیشتن، تا بەخێرهاتنی ئەوانمان کرد شێخ موحسین-ی براشی گەیشت، جێگا نەبوو دابنیشین. کرۆنیکاش لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو شانی گیر کردبوو لە شانم، زوو زوو ئەموت ئەوەندە خۆت نزیك مەکەوە لێم.

کرۆنیکا: جێگا نییە.

چووین بۆ کەباب خواردن بۆ دەشت، تا نزیك کاتژمێر ٥ی ئێوارە لە دەرەوە بووین، زوو زوو کرۆنیکا لە خۆیەوە دەیوت بەخوا ماکوان حەزی بە چەوری نییە، منیش لە ژیانما حەزم بە خواردنی چەورە. یان لە خۆیەوە دەیوت ماکوان چا ناخوات بەس قاوە ئەخواتەوە، واش نییە من هەردووکیان دەخۆمەوە.

ماکوان: پێم وت ئەرێ تۆ حەقت چییە بەسەر منەوە چی ئەخۆم و چی دەخۆمەوە، بۆ لەخۆتەوە قسە لەسەر خواردنی من دەکەیت.

کرۆنیکا: ئاخر با وانەزانن کە من ژنت نیم، چۆن دوور دەبینم، هاوسەرێکی باشـم بۆت؟ توخوا ڕاست بڵێ یاری ماڵە باجێنەکەمان خۆش نییە؟

ماکوان: کرۆنیکا تۆ ناتوانیت دەوری خێزانم ببینیت، کەس ناتوانێت وەك خێزانم بێت بۆ من.

کرۆنیکا: بۆ من چیمە؟

ماکوان: هیچت نییە، بەڵام زۆر جیاوازن.

کرۆنیکا: جیاوازییەکەمان چییە؟

ماکوان: ئاسمان و ڕێسمان، ئەو خاوەنی دوو مناڵە و دایکە، ئەو لە خۆشی و ناخۆشیدا لەگەڵمدایە، لە بێ پارەیی و پارەداریمدا لەگەڵم دەژی، هێز و باڵی منە، متمانەی تەواوم پێیەتی، پارێزەری شەرەفمە و بێجگە لەمن پیاوی تری نەناسیوە، هەوڵ ئەدات کە چی باشە بۆ منی بکات زۆر شتی تر...

کرۆنیکا: جا ئەوە چییە منیش هەمووی دەکەم.

ماکوان: لە قاپا یان لە پسکیت؟

دایە قاقای پێکەنین، وتم بێدەنگ بە وەك بەشەر پێبکەنە.

کرۆنیکا: باشە، ببوورە.

ماکوان: برۆ ئەڵێین منداڵەکانمان بێتاقەتن، با بگەڕێینەوە، باشە؟

کرۆنیکا: باشە ماکوان ئەو خەڵکە تۆیان زۆر خۆش ئەوێت هۆکاری چییە؟

ماکوان: ئیسلامەتی و کەمێك زانستی ئەم دینە.

کە گەڕامەوە ناو مەجلیسی ئەو برایانە یان بڵێین ئەو شێخە بەڕێزانە پێم وتن، ئیزنمان بەن ئێمە بڕۆین، منداڵەکان بێتاقەتن، وایە چیمەن؟

چیمەن: بەڵێ وایە.

شێخ موحسین: ڕۆیشتنی چێ، دەچین بۆ یۆتۆبۆری، ئەم شەو لای ئێمە دەبن.

شێخ عومەر: وەڵڵا ناڕۆن

شێخ فەرەیدون: نا دەچین بۆ ماڵی ئێمە.

کاك نەژادی زاوایان: نەوەڵڵا دەچین بۆ ماڵی ئێمە.

ماکوان: یاخوا ماڵتان هەمیشە ئاوەدان بێت شێخانی بەرزنجە، حورمەتی زۆرتان نواند، ئیجازەمان بدەن بڕۆین، جارێکی کە دێینەوە خزمەتان، تازە ئێوە برا و کەسی منن.

شێخ موحسین: سوێند بەخوا نەێییتە ماڵم نایەڵم بڕۆیت.

کرۆنیکا: ماکوان خۆ ئێمە هەر لە یۆتۆبۆرییەوە دەگەڕێینەوە نەرویج، دەچینە ماڵی کاك شێخ موحسین و لەوێوە بۆ نەرویج.

ماکوان: خەریك بوو بڵێم دەمت داخە، ناچار وتم باشە دەچینە ماڵی کاك شێخ.

لەگەڵ شێخ موحسین بەڕێکەوتین بەرەو یۆتۆبۆری، بەڕێگاوە قسەی خۆشی زۆر بۆ کردم، پیاوێکی زۆر نەجیب و خواناس بوو، کاتژمێر ١٠ی شەو گەیشتینە ماڵی ئەوان تا ١٢ی شەو دانیشتین، دیسان کاتی خەو هات من و کرۆنیکایان کردە ژوورێك وەك شەوی ڕابردوو جێگاکەم جیاکردەوە، هەڵسام بۆ نوێژی بەیانی لەگەڵ شێخ موحسین بە جەماعەت نوێژمان کرد، چوومەوە ژوورەوە و لێی خەوتم تا بەیانی.

بەیانی کرۆنیکا خەبەری کردمەوە وتی هەستە نانی بەیانیان ئامادە کردووە، نانی بەیانیمان خوارد و چووین بۆ وێستگەی شەمەندەفەر.

خواحافیزیمان لە شێخ موحسین کرد، بلیتم کڕی بۆ شارەکەی خۆم، کرۆنیکاش بۆ شاری خۆی وێستگەیەك دوای من دادەبەزی.

لەناو شەمەندەفەرەکە ڕووبەڕووی یەك دانیشتبووین، پێم وت وەرە ئێستا با حەق و حیساب بکەین. کرۆنیکا: ئەم دوو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژی ژیانم بوو، ئەی تۆ؟

ماکوان: وەڵڵا من ناخۆشترین ڕۆژی ژیانم بوو ئەم دوو ڕۆژە، تێگەیشتی کرۆنیکا؟

کرۆنیکا: بۆ ماکوان، چۆن دەورێکم بینی؟

ماکوان: زۆر باش بوو، بەڵام تا من ماوم ناتوانم جارێکی تر ئەو خانەوادانە ببینمەوە.

کرۆنیکا: بۆ؟

ماکوان: ئێ ئافڵ هەر بێنە ماڵم یان بچمەوە ماڵیان خێزانم ببینن دەڵێن چیمەن خان چۆنیت، ئەمە چیمەن خان نییە کوا چیمەن خان؟ هەر لەو چیمەنەوە خانەوادەی من دەشێوێت، وایە؟

کرۆنیکا: وایە.

ماکوان: خوای گەورە ئاسانی بکات، بابێینە سەر باسەکەمان، ئەوە دەنگی فرانکە لە بولگاریایە، ڕزگار بوویت لە دەستی. پلانی داهاتوومان زۆر قورسە، دەبێت تۆش و منیش زۆر وریا بین.

کرۆنیکا: وەی چەندە ئارام بووم ئەو دوو ڕۆژە لەگەڵت، خۆزگە ئەو دوو ڕۆژە کۆتایی نەهاتایە.

ماکونا: کرۆنیکای خوشکم، تۆ خۆت دەتوانیت گۆڕانکاری بکەیت لە ژیانتدا، زۆر کەس هەیە لە من باشتر و لە من پیاوتر کە مەمنونە تۆ خێزانی بیت، دەتوانیت ژیان دروست بکەیت.

کرۆنیکا: وانییە، بۆ من کەس وەك تۆ نییە.

ماکوان: با زۆرە، من دەتوانم برات بم.

کرۆنیکا ئاهێکی هەڵکێشا و شەمەندەفەرەکە کەوتەڕێ،سەفەرەکە چوار کاتژمێری پێدەچوو تا دەگەیشتمەوە شارەکەی خۆم.

لە ڕێگا باسی ئەوەم بۆ کرۆنیکا دەکرد کە دەبێ خۆت ون بکەیت ماوەیەکی زۆر، تا بزانین چی ڕوو دەدات، ئەگەر و پلانی زۆرمان دانا، بەڵام نەماندەزانی کامیان جێبەجێ بکەین.

کرۆنیکا: ماکوان ڕاستم پێ بڵێ، منت خۆش ناوێت؟

ماکوان: با وەك خوشکی خۆم خۆشم دەوێیت.

کرۆنیکا: درۆ دەکەیت!

ماکوان: ڕاست دەکەیت من درۆ دەکەم.

کرۆنیکا: بە چاوتا دیارە کە ڕاست ناکەیت.

ماکوان: ڕاست بکەم یان درۆ تۆ بۆ من ئاستەمی، ناگەین بەیەك ئێمە دوو هێڵی تەریبین بەیەکەوە دەڕۆین، گەیشتن بەیەکمان ئاستەمە.

کرۆنیکا: تۆ کێشەی چیت هەیە لەگەڵ من؟

ماکوان: من کێشەی دڵم هەیە.

# گەشتی ئیمان بە قیتار

لەدوای ئەوەی كە پرسی كێشەت لەگەڵ من چییە و منیش وەڵامم دایەوە كە كێشەی دڵم هەیە، وا تێگەیشت لە دڵی مندا هیچ خۆشەویستی تیا نییە، بەڵام بۆم ڕوون كردەوە كە ئەگەر دڵم عاشقت بوو ئاستەمە لێت جیا ببمەوە.

كرۆنیكا: ماكوان باسی عیشقت كرد، عیشق لای تۆ چی دەگەیەنێت؟

ماكوان: عیشق لای من دوو واتای هەیە، واتای یەكەم ئەوەیە كە كوڕ و كچێك حەزیان لەیەكترییە و دەڵێن عاشقی یەك بووین، كە دەگەن بەیەكتری و حەزەكانیان بەتاڵ دەكەنەوە، دوای ئەوە نەك ڕقیان لەیەكتری دەبێتەوە بەڵكو نایانەوێت یەكتریش ببینن، بەتایبەت ئەو حاڵەتە لەناو ئێمەی پیاواندا هەیە، چوونكە حەز و عیشقمان لە چاوماندایە، كە تێربووین ئیتر عیشقی چی و خۆشەویستی چی، دوای ئەوە عیشق وەكو میزەڵان فش دەبێتەوە.

كرۆنیكا: ئەی لەناو ئافرەتان ئەو جۆرە عیشقە هەیە؟

ماكوان: چۆن نییە، باشترین نمونە تۆیت، وا دەزانیت عیشق تێركردنی حەزەكانە.

كرۆنیكا: وانییە ماكوان بۆ چی وا سووك و وەك سۆزانی سەیرم دەكەیت؟

ماكوان: كرۆنیكا زۆر هەڵەیت، من لەو جۆرە كەسانە نیم، ئەزانم مرۆڤ هەڵە دەكات و چاكەش دەكات، ئەزانی تۆ چەندە ئافرەتێكی ناسك و

ڕاستگۆی. تۆ کەسێکی زۆر بە بەزەیی و لەناو خۆتدا ون بوویت، دەگەڕێیت تا خۆت بدۆزیتەوە، تۆ ئەوەندە خۆشەویستیت نەدراوەتێ پەنا بۆ داروبەرد دەبەیت تا خۆشی بوێیت.

تۆ لەو کەسانەی کە بەدوای چاکەدا دەگەڕێیت و حەز بەلاساییکردنەوەی پاڵەوانەکان دەکەیت کە چاکە و باشە دەکەن لەگەڵ خەڵکی، تۆ لەو جۆرە مرۆڤانەی کە حەز بە بەخشین دەکەیت و حەز دەکەیت لە بەشی خۆت ببەخشیت، لەگەڵ ئەوەشدا حەز دەکەیت خۆت بناسێنیت کە توانای خێر و چاکەت هەیە، بەڵام ئەزانی کێشەی تۆ چییە؟

کرۆنیکا دوو دڵۆپ فرمێسک بە چاوەکانییەوە قەتیس مابوو وتی: ماکوان وەی خوایە ئەو قسانەت چەندە خۆشە، نەمزانی قسەی واش دەزانیت، چۆن ئەو خوێندەوەیەت بۆ من کرد، کە ڕێك ناخی منە.

ماکوان: لەبەر ئەوەی من خاوەنی مەملەکەتی عیشقم.

کرۆنیکا: پێم بڵێ بەشی دووەمی عیشق چییە لای تۆ؟

ماکوان: مانای دووەم پرە لە وشە، پرە لە ڕستە و هۆنراوە، عیشق مرواریيە، پێویستە مەعشووقەکان بیهۆننەوە، عیشق ئەشکی شەوانە، دووريیە، نەگەیشتنە بەیەك، عیشق ڕاستگۆییە، پاڕاستنی مەعشووقە، خۆشوویستنە لە خۆت زیاتر.

عیشق دەرمان نییە، بەڵکو ئەبێت بزانیت کە دەردە، یاخوا کەس نەیگرێت، زۆرجار دەیکوژێت، زۆر جاریش خاوەنەکەی دەکاتە فریشتە هەرهەمان دەردی عیشقە کە خاوەنەکەی دەکاتە دڕندە، عیشق واتا کوێر بوون، بێئاگا بوون، نابیستێ، لەجیاتی خواردن خەم دەخوات، تای عەشق هەناسە

ساردی هەڵدەمژن و لەجیاتی ئاو ژەهری پێ دەنۆشن. دەردێکە تەنها من دەزانم ئازارەکەی چۆنە.

کرۆنیکا: توخوا قسەم بۆ بکە، چەندە خۆشە ئەو قسانە، ماڵی شێخ عومەر هەموویان مۆبایلەکانیان پڕ بوو لە ڤیدیۆکانی تۆ، باشە تۆ چی بەو خەڵکە ئەڵێی ئاوا تۆیان خۆش ئەوێت، چی سیحرێکت کردووە لەو خەڵکە ئاوا موشتاقی قسەکانتن؟

ماکوان: هەرکەس ڕاستگۆ بوو لەگەڵ عیشقەکەی، دڵنیابە خەڵکی خۆشیان دەوێت و عاشقی دەبن.

کرۆنیکا: ئەو قسەیەت زۆر قوڵە لە ژیانمدا حەزم کردووە لەگەڵ خەڵکی وەکو تۆ هاوڕێ بم، ئەمە یەکەم جارە ئەو ئەدەبیاتە جوانە دەبینم لە کەسێکی کورد دا، بینیومە لە ڕۆماننووس و شاعیرەکاندا، بەڵام هەستم کردووە ئیحساسەکەیان یان تەزویرە یاخود تەنها شیعرێکی پلاستیکییە بۆ کچێکی گۆرانی بێژ یان کوڕێکی گۆرانیبێژیان نووسیوە. زۆر حەزم بە قسەی دڵ و ڕاستی و ئەسڵییە.

ماکوان: وەڵڵا خۆ تۆش هەست دەکەم ئاقڵی و مستەوات زۆر باشە، کوێت خوێندووە یان چیت تەواو کردووە؟

کرۆنیکا: کۆلێژی ئاداب بەشی ئینگلیزی.

ماکوان: ئافەرین.

کرۆنیکا: زمانی عەرەبیشم زۆر باشە، ئەبینم وشەی عەرەبی زۆر بەکار دەهێنیت لە قسەکانتدا وایە؟

ماکوان: وایە، بەڵام ئەم جارە لەبەر خاتری تۆ وشەی ئینگلیزی بەکار دەهێنم، بەڵام من ئینگلیزییەکەم سفرە، وا نەزانیت زۆر موهیمم، تەنها بەشی خۆم و کارەکانمی پێ ڕایی بکەم، کە بۆ کێ بڕۆم، چی دەخۆم، بایی چەندە، لە کوێدایە، ئەو شتە سەرەتاییانە دەزانم.

کرۆنیکا: یەکجار واش نین، بەڵام دەزانم عەرەبییەکەت زۆر باشە، تۆ پێم بڵێ لەماڵی شێخ عومەر، شێخ فەرەیدون دەیوت چقڵی چاوی مولحیدەکانیت، هەموویانت کردۆتە کوون، تۆ دەزانی منیش مولحیدم، واتا ئاتایستم؟!

ماکوان: بەداخەوە دەزانم، بۆیە دوورم لێت و دەڵێم دوو هێڵی تەریبین هەرگیز بەیەك ناگەین.

کرۆنیکا:من ڕێزم هەیە بۆ ئیسلام، بەڵام بڕوام بۆ دروست نابێت چی بکەم بەدەست خۆم نییە.

ماکوان: ئاخر تۆ سەرقاڵ نەبوویت بە (دڵ و ئەقڵ و ژیری و ئیمان، دین) بەڵکو سەرقاڵ بوویت بە پارە، حەزەکانت، سەرسام بوویت بە جوانی خۆت، ڕق لەدڵ بوویت و حەزت بە تۆڵە سەندنەوە بووە، نەت زانیوە لەکێ تۆلە بکەیتەوە، ئەمانە و زۆر هۆکاری تریش وایان لێ کردوویت کە مولحید بیت، لەسەرووی هەموو ئەمانەوە جەهل بەزانست و زانیاری لەسەر فیکر و فەلسەفە و زۆری تر لەم باسانە.

کرۆنیکا: من حەزم بە زانستە، زۆر دوورم لە فەنتازیاوە، لەوانەیە بەو هۆکارە بێت.

ماکوان:نا وانییە، ئەم قسەیەش بۆ ئەوە ئەڵێیت من شووێن بەڵگە کەوتووم بۆیە بێ دینم، بە بەڵگە دوای هەموو شتێك دەکەوم، وەکو ئەرستۆ دەڵێت شووێن بەڵگە دەکەوین تا ‌ئەنگەیەنێتە هەرکوێ وایە؟!

کرۆنیکا: ڕاستە ڕێك من شووێن ئەو فەلسەفەیەی ئەرستۆ دەکەوم کە دەڵێت با شووێن بەڵگە بکەوین، ‌ئەنگەیەنێتە هەرئەنجامێك، ئەی مەگەر ئەم قسەیە ڕاست نییە؟

ماکوان: با زۆر ڕاستە، بەڵام نەتۆ و نەئەوانەشی وەکو تۆ وان ڕاست ناکەن لەگەڵ خۆیاندا، بۆ نمونە تۆ چۆن شووێن بەڵگە دەکەویت؟

کرۆنیکا: من کەسێکی بایەلۆجیم، یاخود بڕوام بە سروشتە، دوا هێزێك هەیە بەڵام نازانم چییە کە زانست هیچی دەربارە نەوتووە.

ماکوان: ئاخر خۆ زانست لەئاستی هەندێك بایەلۆجیدا دەستەوسانە و هیچی بۆ ناوترێت، تۆ پێت وایە زانست زۆر پێشکەتووە، بەڵام زانست بەقەدەری داواکا‌ئەن نەچۆتە پێش، زانست زۆر لەسەرەتادایە.

کرۆنیکا: بڕوام وانییە، زانست زۆر پێشکەوتووە، زانستخوازەکان بەدوای هەستەکانەوەن، دەزانی مەبەستم چییە؟

ماکوان: بەڵێ باش دەزانم مەبەستت (بۆنکردن، تامکردن، بینین، بیستن و دەستلێدانە).

کرۆنیکا: بەڵێ بە دڵنیاییەوە، ئەوە زانستە لە چوارچێوەی ئەوەوە دەربچێت فەنتازیایە و ناتوانم باوەڕی پێ بکەم.

ماکوان: ئێ منیش پێنج هەستت پێ دەڵێم کە زانستەکەی تۆ لە ئاستیدا دەستەوسانە و زاناکان تا ئێستا هیچ لەبارەیەوە نازانن.

کرۆنیکا: چییە بزانم؟

ماکوان: ژیان، بیرکردنەوە، لۆژیك، وشیاری، هەست کردن بە خۆت. ئەمانە هەموویان بوونیان هەیە، ئەو پێنجەی تۆ هەرگیز پەی بەو پێنجەی من نابات، فەرموو وەڵام بدەرەوە بە زانست.

کرۆنیکا: ها-بڵێم چی؟

ماکوان: های ناوێت شتێ بڵێ، تۆ ئینگلیزی زانیت حەزت بە زانستە، زانست چی لەبارەی ئەم پێنج هەستەی تر دەڵێت؟ یان بەشێوەیەکی تر زانست لە سێ شت دەکۆڵێتەوە و ناوی ناوە (گەردوون، ژیان، مرۆڤ) جێگای خودا نییە لە زانست وایە؟

کرۆنیکا: وایە!

ماکوان: مادام وایە ئەو پێنج بوونەم بۆ باس بکە، لەکوێوە هاتووە؟ ئەمەی بۆت باس دەکەم گریمان نییە، حەقیقەتە، وایە؟

کرۆنیکا: ڕاستە حەقیقەتە.

ماکوان: ئەزیزم ئەگەر ئەم بەڵگانەی باسم کرد هەست بە دروستکراوێك نەکەیت، بەڕاستی زانستیی نیت.

کرۆنیکا: لەڕاستیدا تووشی شۆك بووم، ئەتوانی زیاتر بۆم شی بکەیتەوە، تا زیاتر تێبگەم، مامۆستاکەم!

ماکوان: بۆ نمونە ئەگەر ژیان وەرگرین سەرەتا، یەکێکە لەو بەشە نهێنیانەی کە زانا و فەیلەسوفەکانی نەك سەرسام کردووە، بەڵکو کێشەی گەورەی بۆ دروست کردوون، کە پێناسەی دەکەن بە سێ خاڵی سەرەکی.

یەکەم: ژیان- ئامانجی هەیە، پارێزگاری کردن لە خۆ و لە جۆری گەڕان بەدوای پێداویستی یان خۆراك.

دووەم: ژیان خاسێتی دووەمی بۆ جۆر و جنسی خۆی زۆر دەبێت. لە زانستی بایەلۆجی پێی دەوترێت

.Self replication

سێیەم: ژیان وجودی یاخود بوونی لە کۆدەکانەوە سەرچاوە بگرێت کە چالاکییە کیمیاییەکانی ڕێکبخات و بەڕێوە بەرێت.

تا ئێستا ئەو زانستەی تۆ باسی دەکەیت (ڕیچارد داوکینس) و هاوڕێکانی بە جادوو ناویان بردووە، لە ئاستی ئەو سێ خاسێتەی ژیان تێناگەن و کوێرن لەئاستی ماددەی مردوو بێ گیان، بەکام موعجیزە کە ئەم خانە زیندووە پەیدا بووە و پەرەی سەندووە.

کرۆنیکا: قسەکانت زۆر جێگای قەناعەتی منن، ئەی بیرکردنەوە چییە؟

ماکوان: بیرکردنەوە هەستێکی زۆر عەجیب و سەیرە، ئەگەر بە دوپامین پێوەری بکەیت، ئەو شەپۆلە کارەباییانەی کە کار بە پەنجەت دەکەیت یان زمانت یان خودی بیرکردنەوەکە زۆر گەورەتر و سەیر و عەجیب ترە، کە ئامرازی ماددی هەستەکان بێت وەکو (بەرکەوتن، بینین، بیستن و تام و بۆن)

کرۆنیکا: زیاتر بۆم ڕوون بکەرەوە، ئەگەر بڵێم تێناگەم خۆ ئاساییە؟

ماکوان: زۆر ئاساییە، چوونکە هەموو شتێکمان سنووردارە، تا سنوورێکی تر ئەدۆزینەوە بەرفراوانتری دەکەین، بۆ نمونە هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە لە سیمینارێکی زانکۆ کە باسێك پێشکەش دەکەیت ئیرتیجالی لەگەڵ زمانت بیرکردنەوە دەردەچێت نەك مێشک! تێگەیشتی؟

کرۆنیکا: نا وەکو پێویست نییە.

ماکوان: چ جۆرە کۆمپیوتەرێك لە ئێستا زیرەکترینە؟

کرۆنیکا: بلو جینی، بە ٢٠٠ ترلیۆن کرداری ژمارەیی لە چرکەیەکدا هەڵدەسێت.

ماکوان: باشە، هێچ ئامانجێکی هەیە بۆ مانەوەی خۆی؟ بیر دەکاتەوە لە خۆی یان کار بۆ خاوەنەکەی دەکات، واتا کرداری وەکو پەپوولەیەك یاخود بەکتریایەکە؟

کرۆنیکا: نا بەدڵنیاییەوە کار بۆ خاوەنەکەی دەکات.

ماکوان: کەواتە ژیان و بیرکردنەوەی نییە، ڕۆبۆتە ئەوەی کە زانست داویەتییە کاری پێ دەکات، ئەگەر من و تۆ گوێ لە گۆرانییەکی کاظم ساهیر بگرین بە کۆمپیوتەر، ئایا کۆمپیوتەرەکە وەکو من و تۆ ڕێك چێژی لێ وەردەگرێت؟

کرۆنیکا: نەخێر.

ماكوان: ئەوە ژیان و بیركردنەوەیە، لەگەڵ جیاوازی زانستی موجەڕەد و كۆنكرێتی ماددی، ڕوونە؟

كرۆنیكا: ئەی لۆژیك مامۆستاكەم؟

ماكوان: لۆژیك هەموو ڕێكخستنی سیستەمە لەگەڵ ئەو یاسا سەرسوڕهێنەرانەی كە ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبات، لۆژیك دەڵێت مادام ئەم هەموو یاسا گەردوونیە هەیە پێویستە دانەرێكیش هەبێت، ئەمە قسەی زانای فیزیایی گەورەی جیهانە ناوی (پاوڵ داڤیس)ە.

كرۆنیكا: واتا ئەو یاسادانەرە خوایە؟

ماكوان: بەدڵنیاییەوە، خۆ پوورم نییە، هەر خوای پەروەردگارە.

كرۆنیكا قاقای لێدا وتی: قسەكانت خۆشن و جوانن.

ماكوان: تكام وایە بەچاو و مێشكی سۆزو عاطیفە وەرینەگریت، بە ئەقڵی زانستی بیری لێ بكەیتەوە.

كرۆنیكا: بە دڵنیاییەوە ماكوان، لە زانستدا موجامەلە نییە، ئەی وشیاری چییە و چۆنە؟

ماكوان: هۆشیاری لە مرۆڤدا بە شەش خاسییەت هەڵدەسێت، ئەویش بریتین لە (هۆشیاری، بیركردنەوە، یادەوەری، زمان، لۆژیك و بڕیاردان). هەموو ئەم خاسێتانە بریتین لەیەك نادیار كە هەموو زانا و پسپۆڕ و فەیلەسوفەكانی دەستەوسان كردووە، دەزانیت چییە؟

كرۆنیكا: نەوەڵڵا.

ماکوان: ئەقڵە، ئەقڵ بوونی هەیە، بەڵام نە ئەندامە، نەجێگای دیارە، نە دەبینرێت، نە بۆن دەکرێت، نە دەبیسترێت، نە تام دەکرێت..هتد پێم بڵێ کام کارێکی کیمیایی شەپۆلی کارەبای ناو لاشە...هتد پەی ئەقڵ دەبات، ئاخر چۆن بنچینەی ماددە و ماددی دەکرێتە پێوەر بۆ ئەمانەی باسمان کرد؟

کرۆنیکا: ئەی هەست بە خۆ کردن چییە، بۆم ڕوونبکەرەوە؟

ماکوان: تۆ هەست دەکەیت لەگەڵ منیت، بەڵام خۆت بوونت هەیە وایە؟

کرۆنیکا: وایە.

ماکوان: ئەی نازانم لە تۆدا لە کێوە سەرچاوەی گرتووە؟

کرۆنیکا: نازانم.

ماکوان: ئەی خۆت کێیت؟

کرۆنیکا: من کرۆنیکام، ئەم لاشەیەم کە لەگەڵ تۆ دانیشتووم.

ماکوان: ئەوە تۆ نیت لاشەتە، هەمووی ناوی هەیە، تۆ دەڵێیت (من) جێناوی قسەکەرەکەیە، ئەو قسەکەرە کێیە کە بە من دەڵێت مامۆستاکەم، ئەو قسەکەرە کێ و چییە؟ تۆ کە هەست دەکەیت جیاوازی لە هەرچی شتی دەورو بەرت هەیە، تۆ مەحاڵە دەست بخەیتە سەر خۆت، چوونکە خۆت دۆخێکی ماددی نیت، یان هێزێکی عەقڵی مەعنەوی لە هەردووکیان گەورەترە، ئەو (منە) تەنانەت بزوێنەکە (ە) هەرچی فەیلەسوف هەیە لە ئەفلاتون تا دەیڤید هیوم سەرسامن بە خود.

کرۆنیکا: کە خود شتێکی ماددی نەبێت و ئەقڵانی و مەعنەویش نەبێت ئەو شتەیە کە دینداره‌کان ناویان ناوه ڕۆ.

ماکوان: ئەی ئافەرین، گوڵی من کرۆنیکا.

کرۆنیکا: ئەو قسەیەت لە دڵەوە بوو ماکوان؟

ماکوان: ئەرێ وەڵڵا لە دڵمەوە بوو، چوونکە خەڵکی ئاقڵ زوو لە شتەکان تێدەگات لە قسەکانی دەورو بەرمان، گوڵە یاخوا تەمەنت تەمەنی گوڵ نەبێت.

کرۆنیکا: وەی زۆر سوپاس ماکوان گیان، زۆرم خۆش ئەوێیت!

ماکوان: تەبعەن وەکو برای خۆت، وایە؟

کرۆنیکا: نا وەکو یاری ماڵە باجێنەکەمان.

ماکوان: چی تێگەیشتیت لە قسەکانم؟

کرۆنیکا: هەموو شتی جوانن، بەڵام کاتم بەرێ بۆ زیاتر بیرکردنەوە، باشە؟

ماکوان: بەڵام تەمەڵ مەبە، بزانە ئەوەی لەم گەردوونەدایە بۆ پێشووازی مرۆڤ ئامادە کراوە، کاتێکی کەمت لە بەردەستایە، کە ڕۆشتیت ناگەڕێیتەوە.

کرۆنیکا: بۆکوێ دەرۆم؟

ماکوان: مردن، چی دەکەیت بمریت خوای گەورە لێت بپرسێتەوە، وەڵامت چییە؟

کرۆنیکا: نازانم.

ماکوان: لەدادگادا نازانم بوونی نییە کە لەناو ڕووداودا بوویت، کە وتت نازانم یان شێتی یان بێ گیان، تۆش هیچیان نیت، یان کوێری یان داددەنێین بە کوێری و کەڕی خۆتدا، لەکاتێکدا کەم ئەندام بیت ناتوانیت حاکم قبوڵی ناکات.

کرۆنیکا: حاکم خوایە؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە پەروەردگارە،

کرۆنیکا: ئەی بەڕەحم نییە لەگەڵماندا؟

ماکوان: بەڕەحمە بەدڵنیاییەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە ناسیویەتی ڕەحمی هەیە، ئەوەی کە دژایەتی کردووە و نەیبیستووە و نەیبینوە و خۆی گێل کردووە، خاوەنی عەزاب و سزایە.

کرۆنیکا: باشە ئەگەر خوا بوونی هەبێت وا بڕوام کرد.

ماکوان: بە گومان نابێت.

کرۆنیکا: نا بەگومان ناڵێم، لە سەدا سەد دەڵێم خوا بوونی هەیە، بەڵام کام دین ڕاستە؟ باشە ئەگەر موسوڵمان بوون، گرنتی چییە کە لەو دونیا مەسیحییەت ڕاست بوو من قوڕی کوێ بکەم بە سەرمدا؟ یان یەهودی ڕاست بوو، یان بودایی، زەردەشتی، هیندۆسی...هتد کامە دینە ڕاستە؟

ماکوان: وەڵامی ئەو پرسیارە زۆر ئاسانە و زۆریش قورسە.

کرۆنیکا: پێم ڕادەبوێری؟ زۆر ئاسانە و زۆر قورسە واتای چی؟

ماکوان: نا لەبابەتی جدی زۆر جدیم، بەکەس ڕانابوێرم، بەڵام ئاسانە بۆ کەسێك کە باکگراوندی ئایینی هەبێت ئەم پرسیارە بکات، قورسە بۆ کەسێك کە نەزانێت ئایین داوای چی دەکات و بۆچی هاتووە.

کرۆنیکا: قسەکانت قوڵن، پێویستە ڕوونبکرێنەوە ماکوان، ببوورە وام وت توخوا مەجاڵم بەرێ منیش قسە بکەم بۆت، هەندێك جار دوای تۆ باسەکەم بۆ تەواو بکە، ماکوان ئەزانی من بۆچی تۆم خۆش دەوێت؟

ماکوان: خوا خۆشەویستت لێ نەسێنێت، نەوەڵڵا.

کرۆنیکا: چوونکە تا ئەم ساتە وەختە نەتپرسیوە من کێم و چیم و بۆ وام بەسەرهاتووە؟.

ماکوان: ئاخر ئەوە ئیش و کاری من نییە، خۆ من دادگاییت ناکەم تا بزانم چیت و کێیت و چیت دەوێت؟.

کرۆنیکا: نا مەبەستم ئەوەیە کە پرسیارەکەت زۆر سەرنجی ڕاکێشام وتت زۆر ئاسانە و زۆر قورسە، کە بۆت شیکردمەوە وەکو فیلمێکی سینەمایی ژیانی خۆم و دایکمم هاتەوە بەرچاو، کە چەندە نارەحەتی و چەرمە سەریمان دیووە، بۆیە منیش ئاوا بەڕەڵڵا بووم.

ماکوان: حاشای بەڕێزت.

کرۆنیکا: نا پێوستە ئیعتراف بکەم، من تاوانبارم، بەڵام ئەوەی بەسەرمدا هاتووە خەتاکەی باوکمە.

ماکوان: بۆچی باوکت؟

کرۆنیکا: من کچی برای حاجی عەباسی قەسابم، پیاوێکی ناوداری شاری سلێمانییە، یەکێك بووە لە پیاوە چاك و خواناسەکانی شار. لە ساڵی ١٩٩٣-١٩٩٦ لەکاتی گرانی و ئابڵوقەی ئابووری لە جەژنەکاندا زیاترلە ١٠٠ مالی هەژاری لە جەژن و ڕەمەزاندا بەسەر کردۆتەوە. بیرمە کە ساڵی ١٩٩٨ هات بۆ ئەوروپا سالی ٢٠٠٠ ئێمەشی هێنا بۆ نەرویج. ئەوکات باوکم هەمیشە لەگەڵ دایکم شەڕیان بوو، ژیانمان زۆر ناخۆش بوو بەهۆی باوکم.

ماکوان: باوکت چی بوو، چی دەکرد؟

کرۆنیکا: مەشروب خۆر و قومارچی بوو، بیری لە ئێمە نەدەکردەوە، هەمیشە لە دایکمی ئەدا چەند جار دەستی دایکمی شکاندووە، سەری شکاندووە.

هەرچی پارەی هەبوو لە قوماردا دایدەنا، فێری قوماری ئۆتۆماتیکی ببوو، تەنانەت پارەی نانی پێنەبوو، ئیتر لە توانامان‌دا نەما، ناچار دایکم وتی جیا دەبینەوە ئەوەندەی لە دایکم دابوو، هەموو دەموچاوی شین کردبووەوە، تا لەکۆتاییدا ماڵێکی نەرویجی زانیان و ئەوان سکاڵایان لەسەر باوکم تۆمار کرد، لەگەڵ ئەوەشدا دایکم لە دادگا لێی خۆش بوو، هەرچۆن بوو دوای چەند مانگێك لە زیندان ئازاد بوو، وامان دەزانی باش دەبێت. ئەمجارە داوێنپیسی دەکرد بەسەر دایکمەوە، بێ ئەوەی ئێمە بزانین لەژێر چاودێری پۆلیس بوو، دەستی کردبوو بە هێنانی ماددەی هۆشبەر لە سویدەوە بۆ نەرویج، لەماڵەکەمان بە نهێنی کامێرایان دانابوو لە گەراجەکەماندا.

ڕۆژێك خەریکی گۆشت برژاندن بوو لە دایکم تورە بوو، چەقۆی بۆ هەڵگرت. دایکم ڕایکرد چەقۆکەی تێگرت کێشای بە پشتی دایکمدا و برینداری کرد، بەڵام ئەو ڕۆژە هیچ ڕووی نەدا دوو ڕۆژ دوای ئەوە گرتیان

بە چەند کیلۆیەك هێرۆین و ئەو چەقۆیەی کە بۆ دایکمی هەڵدابوو. هەموو ئەمانە کۆکرانەوە لەسەری لە ساڵی ٢٠٠٦ وە لە زینداندا بوو تا ساڵی ٢٠١٧ وڵاتی نەرویج ڕەگەزنامەکەی لێ سەندەوە و ناردییەوە بۆ عێراق.

ماکوان: ئێستا لەوێیە؟

کرۆنیکا: بەڵێ لەوێ ژنی تری هێناوە، چەند جار لە فەیسبوک نامەی بۆ ناردووم، من هەر وەڵامم نەداوەتەوە.

ماکوان: ئەی لە نامەکانیدا دەڵێت چی؟

کرۆنیکا: داوای لێبوردن دەکات، دان بەهەڵەکانی خۆیدا دەنێت، بەڵام ئەوەندە ئازارمان چەشت بە دەستییەوە هیچ ڕەحمێکم بۆی نییە و نامەوێت قسەی لەگەڵ بکەم.

ماکوان: ئەی دایکت ئەتوانێت بچێتەوە کوردستان، خۆ کێشەی بۆ دروست ناکات، وەك ئەوەی شەڕی پێ بفرۆشێت؟

کرۆنیکا: نا خاڵەکانم ویستیان لێیبدەن، بەڵام باوکم زۆر پیرە ئێستا لە تەمەنی (٧٠) کاندایە بەرەو ژوور.

ماکوان: وەڵڵاهی کارەساتە.

کرۆنیکا: چی بکەم، من لە ئاوات گەورەتر بووم، خۆت دەزانی نەرویج سیستەمی چۆنە، لە قوتابخانە لەگەڵ هاوڕێکانم دەچوومە ئاهەنگی شەوان و کەس نەبوو ڕێگیریم لێبکات، ئیتر کەوتمە ئەم تەمەنە کە ئێستا لەتاو مردن ڕادەکەم.

ماکوان: من هەڵە بووم زۆر جار لەبڕیاردان خێرام.

کرۆنیکا: دەزانم دەڵێیت چی و لێت تێدەگەم، بەڵام تۆش ناحەقت نییە.

ماکوان: وەڵڵا ئێستا بەزەییم پێتدا دێتەوە و گوێ مەدەرێ، من دەبم بە باوکت ئیتر تۆ کچی منیت.

کرۆنیکا: باوکم ناوێت، باوکم هەیە، پێویستم بە کەسێکە کە ئاگادارم بێت و لەسایەیدا ئارام بگرم.

ماکوان: خوا بداتێ، برسیمە بچینە کافتێریای قیتارەکە شتێك بخۆین.

کرۆنیکا: با بڕۆین.

ماکوان: سەرپۆشەکەت لابردووە بەسەرتەوە، سویند بەخوا بەو سەرپۆشەوە مەعقولتر و جوانتر و خاوەن شەخسێتی، دە بیدەرەوە بەسەرتا.

کرۆنیکا: باشە بەسەرچاو، بەخوا لەبیرم چوو ؛لەبەر تۆ مادام حەز دەکەیت هەر لای نابەم.

ماکوان: خوای گەورە هیدایەتت بات.

ڕۆشتینە کافتێریاکە لەوێ من داوای ساندویچم کرد ئەویش وەکو من، کە دانیشتین کوڕێکی گەنج کە زۆر لەمن منالتر بوو تەمەنی لە ٢٥ساڵ دەچوو، هات وتی کاك ماکوان من ناوم بڕیارە، خەڵکی ناوچەی جوانڕۆم، زۆر هۆگری جەنابتم حەز دەکەم وێنەیەك بەیەکەوە بگرین.

ماکوان: بەخۆشحاڵییەوە برا گیان، چووم ساندویچێکم بۆ هێنا، خەیاڵم نەبوو کە بۆمبێکی ئەتۆمم لەگەڵدایە، تا گەڕامەوە تەماشا دەکەم کرۆنیکا داویەتی بە ڕاستی قسەیا لەگەڵ ئەو کوڕەدا.

ماکوان: فەرموو کاك بڕیار.

بڕیار: کاك ماکوان گیان دەستت خۆش بێت، خێزانی بەڕێزت وێنەکەمان بگرێت ئاساییە؟

ماکوان: بەڵێ، بەڵێ زۆر ئاساییە.

وێنەیەکمان گرت، گەنجە بەڕێزەکەش ماڵئاوایی لێکردین.

ماکوان: چیت بەو کوڕە وت کرۆنیکا؟

کرۆنیکا: بۆ پاراستنی تۆ وتم کە خێزانی ماکوانم، ئەگەر پێت ناخۆشە ئەچم پێی ئەڵێم (من گێڵ فرێندی ماکوانم).

کەوای وت پێەئەکەنی.

ماکوان: دابنیشە و دەمت دابخە.

خەریکی نانخواردن بووین ئەوەنەم زانی کەوا ژنێکی بەتەمەن لەگەڵ بڕیار بەرەو ڕووی ئێمە هاتن.

بڕیار: کاك ماکوان، ئەوە دایکمە حەز ئەکات قسەت لەگەڵ بکات.

ماکوان: خۆشحاڵ دەبم، دایکی بەڕێزی ئێمەشە.

دوای سڵاوکردن لە بەڕێزیان وتم چی دەخۆیت یان خواردنەوە چیت دەوێت بیخەمە خزمەتی جەنابتان، کوڕەکەی وتی دایکم ناوی توبایە.

توبا خان: ئەرێ ماکوان گیان ئەوە چییە ئەیخۆیت، بابچینە ماڵی ئێمە خۆم خواردنتان بۆ حازر دەکەم، بەخوا کە بڕیار وتی ئەوە ماکوانە و خێزانی لەگەڵایە ئەوەندە خۆشحاڵ بووم، وتم ڕۆڵە ماکوان لێرەیە چۆن ئەیەڵم بڕوات، تالەماڵی ئێمە نان نەخوات ناڕوات. بەخوا صاڵح-ی مێردم ئەوەنە تەماشای تۆ دەکات، تەماشای تەلەفزیۆن هەر ناکات. دێت و دەڕوات دەڵێ بە قەولی ماکوان. ڕووی کردە کرۆنیکا و وتی دەی باوکەکم دوای دوو وێستگەی تر شارەکەی ئێمەیە دائەبەزین و ئەچین بۆماڵی ئێمە، دوایی بە ئەحمەوی زاوام ئەڵێم بتانباتۆ بۆ نەرویج.

ماکوان: بەخوا ماڵ ومناڵ تەنهان ئەبێ بڕۆم.

لەبیرم چووبووە وە کە کرۆنیکا پێی وتوون کە خێزانمە.

توبا: ئەی مناڵەکانت هان لەکوێ؟

کرۆنیکا: لای دایکمن.

توبا: دەی باشە خۆ تەنیا نین، بەخوا ڕۆڵە نەنك لە دایك دڵسۆزترە.

کرۆنیکا: ڕاستدەکەیت بەڵام ئیتر ماکوانە دایم سەری قاڵە، ئەگینا من حەز دەکەم بێمە خزمەتان.

توبا: قسە ئاوا ئەبێت، ئادەی بڕیار تەلەفون بکە بۆ فاتە با گۆشت و مریشك حازر بکات و بڵێ میوانمان هەیە، بە صاڵح یش بێژە بڵێ دیارییەکم بۆ هاوردووە.

ماکوان: نا بابیخەینە کاتێکی تر من پەیمانم داوە بە هاوڕێیەکم، چیمەن نازانێت.

توبا: نایەڵین مەوعیدەکەت بشێوێت دائەبەزن بەخوا.

# چوون بۆ ماڵی خوا

لەناو شەمەندەفەرەکە نەگەیشتبووینە خاکی نەرویج، لەناو خاکی نەرویج ڕێگای دەبری ئاشنا بووین بە کوڕیکی گەنج و دایکی بەناوی کاك بڕیار و توبا خان.

موحیبەت و میواننەوازی زۆریان نواند لەگەڵماندا تا دابەزین دوایی پەیمانی ئەوەشیان دا کە هەرخۆیان بمانگەیەننەوە بۆ نەرویج. ئاگام لێبوو کرۆنیکا زۆری پێخۆشبوو لەگەڵیان دابەزین، بەهەموویان زۆریان لە من کرد و فشاریان خستە سەرم کە دابەزم.

من ڕازی نەبووم لەگەڵیان بچم لەبەر چەند هۆکارێك.

یەکەم: بەهیچ شێوەیەك نەمدەویست هەڵەکەی ستۆکهۆڵم دووبارە ببێتەوە، دەمزانی کە کرۆنیکا بەو چاوەوە تەماشای ناکات کە من لێی تێدەگەم، چوونکە درۆیە و بەهیچ شێوەیەك جائیز نییە کەسێك بکەیتە هاوسەری خۆت.

دووەمیش: من ناسراوم ئەگەر بێت و ئەو خێزانە بەڕێزە ڕۆژێك من لەگەڵ خێزانم ببینن، ناڵێن ئەو کەسەی تر کێ بوو لەگەڵت؟

خۆ ئەگەر هیچیش نەڵێن خۆ مرۆڤ لاوازە و شك و گومانی بۆ دروست دەبێت، لەوانەیە چەندین قسەم بۆ دروست بکەن، لە نەتاشراو دایبتاشن. هەڵبەت سروشتی مرۆڤ وایە و ناحەقیشیان نییە، چوونکە ئەوان ڕاستی و دروستی من و کرۆنیکا نازانن.

لەبەر ئەوە زۆر داوای لێبووردنم لە توبا خان و کاك بڕیار کرد کە کرۆنیکا نازانێت، من ئەمڕۆ مەوعیدێکی زۆر گرنگم هەیە و ناشمەوێت وەعدە خیلاف بم لەگەڵ ئەو کەسەدا، بەلام پەیمان بێت جارێکی تر بەخزمەتیان بگەم.

هەرچۆن بوو ڕازیم کردن و ماڵئاوایم لێکردن، شەمەندەفەرەکە بەرەو نەرویج کەوتە ڕێ، تووڕەبوونێکی زۆرم پێوە دیاربوو، تا چەند خولەکێك هیچ قسەیەکم لەگەل کرۆنیکا نەکرد.

کرۆنیکا: ماکوان بچم ئاو یان شەربەتێکت بۆ بهێنم.

ماکوان: نا-تینووم نییە و هیچم ناوێت.

کرۆنیکا: بەخوا دەزانم لەمن تووڕەیت، ببوورە گەر دڵم ئازار دابیت، بەخوا مەجلیس و قسەکردنت ئەوەندە خۆشە حەزناکەم لێت جیاببمەوە.

ماکوان: ئاخر نەک لەسەر برینی من سەما بکەیت و بریندارم بکەیت، چۆن وا دەبێت. ئاخر خۆ تۆ خێزانی من نیت، تۆ حسابی ئەوە ناکەیت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان من و خێزانم ببینن و تۆیان لەبەرچاو بووە، خێزانی من کەسێکی تر بێت، لەو حاڵەتەدا چی ڕوودەدات؟

کرۆنیکا: بەخوا ڕاست دەکەیت، من هەڵە بووم داوای لێبوردن دەکەم، چی دەڵێیت وا دەکەم، تەنها ئەم جارە لێم خۆش بە.

ماکوان: ئەوەی ڕوویدا کۆتایی هاتووە، هەوڵ بدە جارێکی تر شتی وا ڕوونەداتەوە، ئەوەی پێم وتوویت ئەنجامی بدە بزانین چی بەسەر فرانك دێت، ئەوە تاکە ڕێگایە بۆ چارەسەر لە ئێستادا.

کرۆنیکا: زۆر باشە ئەوەی تۆ دەیڵێیت جێبەجێی دەکەم و خاڵی لێناپەڕێنم.

ماکوان: زۆرباشە، خوای گەورە هیدایەتی تۆش بدات، بەڵکو نووری ئیمان لە دڵتدا دابگیرسێت.

کرۆنیکا: ئەتوانیت باسی ئەوە بکەیت کە کامە ئایین ڕاستە؟

ماکوان: بەڵێ، بۆت باس دەکەم، بەڵام پێویستە زۆر بە وردی گوێ بگریت و لێی تێبگەیت، ئەوەش بزانە من ناتوانم لە کاتێکی ئاوا کەمدا باسی هەموو ئایینەکانت بۆ بکەم.

تەنها سەرەتایەکت دەدەمێ دوای ئەوە دەبێت خۆت هەوڵ بدەیت بەدواداچوونی بۆ بکەیت و لەسەر ئایینی ئیسلام و هەموو ئایینەکانی تر بخوێنیتەوە، بەڵام گرنگە ئایین بناسیت لە سێ خاڵدا (خوا، پەیامبەر، پەیام).

واتە کە خوات ناسی پێویستە بزانیت بۆ خوا دەناسیت و چۆن خوا دەناسیت، لەبەرچی خوا دەناسیت؟، ئەم (بۆچوونە لەبەرچییە) زۆر گرنگە. خەلکی تەمەل یان ئەو کەسانەی کە هیچ بیرکردنەوەیەکیان بۆ (ژیان و گەردوون) نییە ناپرسێت ئەم گەردوون و مرۆڤ و ژیانە چۆن هاتووە و بەرەو کوێ دەروات.

کرۆنیکا: پەلەم لێمەکە با هەمووی بنووسم، چوونکە گرنگە بۆ من.

ماکوان: مادام ئاوا جدیت لەسەر ئەوەی فێر بیت، دوای قسەکانمان سەرچاوەت ئەیەمی کە بزانیت لە کوێوە دەست پێ بکەیت، بۆئەوەی بەباشی تێ بگەیت لەهەموو ئەو چەمکانەی باسم کرد.

کرۆنیکا: زۆرباشە، خۆم لە دڵمدا بوو پێت بڵێم کە هەندێک سەرچاوەم بدەیتێ.

ماکوان: بەسەرچاو لە عەرەبی، کوردی و ئینگلیزی سەرچاوەت ئەیەمێ لە کتێب و زانیاری و ئینتەرنێت و دەنگ و وێنەی ڤیدیۆیی.

کرۆنیکا: وەڵڵا باشە، مەمنونیشت دەبم.

ماکوان: گرنگە بە چاوی زانستی و کۆنکرێتی تەماشای ئایین نەکەیت، چوونکە زانست لە ئاستی ئاییندا زۆر خورافیاتە!

کرۆنیکا: زانست خورافیاتە؟

ماکوان: لە قسەکەم تێبگە، زانست لە ئاستی ئاییندا نەك خورافیات و مثیۆلۆجیایە، بەڵکو گاڵتە بە زانست دەکەم کە دەیەوێت دەوری ئایینیش ببینێت و وەڵامی پرسیارەکانی مێشکی خەڵکی بداتەوە.

کرۆنیکا: خۆ ئاساییە ئەگەر بڵێم تێناگەم؟

ماکوان: بە دڵنیاییەوە ئاساییە، بۆ ئەوەی تێبگەیت ئەم کورسی شەمەندەفەرەی کە لەسەری دانیشتوویت دەکرێت بڵێین دوای ۱۰۰۰ ساڵ ئەقڵی بۆ دروست دەبێت و ژیانی هەبێت و پاشان ئامانجیشی بۆ دروست دەبێت؟!

کرۆنیکا: نەخێر، شتی وانابێت.

ماکوان: ئەگەر وتمان دوای یەک ملیۆن ساڵ ئەم کورسییەی لەسەری دانیشتوویت دەتوانێت لە خۆیەوە ئەقڵ و ئامانج و ژیانی بۆ دروست ببێت؟

کرۆنیکا: نا شتی وا ڕوو نادات، ئاستەمە. چۆن شتی وا دەبێت.

ماکوان: ئێ زانست وا دەڵێت کە هەموو شتێك لە ماددەی نازیندوو دروست بووە، پاشان ژیان و ئەقڵ و ئامانجی بۆ دروست بووە.

کرۆنیکا: بە دڵنیاییەوە خورافەیە.

ماکوان: ئەی تۆ و چەندین فەیلەسوف بڕواتان بەو خورافەیە هەیە، کە باسی ئایین دەکرێت ڕاستەوخۆ دەڵێن ئێمە بڕوامان بە زانست هەیە.

کرۆنیکا: وەڵڵا ڕاست دەکەیت، من ئێستا تا ڕادەیەك مێشکم فراوانتر بوو، پێشتر هەموو شتێکم لە تەکنەلۆجیا دەبینیتەوە.

ماکوان: تەکنەلۆجیا خزمەتی مرۆڤایەتی زۆر کردووە، بەڵام توانا و ئیمکانییەتی زۆر سنووردارە و لاوازە، ناتوانێت وەڵامی پرسیارە وجودیەکان بداتەوە.

کرۆنیکا: واتا دین داوای شتێك دەکات لە مرۆڤ زانست و فەلسەفە ناتوانێت ئەو شتانە شیتەڵ بکەن، وایە؟

ماکوان: بە دڵنیاییەوە، ئەوە ڕاستی و دروستی ئایینە، کەواتە هەر ئایینێك توانی وەڵامی ئەو پرسیارە وجودیانە بداتەوە ئەوا دڵنیابە ئایینی ڕاستەقینەیە.

کرۆنیکا: وجود واتای چییە؟

ماکوان: واتای ئەوەیە من بۆچی لێرەم، بۆ هاتووم، بۆ کوێ دەچم، ئەرکەکانم چییە؟ کێ بەدیهێنەرە؟ مردن چییە؟ دۆزەخ و بەهەشت لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە؟...هتد.

کرۆنیکا: لێرەدا دەمەوێت پرسیارێك بکەم، ئیسلام وەڵامی ئەم پرسیارانەی داوەتەوە، یاخود ئایینەکانی تریش؟

ماکوان: بە دڵنیاییەوە هەر ئایینێك لەلایەن خوای پەروەردگارەوە هاتبێت وەڵامی ئەم پرسیارانەی داوەتەوە.

کرۆنیکا: کەواتە دێمە سەر ئەو پرسیارەی کە کام ئایین ڕاستە؟

ماکوان: هەموو ئایینەکان لە ئادەمەوە تا موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) یەک ئایینە و بەگوێرەی زەمەن و شووێن شەریعەتەکەیان جیاوازە، دەنا هەموویان ناویان ئایینی ئیسلامە.

کرۆنیکا: کەواتە من دەتوانم مەسیحی بم یان یەهودی یان ئیسلام؟

ماکوان: نا ناتوانیت، چوونکە کە مرۆڤایەتی بەتەواوەتی خۆی ناسی و بنەمای ژیار و شارستانییەتی دارِشت خوای پەروەردگار کۆتا شەریعەتی نارد کە شەریعەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ە و کە کۆتا پەیامبەری ئیسلامە، منش دەگەڕێمەوە سەر ئەو سێ چەمکەی کە بۆم باس کردی (خوا، پەیامبەر، خودی پەیامەکە) تەنها ئیسلامە و ئایینی پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەتوانێت کە وەڵامی هەموو پرسیارەکان بداتەوە، دەبێت بزانیت ئایین چەند پێوەرێکی ڕاستەقینەی ئەقڵی و زانستی هەیە، تا بڕوای پێبکەیت.

کرۆنیکا: ئەم قسەیە زۆر گرنگە ئەو تیۆرانە چین کە بزانم ئیسلام یاخود هەر ئایینێکی تر ڕاستە.

ماکوان: پێوەرەکان بریتین لە: کارکردن لەسەر ئەو سێ چەمکە (خوا، پەیامبەر، پەیام).

ناسینی خوا سێ پێوەرە: یەکەم: عەقڵ، دووەم: زانست.

بەم دوو چەمکە خوا ئەدۆزینەوە، کە خوات دۆزییەوە دەچیت بۆ ئایین.

پێوەری ئایین چییە، ئەویش لە دە خاڵ دا بۆت کورت دەکەمەوە.

کرۆنیکا: پەلە مەکە با هەمووی بە جوانی بنووسم.

ماکوان: پەلەم نییە و بەجوانی بینووسە، بەڵام تکام وایە کاری لەسەر بکەیت و زیاتری لەسەر بخوێنیتەوە.

کرۆنیکا: بە دڵنیاییەوە من بووم و دەمەوێت خۆم بدۆزمەوە، پێوەری ناسینی ئایینی ڕاستەقینە چییە؟

ماکوان: وەکو وتم دە خاڵە.

یەکەم: خوا بە مرۆڤەکان بناسێنیت، کە زانیت زاتی بەرزە کێیە و چۆن بیناسیت.

دووەم: ئامانجەکانی مرۆڤ لەو ئایینەدا ڕوون بکاتەوە بوونی مرۆڤ و دروست کردنی بۆ چییە؟

سێیەم: هەموو داواکاری بەندایەتی و تیۆر و چەمکەکانی لە چوارچێوەی ئەقلی مرۆڤ دا بێت بە گشتی.

چوارەم: بەڵگەی ئەقڵی لۆژیکی هەبێت بەرانبەر بەو چەمك و تێزانەی کە دەیانخاتە ڕوو بۆ مرۆڤ.

پێنجەم:هیچ دژ بەیەکێك لە چەمك و تێزەکاندا نەبێت لەو ئایینەدا کە بۆ مرۆڤ دەیخاتە ڕوو.

شەشەم: هەموو دەقی ئەو ئایینە لەگەڵ یاساکانی سروشت و ئەخلاقی مرۆڤ واتا فیطرەتی دژ بەیەک نەبن و لەگەڵ یەك تێکنەگیرێن و وەکو دەنکی ملوانکە بەدواییەکدا بهۆنرێتەوە.

حەوتەم: ئایینەکە بەهیچ شێوەیەك چەمك و تێزەکانی نابێت لەگەڵ زانستی ڕاستی و موعتەبەر دژ بەیەك بن.

هەشتەم: ئایینێکی واقیعی و مرۆڤ بتوانێت لە ژیاندا جێبەجێ بکات.

نۆیەم: ئایینەکە دەبێت لەگەڵ ژیار و شارستانییەتی مرۆڤایەتی دا بڕوات و هیچ دژ بەیەکێك نەبێت لە درێژبوونەوەی زانست و ژیار و شارستانییەتەکاندا لە ڕووی پێشکەوتن و تەکنەلۆجیا..هتد، دەبێت ژیار و شارستانییەتی ئایین لەگەڵ واقیعی مرۆڤەکاندا هەنگاو بنێت و لەیەك جیا نەبنەوە.

دەیەم: ئەو کەسەی ئایینەکە دەهێنێت ناسراو بێت و لە منداڵی تا مردن شتی شاراوەی نەبێت، هەموو ژیان کراوە بێت لە بەردەم یار و یاوەرانی دا.

ئەمە بەگشتی پێوەری ئایینە بۆ هەڵبژاردن

کرۆنیکا: وەڵڵا ئەوە زۆر موهیمە، ئەی پێوەری پێغەمبەرەکە چییە؟

ماکوان: پێوەری پێغەمبەری ڕاستی بریتیە لە:

یەکەم: دەبێت لە جنسی مرۆڤ بێت، نابێت مرۆڤ بێت و بڵێت من خوام، یان فریشتەم یان هەر بوونەوەرێکی تر بێجگە مرۆڤ.

دووەم: دەبێت ئەو پەیامبەرە کاری یەکەم و کۆتایی گەیاندنی پەیامەکە بێت و هیچ جۆرە پەیامێکی تری تێکەڵ نەکات، بێجگە پەیامی خوایی.

سێیەم: پەیامبەرەکە دەبێت ئایینەکە بناسێت.

چوارەم: هیچ پەیامبەرێك نابێت لەدوای خۆی باڵەخانە و دەسەڵاتی حومکڕانی بۆ نەوەکانی بەجێ بهێڵێت.

پێنجەم: ئەوەی ئایین داوای دەکات جێبەجێی بکات پێش هەموو شووێنکەوتوانی.

شەشەم: پەیامبەرەکە دەبێت خاوەنی موعجیزە بێت، کە هەموو مرۆڤەکانی دووروبەری بە یار و نەیارەوە شاهیدی بۆ بدەن. ئەو موعجیزانەش نابێت لە توانای مرۆڤ و تەکنەلۆجیا و شتەکانی تردا بێت.

حەوتەم: دەبێت ڕاستگۆ بێت، ئازا بێت، بەخشندە بێت، وەرنەگرێت بەڵکو ببەخشێت، لەسەرووی هەمووشیەوە دەبێت کەسێکی ناسراو باوەڕپێکراوی ناوخەڵك بێت. پێشتر هەوڵی بۆ دەسەڵات و پلە و پایە و مەنسەب نەدابێت.

هەشتەم: نابێت وەكو پاڵەوان و داستان و چیرۆكە خورافییەكان بێت، دەبێت هەموو سیفات و پێناسەی پێغەمبەرانی هەڵگرتبێت.

نۆیەم: دەبێت ژیانی لەناو خەڵكیدا بێت و تێكەڵاوی خەڵكی بێت، نەك دابڕاو وەكو ڕاهیب و پاشا و قەیسەر و فیرعەونەكان.

دەیەم: لەماوەی ژیانیدا دەبێت پەیامەكەی گەیاندبێت، هیچ كەموكورتی و بۆشایی جێنەهێشتبێت.

ئەوە سیفات و نیشانەی پێغەمبەری ڕاستەقینەیە.

كرۆنیكا: زۆرباشە ئەوەشم نووسی، ئەی ئەتوانیت سەرچاوەم بدەیتێ بۆ ئەوەی زیاتر لەسەر ئەم باسانە بەرچاوم ڕوون بكاتەوە؟

ماكوان: بەپشتیوانی خوا كە چوویت بۆلای ئاواتی برات خۆم سەرچاوەت بۆ دەنێرم، بەڵام ئەدرەسەكەم بە نامەیەک بۆ بنێرە. وەك پێم وتی بەناوی خۆت داوای سیمكارتی تەلەفۆن مەكە با یان بەناوی دایكتەوە بێت یان ئاواتی برات.

هەوڵبدە دایكیشت بەرە با مانگی ڕەمەزان دایكت لای ئاوات بێت، تۆش خوای گەورە هیدایەتت بدات و موسوڵمان بیت.

كرۆنیكا: زۆرباشە، بەڵام جێگای ئاوات زۆر ناخۆشە، ئەو جێگایە ژیانی تێدا نییە.

ماكوان: چارە نییە، باشە خۆتۆ ئیشت نییە لەم شارە بۆ ناچیت بۆ شارێكی تر بژیت، ماوەیەك لەوێ بمێنەرەوە بۆ دایكیشت ئاسانتر دەبێت.

کرۆنیکا: با بیری لێ بکەمەوە بزانم چۆن دەبێت، ئەزانیت کە ڕۆیشتن و نیشتەجێ بوون لەشارێکی تر هەروا ئاسان نییە.

ماکوان: بۆ ئاسان نییە، وەڵڵا زۆر ئاسانە و زۆریش ئاساییە، خۆ ناچیت بۆ وڵاتێکی کە زمانەکەیان نەزانیت، نەرویج هەمووی لەیەك دەچێت.

کرۆنیکا: نا بەقسەت دەکەم، چوونکە کاتێك لەماڵی شێخ عومەر بووین قسەیەکی زۆر نایابت کرد، کە شێخ فەرەیدوون لێی پرسیت کاتێك مرۆڤ تۆبە دەکات دەبێت چی بکات تا بەردەام بێت لەسەر تۆبەکەی، چی بکات باشە؟

لەوەڵامدا تۆش وتت، باشترین شت هیجرەت کردنە لەو جێگایەی کە تاوانت لێ کردووە بۆ جێگایەکی تر کە تاوانت تێدا نەکردووە.

لەدڵی خۆمدا سوپاسی خوام کرد کە نەک بڕوای هەیە بەڵکو خۆی ئامادە کردووە بۆ تۆبە کردن.

ماکوان: زۆر خۆشحاڵم کە ئەوا گوێت بۆ قسەکانم گرتووە و لێی تێگەیشتوویت.

کرۆنیکا: حەزدەکەم ڕاستییەکت پێ بڵێم، ئەویش ئەوەیە کە من هیچ موعجیب نیم بە دەموچاوت، باش دەزانیت کە لەم ئەورووپایە خەڵکی لێیە کە زۆر لە تۆ جوانتر و قۆزترە، دەوڵەمەند تر هەیە کە من بتوانم لەگەڵیدا ژیان بکەم، بێجگە ئەورووپی کورد هەیە مەمنونی پێڵاوەکانی تۆیە لەم وڵاتەدا کە من شوووی پێ بکەم.

لەدڵەوە قسەکەیم پێناخۆش بوو پێم وت: کێ داوای لێکردوویت کە موعجیبم بیت، نە داوای پەیوەندی خۆشەویستیم لێکردوویت نە داوای

زەواجیش، ئیتر کێ داوات ئەکات و کێ تۆ پێی ڕازیت فەرموو کێ دەستی گرتوویت.

کرۆنیکا: دەبهێڵە با قسەکەم تەواو بکەم، بزانە دەمەوێت چی بڵێم.

ماکوان: فەرموو...

کرۆنیکا: ویستم ئەو پەیامەت بدەمێ کە تۆم لە خۆم خۆشتر دەوێت، نەك بەمانای قۆزی و باڵا و جوانی، بۆیە ئەگەر قاچیشت نەبێت و دەستت نەبێت کەسێکی خاوەن پێداویستیش بیت، بەڵام من بەڕاستی موعجیبی کەسایەتیتم وەکو وتم لەماڵی شێخ عومەر سەرنجم دابوویت زۆر بە عیشق و لە دڵتەوە لەسەر ئەم دینەت قسەت دەکرد، کەسایەتی و پیاوەتی تیا بەدی دەکرا، ئاخر چۆن شێتی کەسایەتیت نەبم، لەکاتێکدا من ویستم خراپەت لەگەڵ بکەم تۆ لە ئاواتی برام و باوکم باشتر پاڕاستمت لەدەستی ئەو کەسەی بە حساب خۆشەویستم بوو، ڕزگارت کردم کە دەیویست بمکوژێت. ئاخر ماکوان چۆن بتوانم لەبیری بکەم ئەوی تۆ دەیکەیت، کەسی تر دەیکات؟

ماکوان: سوپاس، بەڵام دڵنیابە خەڵکی تری زۆر لەمن باشتر و پیاوتر هەن، هەر بۆ نمونە هاوڕێکانم لەم باشتر بوون کە هاوکاری منیش و تۆشیان کرد، خەڵکی تر هەیە بێ ئەوەی کەسەکان بناسن هاوکاری دەکەن و ماڵ و ژیانیان بۆ دابین دەکەن، یەکێك لەوانە باپیری تۆیە بەڵام لە بەر ئەوەی کە تۆ نەتبینیوون و نەتناسیوون، بۆیە تەنها منت لەبەرچاوە.

کرۆنیکا: بەهەرحاڵ ئەوەی لەبەرچاوی مندایە و ناسیومە و ئەزموونم لەگەڵیدا هەیە تۆیت، بەئاسانی و بەخۆڕایی لاشەم خستە بەردەستت نەك هەر تەماشات نەکرد بەڵکو داتپۆشی.

ماکوان: هەر دەبێت وابێت، چوونکە من ئێستا تۆ بانگ دەکەم بۆ ئایینێک ئەگەر ڕاستگۆ نەبم لەگەڵ ئایینەکەم و خۆشمدا تۆ چۆن بڕوات پێدەکردم.

کرۆنیکا: ڕاستە وایە، من ئێستا چەندە تۆ بەڕێز و خۆشەویستی لام، ئەوەندە بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام پەلەمە.

ماکوان: لەدوای پێنج خولەکی تر من ماڵئاواییت لێ دەکەم، ئەوەی پێم وتیت بیکە.

من گەیشتمەوە شارەکەی خۆم و لە سویدەوە تا نەرویج بەو قسانە بەسەرمان برد، ئاگاداریشم کردەوە کە بەهیچ شێوەیەك تەلەفۆن بۆ من نەکات لەکاتێکدا لەناو ماڵ و منداڵی خۆمدام. لەکۆتاییدا ماڵئاوایم لێکرد و دابەزیم بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە.

ئەی کە خۆشحاڵ و ئارام بووم کە گەیشتمەوە ماڵەوە، ماوەیەکی کەمی مابوو بۆ مانگی ڕەمەزان، ئەو ماوەیە سەرقاڵی چالاکییەکانی ناو فەیسبوك و تۆڕە کۆمەلایەتییەکان بووم بە تایبەتی لە یوتیوب.

مانگی ڕەمەزان هات و بەخۆشی و شادییەوە پێشووازیمان کرد و مانگێکی پڕ خێر و خۆشی بوو، تا ١٥ی رەمەزان هیچ ئاگام لە کرۆنیکا نەبوو، تا بە ژمارەیەك ناونیشانەکەی خۆیانی بۆ ناردم منیش زیاد لە ٢٠ کتێبم بۆ پۆست کرد کە هەمووی کتێبی چاك بوون لەو بوارەدا شیکاری و بۆ ئەو چەمکانە کردبوو کە پێشتر بۆم باس کردبوو.

لە دەوروبەری ١٥ی ڕەمەزاندا بوو کە دایکی کرۆنیکا تەلەفۆنی بۆ کردم وتی ماکوان گیان هەندێك پارەم لایە ئەمەوێت بۆت بنێرم بینێریت بۆ فەقیر و هەژار، منیش ڕەقەمی ئەو کەسەم دایە کە پارەکانی دابەش

دەکرد، وتم پەیوەندی بەوەوە بکە بۆ ئەوی بنێرە، من بەهۆی ڕەمەزانەوە سەرقاڵم ئەو کەسە پیاوێکی زۆر باشە بۆ ئەوی بنێرە.

فاتمە خان: ڕۆڵە خوای گەورە لە منت نەسینێت، وەکو ئەو کچەمت ساڵح کرد.

ماکوان: بۆ چیمەن بەڕۆژووە فاتمە خان؟

فاتمە خان: بەڵێ، بەڕۆژووە و نوێژیش دەکات، دوعای خیرت بۆ دەکەین هەردووکمان.

ماکوان: بێزەحمەت بمدەرێ با قسەیەکی لەگەڵ بکەم ئەو خوشکە ئیماندارەم.

بۆ یەکەم جار پێم وت؛ السلام علیکم!

کرۆنیکا: سڵاوت لێبێت بە سڵاوی ئیسلام

بە پێکەنینەوە ماکوان: ئەمە لەکوێوە فێربوویت؟

کرۆنیکا: بەخوا شەو بە لایڤەکانی تۆ دەخەوم یان وانەکانت.

ماکوان: ئەی الحمدلله چیت پێویستە کرۆنیکای خوشکم؟

کرۆنیکا: کتێبم بۆ پەیدا بکە.

ماکوان: باشە بۆ لەگەڵ دایکت ناچیت ئەم مانگی ڕەمەزانە عومرەیەك بکەیت، دە دوانزە ڕۆژێك لەوێ بە و عومرە بکە و کۆتایی ڕەمەزانێش شەوانی لەیلەتولقەدر لەوێ بن؟

کرۆنیکا: ئاخر نازانم چی بکەم ئەگینا زۆر حەز دەکەم بڕۆم.

ماکوان: من بۆتان ڕێك دەخەم بزانە دایکت حەز دەکات و دەتوانیت؟

کرۆنیکا: دایکم هەمیشە ئامادەیە.

ماکوان: دە بۆخۆتان بڕۆن بۆ مەککە و مەدینە منیش هەوڵ ئەیەم کام کۆمپانیایە باشە و هوتێلەکانی نزیکی حەڕەمە بۆتان پەیدا دەکەم، لەوێش کتێب بۆ منیش و خۆشت بکڕە، باشە؟ من پارەی سەفەرەکەشتان بۆ ئەیەم.

کرۆنیکا: وەی بەخوا نابیت، جا چۆن دەهێڵم.

گوێم لە دایکی بوو وتی وەڵڵا هەر ئەمەمان مابوو، ئەو خاوەنی ماڵومنداڵە و پارەی عومرەش بۆ ئێمە بات.

ماکوان: بۆ نابێت هەر پارەی ئەو قاتەیە کە بۆ منت کڕیوە.

کرۆنیکا: بۆ برای خۆم کڕیوە جا ئەوە چییە.

ماکوان: ئێ منیش ئەو سەفەرە بۆ خوشک و دایکی خۆم ئەکرم.

فاتمە خان: دەبەخوا ناچین تۆ پارە بەیت، ڕۆڵە ئەو هەموو پارەمان هەیە چی لێبکەین.

ماکوان: بەهەرحاڵ مەجالم بدەن چەند سەعاتێك تا هەواڵ دەپرسم و لەدوای بەربانگ ئاگادارتان دەکەمەوە.

فاتمە خان: باشە باوکەکەم، ها کرۆنیکا دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات.

ماکوان: با بفەرمووێت.

کرۆنیکا: ماکوان، مەملەکەتی شەیتان ڕاستە؟

زۆر پێکەنیم و وتم: دڵنیابە ڕووداوەکانی کە ڕوویانداوە ڕاستین، بەڵام من ناوەکانیانم گۆڕیوە و لەگەڵ شوێن و کاتەکەیدا، دەنا بە دڵنیاییەوە ڕاستە.

کرۆنیکا: من دەمەوێت لەگەل حەنانە قسە بکەم.

ماکوان: جارێ تۆ بڕۆ بۆ عومرەکەت، دوای ئەوە خوای گەورە ئاسانی دەکات، هەر تۆ نیت هەموو خەڵك حەز دەکەن لەگەڵ حەزقیل و سەسیل قسە بکەن، تۆ بۆ حەنانەت هەڵبژارد؟

کرۆنیکا: ئاخر وەك خۆم ئافرەتە، جائیز نییە لەگەڵ پیاو قسە بکەم.

ماکوان: ئەی خۆ کچم منیش پیاوم، ئەترسم بە قاز و مراوی و شتی وا لەمن گەیشتبیت.

کرۆنیکا قاقایەکی لێ یاو وتی: ئاخر تۆ برامی.

ماکوان: ئەی لەو دەمەت، سەعاتی بەچەند؟

کرۆنیکا: ماکوان گەردنم ئازاد بکە.

ماکوان: دوای عومرەکەت ئازادی دەکەم.

کرۆنیکا: ئەی ئەگەر پێش عومرەکەم مردم.

ماکوان: تۆ بمرە، وەعد بێت ئازادی بکەم،خوا ئەکات نەجاتم ئەبێت لە دەستی تۆ.

کرۆنیکا: باشە مادام ئەوەندە ڕقت لێمە ئیتر تەواو تەلەفۆنیش ناکەم.

ماکوان: نا ڕقم لێت نییە و خوشکی عەزیزی خۆمی، خواتان لەگەڵ. دوایی قسە دەکەینەوە با هەواڵی عومرەکەتان بۆ بپرسم.

کاتی بەربانگ بوو لەگەڵ مزگەوت و کۆمپانیاکەدا قسەم کرد بلیتێکی ١٠ ڕۆژی عومرەم بۆ پەیدا کردن و تەلەفۆنم کردەوە بۆ کرۆنیکا کە خۆی قسەیان لەگەڵ بکات.

ئەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژێك بوو لە ڕۆژەکانی ژیانم، دوو ڕۆژ دوای ئەوە کرۆنیکا تەلەفۆنی بۆ کردم وتی لە فڕۆکەخانەی ئۆسلۆین دەکەوینە ڕێ بۆ مەککە، سێ ڕۆژ لە مەککە دەبین و ٧ ڕۆژییش لە مەدینە.

ماکوان: کە چوویتە ماڵی خوا لە تەنیشت کەعبە و لای دەرگاکەیەوە کە ژێر عەرشی خوایە، لەوێدا دوعای خێرم بۆ بکە، تۆبەکەی خۆشت دووپات بکەوە و هەرچیت کردووە بۆ خوای باس بکە بە گریانەوە داوای لێ خۆشبوونی لێبکە و کە جارێکی تر ناگەڕێیتەوە سەر ئەو کارانە.

کرۆنیکا: بەسەرچاو، چیت ئەوێت بۆت بهێنم لەوێ؟

ماکوان: بەرەکەت، دوعای خێری تۆم بەسە، کە چوویت بۆ مەدینە سڵاوم بگەیەنە بە پێغەمبەری خوا و بڵێ ماکوان زۆری خۆش دەوێیت، بڕۆ ژووری فەرشە سەوزەکە ئەو ژوورە بەینی مینبەر و ڕەوزەیە لەوێدا دوعا زۆر بکە، لەو جێگایەدا دوعا گیرایە، چوونکە باخێکە لە باخەکانی بەهەشت.

ئەوان ڕۆیشتن و منیش سەرقاڵ بووم بە ڕەمەزانەوە، بەڵام لە سعودیەوە پەیوەندییان هەبوو لەگەڵم، کرۆنیکا پرسیاری دەکرد لەسەر دروشمەکان و جێگا و عیبادەتەکان.

یەکەم ڕۆژی جەژن لەدوای نوێژی جەژن لەگەڵ مالومنداڵ چووینە دەرەوە بۆ پشووو و گەڕان تا ماندوو بووین، کاتێك گەڕاینەوە لە نزیك ماڵی خۆمان کازۆڵم بینی دەڕۆشت، زانیم پەیامی پێیە بۆ من منیش ماڵومنداڵم دابەزان و بەرەو مزگەوت کەوتمەڕێ، زۆری مابوو بۆ نوێژی عەسر بەڵام مامەوە لەپڕ ڤرەی کازۆڵ هات و جەژنە پیرۆزەی لێکردم وتی: شێخ بەرقان و حەزقیل و برایان و خوشکان حەز دەکەن بتبینن.

ماکوان: وەڵڵاهی منیش موشتاقم بۆ بینینیان، لەکوێن، چۆن بیانبینم؟

کازۆڵ: دەڕۆین بۆلای ئەوان!

ماکوان: کەی؟

کازۆڵ: بەردەکەی حەزقیل هەڵبگرە و هەفتەیەك دوای جەژن بەیەکەوە سەفەر دەکەین، کە کاتەکە نزیك بوویەوە جێگات بۆ دەست نیشان دەکەم.

ماکوان: ئەی بۆ ئێستا نەڕۆین؟

کازۆڵ: بەدەست من و تۆ نییە، دەبێت ئەوان کاتمان بۆ دیاری بکەن. بەتایبەت ئەگەر مرۆڤ بچێت بۆ لایان.

ماکوان: زۆرباشە ئەی تۆ چۆنی، دەنگوباست ئوستاز کازۆڵ؟

کازۆڵ: زۆر باشم سەسیل بۆی گێرامەوە کە چوویت بۆ ستۆکهۆڵم و کرۆنیکا زۆر گۆڕاوە، خوا جەزای خێرت باتەوە کاریگەری باشت لەسەر داناوە.

ماکوان: سوپاس بۆ خوا هەموو فەزڵی ئیسلامە بەسەرمانەوە، جا ئەگەر ئەم دینە و نیعمەتەکانی نەبێت بەخوا ژیان هیچ قیمەتێکی نییە کازۆڵ گیان، جوانی ئەم ژیانە لە خواناسی و دینداری و ناسینی ئەم قورئانەدایە.

کازۆڵ: بە دڵنیاییەوە ڕاستە، بەڵام بەداخەوە خەڵك منەتی ئیسلام قوبوڵ ناکات، بەڵکو منەت بەسەر ئیسلامدا دەکات، ئەوەی لە تۆدا بەدی دەکەم منەتی ئیسلام هەڵدەگریت و هەمیشە خۆت بە قەرزارباری ئەم دینە دەزانیت، ئەوەی وای لێکردم کە هەمیشە دۆستت بم و خۆشم بوێیت وەکو برای خۆم.

ماکوان: بارك الله فیکم ئوستاز کازۆڵ خوای گەورە لە سوڕەتی (الحجرات) ئایەتی ١٧ دا باسی ئەو منەتە دەکات بەسەرمانەوە.

يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ

واتە: ئەوانە منەت دەکەن بەسەر تۆدا کە گوایە موسوڵمانن، پێیان بڵێ: منەت مەکەن بەسەرمدا لەسەر موسوڵمان بوونەکەتان، بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەر ئێوەدا کە هیدایەتی داون بۆ ئیمان و باوەڕ ئەگەر ئێوە ڕاستن لە ئیمان و باوەڕتاندا.

کازۆڵ: بەڵێ دەزانم خوای گەورە لێتان قبوڵ بکات.

ماکوان: ئامین، ئەی هیچ ئاگاداری ئەو نالەبارە نیت وەرماش، وا خۆی بێدەنگ کردووە.

کازۆڵ: نا، بەدوای داواکاریەکانتدا دەگەڕێت، دەیەوێت بە ئاشتی بەیەکەوە کار بکەن. دەزانێت کە تۆ لەو جۆرە کەسایەتیانەی کە لەگەڵتا توند بن تۆش توند دەبیت، هەروەها بە پێچەوانەشەوە. بۆیە هەوڵ ئەدات

دڵت ڕازی بکات، بەڵام داواکانت قورسە، بۆیە هەرچی دەکات دەیەوێت داوا قورسەکەت بهێنێتە دی. تا ئەویش کۆنتراکتەکەت لەگەڵ ببەستێت و دوای ئەوە کۆنترۆڵت بکات.

ماکوان: من تێناگەم چۆن ئەو برایانەی ئاوا بەئاسانی گرت و بەئاسانیش ڕزگاری کردن و داوای هیچی لەمن نەکرد.

کازۆڵ: وەکو وتم ئەو ئەزموونی هەیە لەگەڵ مرۆڤ داو هەزاران مرۆڤ کاری لەگەڵ دەکەن، ئەزانێت چۆن مامەڵە دەکات جا لەبەر ئەوە بۆ تۆ ستراتیژی دوور و درێژی هەیە بەگوێرەی خوێندنەوەی من.

ماکوان: پێشبینی چی دەکەیت کە داوام لێ بکات؟

کازۆڵ: ئەوەی من بۆی دەچم دەیەوێت بتکاتە بازرگان لەگەڵ جنۆکە مرۆڤەکان.

ماکوان: جنۆکە مرۆڤەکان چییە کازۆڵ، جنۆکە جنۆکەیە مرۆڤیش مرۆڤ.

کازۆڵ: نا هەندێك لە جنۆکەکان لە شێوەی مرۆڤدا بازرگانن و لەگەڵ خەڵکی مامەڵە دەکەن و خەڵک نازانێت کە جنۆکەیە، بەڵکو تێکەڵ بووە لەگەڵ خەڵکدا و کڕین و فرۆیشتن دەکات و تەنانەت زۆرێکیان خاوەنی دەسەڵات و کۆمپانیای گەورەن.

## مەملەکەتی جنۆکە

یەکەم ڕۆژی جەژن لەگەڵ کازۆڵ بەردەوام لە قسە و گفتوگۆکەماندا بووین زۆر سەرنجی ڕاکێشام بەوەی کە وتی لەناو ژیانی مرۆڤەکان جنۆکە بەئاشکرا لەسەر شێوەی مرۆڤ کاردەکەن و تەنانەت خاوەنی کۆمپانیا و دەسەڵاتن لە پێگەکانی سیاسیدا.

ماکوان: جا چۆن ئەم جۆرە خەڵکانە بناسینەوە لەناو کۆمەڵگەدا چۆن بزانین جنۆکەن؟

کازۆڵ: ئاسانە، هەرکام لە خەڵکەکەت بینی سەروەت و سامانی زۆرە، بەڵام خاوەنی هیچ خێزان و خانەوادە نییە، ئەوە بزانە کە ٪۸۰ی مرۆڤ نین چوونکە بەسروشتی خۆتان مرۆڤەکان خاوەنی خێزان و خانەوادەن، قابیلە خۆ لە کونە دیوارەوە نەهاتوون.

ماکوان: ئەها واتا ئەوە پێوەرە بۆ ناسینتان، ئەی چۆن ئاوا بەئاشکرا دەردەکەون لەناو خەڵکیدا بە هەمیشەیی؟

کازۆڵ: بەهەمیشەیی نییە، زۆربەی کاتەکان ونن، بەڵام لەکاتی پێویست کە دەزانێت کاریگەری مرۆڤەکانی لەسەر نییە دەردەکەوێت، ئەوەش بزانە کە جنۆکەکان هەرخۆیان نین، بەڵکو گروپن بەیەکەوە کار دەکەن.

ماکوان: ئەم جۆرە جنۆکانە لەکوێ هەن ؟

كازۆڵ: زیاتر لە شارە گەورەكان هەن كە چەندین ملیۆن كەسی تیا دەژی لەوێ دەردەكەون وەكو تاران، لەندەن، ئەستەنبوڵ، قاهیرە یان لە چین و مالیزیا و ئەندەنوسیا بەگشتی.

ماكوان: زیاتر چ جۆرە كارێك دەكەن؟

كازۆڵ: سەرقاڵن بە بارِ و قومارخانە و شووێنەكانی لەشفرۆشی و ئەم جۆرە كارانە، لە شووێنە بچوكەكان كار ناكەن چوونكە زوو ئاشكرا دەبن.

ماكوان: ئەی لەو جێگایانەدا حكومەتەكان پێیان نازانن؟

كازۆڵ: هەموو رِێگایەك دەگرنە بەر بۆ ئاشكرا نەبوونیان و لەرِووی پێناسە و دیكۆمێنت و پاسپۆرت، خۆیان باش تۆكمە دەكەن. خۆ ئەگەر پێشیان بزانن خێرا خۆیان ون دەكەن، لە ئەوروپا لەو جۆرانە زۆرن چوونكە بەدوای خانەوادە و ناوبانگدا ناگەرِێن، حكومەتەكان زیاتر سەرمایەدارن.

ماكوان: ئەی ئەم جۆرە جنۆكانە لە ئەمەریكا نین ؟

كازۆڵ: چۆن نییە، بەتایبەت لە لاس ڤێگاس زۆرن، لە هالیود نمونەیان زۆرە، لە هالیود ساحیریان زۆرە كە ساحیرەكانیان لەوێ بەكاردەهێنن.

ماكوان: جا هالیود چ پێویستی بە ساحیرە؟ ئەوان باشترین جۆری كامێرایان هەیە كە زۆر لە ساحیرەكان بەهێزتر و بەتوانا ترن.

كازۆڵ: بەشێكی قسەكەت رِاستە، بەڵام زۆر پێویستییان بە ساحیرە بۆ وەرگرتنی بیروباوەرِ و خەیاڵاتی سیحری. پاشان جۆری كاركردنی جنۆكە و مرۆڤەكان بەیەكەوە.

ماکوان: ئەم هەواڵەشت بۆ من نوێ بوو.

کازۆڵ: بڕوا بکە زیاد لە ١٠٠ ساڵە هالیود کار لەسەر ئەو ساحیر و جنۆکانە دەکات، بەشی تایبەتی خۆیان هەیە. تەنانەت دەرهێنەری ساحیریان هەیە.

ماکوان: ئەتوانی چەند نمونەیەکم پێ بڵێیت؟

کازۆڵ: لە کۆندا پێش ١٠٠ ساڵ لەمەوبەر کەسێك بەناوی (هاری هۆدینی)[١] یەکێك بوو لە ساحیرەکانی ناو هالیود لەساڵی ١٨٧٤ لەدایك بووە لە ١٩٢٦ مردووە، بەڵام لەدوای خۆی ١٠ کتێبی جێهێشتووە کە باس لە هونەری خەیاڵ و سیحر و جادووبازی دەکات و دژی ئەوانە بوو کە بەناوی سیحرەوە دەیانوت گوایە گیانی مردووەکان بانگ دەکەین، بەهەرحاڵ لەدوای خۆی چەند ساحیری بەجێهێشتووە لەهەموویان گرنگتر و ترسناکتر (یۆگار جمولی) ئەفریقییە، کە دەرناکەوێت زۆرێك لە فیلمەکانی کە باسی جادوو و خەیاڵ و شەیتان و چەند رۆحی پیس لە فیلمەکانی هالیود بەشداری پێ دەکەن کە هەمووی لە نووسینگەی یۆگارد دەنووسرێن.

لە نووسینگەی یۆگارد دا کەس بۆی نییە بچێتە ناوی، تەنها ئەوانە نەبێت کە لەگەڵ خۆی کار دەکەن. مەرجیش دادەنێت بۆ ئەوانەی کە لەگەڵی کار دەکەن، ئەویش ئەوەیە کە پێشتر لە سیحر و جادوو شارەزا بێت، کە خۆی سەرپەرشتییان دەکات.

ماکوان: ئەمانە زۆر ترسناکن، لە هەموو چین و توێژێك دا خۆیان ڕێك خستووە، بەڵام بانگەواز یان ئامادەکردنی گیانی مردوو چییە؟

---

[١] Harry Houdini

کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (تحضير الأموات)؟

کازۆڵ: گوایە ساحیرەکە بانگی ڕۆحی مردووەکە دەکەن، قسەی لەگەڵ دەکات.

ماکوان: جا شتی وا دەبێت؟ یان هەر لەجنسی جنۆکەیە خۆی دەکات بە مردووەکە؟

کازۆڵ: نا، هەر لەجنسی ئێمەیە، بەڵام ئەو جادووبازانەی کە بەناوی بانگکردنی ڕۆحی مردوو خەریکی جادووون زۆر ترسناکن. ئەوانە لە ڕێگای منداڵی نابالغەوە کار دەکەن، بۆ وێرانکردنی ماڵی خەڵك و ئاژاوەنانەوە. کاری سەرەکییان ئەوەیە خەڵکی بەیەکتر بکوژن.

ماکوان: بەڵێ شتێکی وام دەزانی، بەڵام وامدەزانی تەنها فرتوفێڵە. بۆیە منداڵ بەکار دەهێنن، چوونکە منداڵ هیچ نازانێت، ئەوانیش یاری و چەواشەکاری خۆیان لەڕێگای ئەوانەوە دەکەن.

کازۆڵ: بەشێك لە قسەکەت ڕاستە، (هاری هۆدینی) کە یەکێك بوو لە ساحیرە بەناوبانگەکانی سربیا، ئەویش دەیوت منداڵ دەخڵەتێنێت، بەڵام لە ڕاستیدا لەڕێگای ئەو منداڵەوە کۆنتراکت لەگەڵ دایك و باوکی دەکەن و ئاژاوە و خراپەکاری لەناو ئەو خێزانەدا بڵاو دەکەنەوە.

ماکوان: کەواتە هیچ نییە مادام تەنها چەواشەکارییە، بەڵام لەڕێگای منداڵەکانەوە دەیانەوێت دەست بگرن بەسەر خێزانەکەیدا، وایە؟

کازۆڵ: وایە.

ماکوان: ئەی باشە هاری هۆدینی کە سربییە چۆن لە هالیود کاری کردووە؟

کازۆڵ: هاری لە بنەماڵەیەکی یەهودی بووە، لە بۆدابێست لەدایك بووە، نازانم زانیاریت هەیە یاخود نا، بەڵام جوولەکە بە گشتی لە جادوو دا زۆر بەناوبانگن. زۆربەی جادووگەرەکان یەهودین.

ئەم کوڕە لە بنەماڵەیەکی جولەکەیە ئەو سەردەمە (مەجەڕ) سەربە ئیمپراتۆریەتی نەمسا بوو، دوای ئەوەی کە ناوبانگی دەرکرد لەناو (سێرکەکاندا) بانگیان کرد بۆ ئەمەریکا و لەوێ بەردەوام بوو لە سیحر و جادوو، لەبەر ئەوەی خۆی باش دەیزانی سیحر چەندە خراپە و پیسە دژی هەموو ساحیر و ئەوانەش بوو کە بەخۆیان دەوت ڕۆحانی، تەنانەت لە وەسێتنامەکەیدا دێڕێکی نووسیووە دەڵێت:

من بڕوام بە ئامادەکردنی ڕۆحی مردووەکان نییە، ئەگەر ئەوە ڕاست بوایە هۆدینی دەگەڕایەوە بۆ ژیان، بەڵام دڵنیابن هۆدینی بەڕێز و گەورە جارێکی تر ناگەڕێتەوە و بۆ ئەبەد نایبیننەوە).

ماکوان: جا مەبەستی چی بوو لەو دێڕە؟

کازۆڵ: مەبەستی ئەوەبوو کە ئەو لەو سەردەمەدا مامۆستای سیحر و جادوو بوو، ئەوانی بەدرۆخستەوە ئەگەر لە ژیانیشدا بوو زۆر گاڵتەی دەکرد بەوانەی خۆیان ناونابوو ڕۆحانی.

ماکوان: ئەی چۆن جنۆکە شەیتانەکان لێیان قبوڵ دەکرد؟

کازۆڵ: ئاخر خۆی زۆر ترسناك بوو لە جادووبازیدا، زیاد لە هەزاران جنۆکەی شەیتان لەگەڵیدا هاوکار بوون.

ماکوان: چی دەکرد ئەم ساحیرە؟

کازۆڵ: بە زنجیر و قوفڵی گەورە و بەهێز دەیانبەستەوە، دەیانخستە بەرمشاری گەورە، لە ماوەی چەند چرکەیەکدا خۆی ڕزگار دەکرد.

ماکوان: ئەوە فرتوفێڵ و تەکنیك نییە مەگەر؟

کازۆڵ: نا، ئەو خۆڕزگارکردنە بەتایبەت ئەوانەی کە یاری بە وەرەقەی پۆکەر دەکەن، ئەوە هەمووی سیحری بەهێزە، ئێستا ئەوانەی کەلە بارِە گەورەکانی لاس ڤێگاس یاری دەکەن زۆربەیان ساحیرە گەورەکانن، کە لە ڕاستیدا بۆ پارە یاری ناکەن، بەڵکو بۆ نواندنی هێز و پیشاندانی توانای ساحیرەکانە، ئێستا ئەوەندە زۆرن بۆ خۆناساندنیان پەنا دەبەن بۆ تیڤی و بەرنامەی بەناوبانگ بوون.

ماکوان: ئەم کەسەی باسمان کرد (هاری) ئەکتەر بوو؟

کازۆڵ: نەخێر، بەڵکو لەگەڵ کاری ئەکتەری دەرهێنەری فیلم و مێژوونوسی سیحر و ڕەخنەگری گەورەبوو لە ڕۆحانی و پاشان ساحیری گەورەی سەردەمی خۆی بوو، لە دوای ئەو (ڕاسبۆتین) بوو کە سیحرەکەی وەرگرت تا ئێستا ئەوەیە کە وەریگرتووە لێی (یۆگار)ە.

ماکوان: ئەی ئەم نالەبارە کێیە؟

کازۆڵ: ئەمە بێجگە لەوەی کە زۆر ترسناکە، نووسەر و خاوەنی چەندین کۆمپانیای دروست کردنی فیلم و زنجیرە درامای سیحر و جادوو و فیلمی ترسناکە. یەکێکە لە دەسەڵاتدارەکانی ناو هالیود، تەنانەت سێناتۆرەکانی ئەمەریکا و کۆشکی سپیش لێوەی نزیکن. متمانەیان پێیەتی و یەکێکە لەوانەی کە خاوەنی بڕیارە لەئەمەریکا و کاریگەری هەیە لەسەر سیاسەتی نێودەوڵەتی.

ماکوان: ئەمانە وەکو تەنی جاڵجاڵۆکە چوون بەناو یەکدا، جیا نابنەوە. تەماشا بکە چۆن ئەم دوو جۆرە شەیتانە یەکیان گرتووە، شەیتانی مرۆڤ و شەیتانی جنۆکە. چۆن یەکتری ئاگادار دەکەنەوە لە ئیشی خۆیان و دڵنیاشم کە هەموویان دژی موسوڵمانانن.

کازۆڵ: بەڵنیاییەوە، ئەوەی کە دەیانەوت و کاری بۆ دەکەن لەناوبردنی موسوڵمانان و دینی ئیسلامە.

ماکوان: بەڵێ بەداخەوە، تازە ئێمەش لە ململانێی سەلەفی و سوننی و سۆفی و...هتد داین. بەداخەوە هەست ناکەن کە ڕەوشەکە چەندە ترسناکە.

کازۆڵ: خوای پەروەردگار پشت و پەنای موسوڵمانانە.

ماکوان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە ئێمە خوامان هەیە ئەوانیش شەیتان، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە بەپێی پێویست موسولمان چاوکراوە نییە و هەست بە شتەکان ناکات، ئەوەیە مەبەستەکەم.

کازۆڵ: خۆی بەگشتی شارستانییەتی ڕۆژئاوا ترسناکە، وەکو موگناتیز وایە، هەموو تەنێك بۆ خۆی ڕادەکێشێت و پاشان بارگاوی دەکات بەخۆی.

سیستەمەکەشی زۆر ڕەقە و زۆر بێڕەحمانە لەگەڵ موسوڵماندا مامەڵە دەکات.

ماکوان: چۆن، لەمەبەستەکەت تێناگەم کازۆڵی برام.

کازۆڵ: هەموو ئایین و بیروباوەڕێك لەناو خۆیاندا دەتوێننەوە، ئەگەر بۆیان نەتوایەوە ئەوا کێشەی بۆ دروست دەکەن، ئەزموونی زۆریان وەرگرتووە

و بەهەزارەها پرۆفیسۆر و موفەکیر و دانشمەند کار دەکەن لەم ڕۆژئاوایەدا.

منداڵت دەبەن، هێز و توانات دەبەن لە کۆتایشدا بیروباوەڕەکەشت دەبەن بەناوی مافی مرۆڤ و دۆستایەتی و خۆشەویستی و مرۆڤدۆستی.

لەم قسانەدا بووین زۆر بەجددی قسەمان دەکرد حاجی مورادی چیچانی خۆی کرد بە ژوورا و وتی (السلام علیکم ابو آناء، عید مبارك)، منیش جەژنە پیرۆزەم لێکرد و نوێژمان کرد، دوای نوێژ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.

چاوەڕێ بووم کاتی بێت تا بچم بۆلای شێخ بەرقان و ئەوان، ئەو هەفتەیەم لێ نەدەڕۆیشت ئەوەندە چاوەڕێم دەکرد.

سێ ڕۆژ دوای جەژنی ڕەمەزان کرۆنیکا و دایکی تەلەفۆنیان بۆ کردم، بۆ جەژنە پیرۆزە. پرسیم سەفەرەکەتان چۆن بوو؟

کرۆنیکا: ئەتوانی ناوی منیش بنووسیت لەگەڵ دایکم بچم بۆ حەج.

(بەڵام دڵی پڕ بوو دەگریا) وام زانی ئیمانە لەدڵیدا بۆیە دەگری.

ماکوان: ئەوە ئیمانە لەدڵتا بەرزبۆتەوە و لە ترسی خوا دەگریت، یان لە خۆشی ئیمان؟

کرۆنیکا: نەوەڵڵا ئەو گەمژەی برام، هەموو پلانەکەی ئاشکرا کردووە بۆ فرانك.

ماکوان: چۆن وە بۆ؟

کرۆنیکا: لەم ڕۆژانەدا گەڕاوەتەوە، تەلەفۆنی کردووە بۆ ئاواتی برام وتوویەتی کرۆنیکا دەنگوباسی چۆنە، ئەویش وتوویەتی باشە، هیچ عەیبی نییە و لەگەڵ دایکمایە، پاشان پرسیویەتی ئێستا لە کوێن، ئەویش جێگاکەی ئێمەی ئاشکرا کردووە، نازانم چی بکەم زۆر بێتاقەتم.

ماکوان: فرانک قسەی لەگەڵ کردوویت، بە ژمارەی نوێت؟

کرۆنیکا: نا، بەڵام چەند جار پەیوەندی کردووە بە ئاواتەوە، من هیچم بۆ ئاواتی برام باس نەکردووە، پێی وتووە کە لەگەل دایکم چوون بۆ سعودییە، بەڵام دەزانێت لەم شارەین.

ماکوان: ئاساییە، لە ئێستادا هیچم لە مێشکا نییە ئەگەر ئەتوانن تەنها جێگاکەتان بگۆڕن، لەبەر سەلامەتی خۆت. تا بزانم چی بکەین باشە.

کرۆنیکا: خۆشم ئەوەم لە خەیاڵدایە، هەروا دەکەین، بەڵام پێویستە بەیەکەوە قسە بکەین زۆر زەرووره.

ماکوان: زۆز باشە من لە خزمەتام، بۆ زانیاریت کرۆنیکا ئەگەر جاران تاقەتی قسەم نەبوو لەگەڵت بەڵام ئێستا پاراستنی تۆ ئەرکی دنیا و قیامەتمە، دڵنیابە کە خوشکمی و دەستت لێ بەرنادەم، ئەگەر سەری خۆشم دابنێم.

کرۆنیکا: وەی بەساقەت بم، خوای گەورە بتپارێزێت و لە منت نەسێنێت.

ماکوان: ڕۆحی، یەکتری دەبینین، تۆ خوشکی ئازیز و بەڕێزی منیت.

تەلەفۆنەکەم داخستەوە زۆر خەمی کرۆنیکام بوو، ئەمجارە وەکو خوشك و کەسێک لە خانەوادەی خۆم، زیاتر پاڵنەری ئیمانی لە پشتەوە بوو،

دەموت ئاخر ناکرێت و نابێت خوشکێکی موسوڵمانم بە دەستی کەسێکی خوێڕی و خوانەناس یاری پێبکرێت. ئەگەرچی خۆشی سەرەتا بەشێك بووە لە کێشەکە، مادام تۆبەی کردووە و وازی لە هەموو شتێك هێناوە پێویستە و واجبی سەرشانمە هاوکاری بکەم.

بۆ بەیانی لەسەر کار بووم نزیك کاتژمێر ٢ بوو کرۆنیکا تەلەفۆنی کرد.

کرۆنیکا: زۆر پێویستە کە ئەمڕۆ بتبینم.

ماکوان: زۆرباشە من کاتژمێر چوار دەگەڕێمەوە، وەرە کوێت پێخۆشە لەوێ یەکتر ببینین.

دوای ئەوەی لە کار گەڕامەوە چووم بۆ ناو بازاڕ لەو شارەی لێی دەژیام نزیکی ٤٠ خولەك دوور بوو لە شووێنی کارەکەم، کە ڕۆشتم چوومە دوکانی هاورێیەکم کە دوکانی پیتزای هەیە لەوێ ناونیشانەکەم نارد بۆ کرۆنیکا کە بێت بۆ ئەوێ.

خاوەن دوکانەکە ئەهلی مزگەوت بوو، خەڵکی مەغریب بوو، کە چووم لە دەرەوە لە بەردەم دوکانەکە دانیشتم، پێم وت مونیر میوانم دێت جارێ نان ناخۆم لەگەڵ میوانەکەم بەیەکەوە پیتزا دەخۆین، ئەویش دەیزانی کە حەزم لە گۆشت و کەبابە، شیشێک گۆشت و کەبابێکی بۆ خستبوومە سەرقاپێك و بۆی هێنام وتی بەبێ نان بیخۆ تا میوانەکەت دێت. دانیشتبووم کوڕێکی کەتەی هەرزەکار تەمەنی لە ٢٠-٢٢ ساڵ بوو بە پێکەنینەوە بەرەو ڕووم هات، بە ئەدەب و ڕێزەوە وتی کاك ماکوانیت، وایە؟

ماکوان: بەڵێ گیانی من فەرموو..

كوڕە هەرزەكارەكە: من ناوم میلاد-ە خەڵكی شاری كرماشانم، زۆر گوێ لەبەڕێزت دەگرم لە تۆڕەكۆمەڵایەتیەكان زۆر خۆشحاڵم بە ناسینت.

ماكوان: بەڕێزی كاكە میلاد گیان.

شیشە گۆشتەكەم بەرز كردەوە تا تەعاروفی بكەم بخوات، بە دەست و پەنجە و خواردنیدا هەستم كرد كە برسییەتی، بۆیە لێم پرسی كاكە میلاد حەزت لە پیتزایە یان كەباب؟

میلاد: وەڵڵاهی خۆشحاڵ دەبم كە بەیەكەوە نان بخۆین، بەڵام حەز دەكەم دەعوەتی من بیت.

ماكوان: من هەر دەعوەتی جەنابتم كاكە میلاد، پیتزا بخۆین یان كەباب.

میلاد: با پیتزا بخۆین.

چوومە ژوورەوە بە مونیرم وت كە پیتزایەكی گەورەمان بۆ دروست بكات، گەڕامەوە بۆ لای میلاد، كوڕێكی زۆر ڕۆح سووك و بەئەدەب و جوانخاس بوو زۆر زوو چووە دڵمەوە، هەندێك موجامەلەم كرد هەستم كرد ئەویش قسەی زۆری لە دڵایە دەیەوێت بۆم باس بكات.

میلاد: كاك ماكوان من و خانەوادەكەم موسوڵمان نین، بەڵكو ئێمە خاوەنی ئایینی یەرسانین، با بمێنێت بەڵام من ماوەی ساڵێكە بە وتار و لایڤەكانی تۆ موسوڵمان بووم، باوكم پێی زانیووم ئێستا قسەم لەگەڵ ناكات و زۆر ڕقیشی لە تۆیە.

ماكوان: سەرەتا زۆر خۆشحاڵم بە ناسینت، دەبێت هەر ئیحترام و ڕێزی باوكت بگریت، بەڵام هەرگیز لە ئایینەكەت پەشیمان نەبیتەوە، چوونكە

باوكت لەم دنیایە لەگەلتایە، بەڵام ئیسلام لەم دنیا و لە قیامەتیش لەگەڵتدا دەبێت.

بەخوا براكەم بێجگە ئایینی ئیسلام، خوای گەورە هیچ ئایینێكی تری قبوڵ نییە.

میلاد: بەڵی دەزانم كاك ماكوان گیان، چۆن پەشیمان دەبمەوە خۆ ئەمە یاری منالان نییە، بەخوا ماوەی یەك هەفتە باوكم دەریكردم، لەماڵی هاوڕێیەكم بووم تا دایكم هات بردمیەوە، كاتێك كە چوومەوە بۆ ماڵەوە لە ژوورەكەی خۆم دەرگام دانەخستبوو نوێژم دەكرد باوكم ئاگای لێبوو.

ماكوان: ئەی خوای پەروەردگار بتپارێزێت كوڕی خۆم، ئەوەشت لە بیر نەچێت من برا و باوكتم.

لەو كاتەدا پیتزاكەیان هێنا، هەستم كرد زۆری برسییە.

میلاد: بەڵێ هەروایە كاك ماكوان گیان تۆ برای گەورەی منیت.

پیتزاكەم خستە بەردەمی، میلاد پرسی ئەی تۆ بۆ ناخۆیت؟

ماكوان: ڕاستی كاكە میلاد من میوانێكم دێت چاوەڕێی ئەوم، ئافرەتێكە خزممە، ئەویش تازە خوای گەورە هیدایەتی داوە، دێتە ئێرە و لەگەڵ ئەو نان دەخۆم، بەڵام زۆر خۆشحاڵم بە ناسینی تۆ میلاد گیان.

میلاد: ببوورە كاك ماكوان گیان ئیزعاجت ناكەم، هەركات ئەو بەڕێزە هات من دەڕۆم.

ماکوان: نا، ئاساییە، ئیشی نییە ئەو خوشکەمان، ئیشێکم بۆ پەیدا کردووە، دێت بۆی باس دەکەم ئیشەکە چییە و لەکوێیە.

میلاد: وەڵڵا کاك ماکوان منیش زۆر بێکارم، ئەگەر کاریك هەبوو ئاگادارم بکەیتەوە مەمنونت دەبم.

ماکوان: تەلەفۆنەکەتم بەرێ، وەرە لە مزگەوت زیاتر خەڵك بناسە. خەڵکی باشی لێیە هاوڕێ و برای باش پەیدا دەکەیت، بە پشتیوانی خوا ئیشیشت بۆ پەیدا دەکەین.

میلاد: ئەوە ژمارەکەمە، ماڵیشمان لە تۆرپە.

ماکوان: لەم ناوە بە کە تەواو بووم لەگەڵ ئەو خوشکە خۆم ئەتبەمەوە بۆ ماڵەوە.

میلاد: بەخوا باوکم ببینێت لەگەڵ تۆ بەتەواوەتی دەرم ئەکات.

پێکەنین گرتمی کەوای وت، لەپڕ ئافرەتێکی موحەجەبە لەتەنیشتم بە هێواشی وتی، السلام علیکم!

کە تەماشام کرد وام زانی حۆرییە، ماشاء الله لە جوانی کرۆنیکا بە جلی موحەجەبە و ئیمانەوە چەند بە ویقار بوو، داوای ئیزنم لە میلاد کرد و وتم من دەچمە ژوورەوە دادەنیشم لەوێ لەگەڵ ئەم خانمە نان دەخۆم.

میلاد: ئیسراحەتی خۆت وەربگرە.

هەڵسا بچێت پارە بدات، پێم وت ئەمە دوکانی خۆمانە هەموو شتێك لێرە بۆمن بە خۆڕاییە، لەبەر ئەوە بە ئیسراحەت نانەکەت بخۆ.

ماڵئاوایم کرد لە کاکە میلاد و چووینە ژوورەوە مونیر خواردنی بۆ من و کرۆنیکا هێنا، باسی حەجم لێ پرسی.

کرۆنیکا: نازانم چیت بۆ باس بکەم، لەلایەکەوە زۆر خۆشحاڵم بەڕاستی زۆر سوودم بینی لە کتێبەکان و ئەو بانگخوازانە ئێستا هەمیشە گوێ بۆ ئەوان دەگرم، کتێبەکان زۆر نایاب بوون بەتایبەت کتێبەکانی (د. عمرو شریف).

ماکوان: دەی الحمد لله، ئەی لاکەی تر چییە؟

کرۆنیکا: وەڵڵاهی ئەم مارەیە لەملم نابێتەوە، نازانم چۆن کۆتایی پێ بهێنم، جاران لە مردن دەترسام، ئێستا لە خوا دەترسم. نامەوێت بمرم لەبەر ئەوەی دەمەوێت هەموو هەڵەکانم چاك بکەمەوە ئەگەر مردیشم بە پاکی بگەڕێمەوە بۆلای خوا.

ماکوان: ئەوە بزانە تۆ تازە خوشکی منیت، هیچ کەسێك ناتوانێت زەفەرت پێبەرێت، بەتایبەت فرانك.

لەم قسانەدا بووین میلاد هاتە ژوورەوە بۆ خوا حافیزی، دوای باسی میلادم بۆ کرد کە چۆن کەمێك پێش ئێستا ناسیومە و چیرۆکی ژیانی چییە.

کرۆنیکا: وەڵڵا ئەوەندە گەرم و گوڕ بوون بەیەکەوە وام زانی دە ساڵە یەکتر دەناسن.

ماکوان: گەورەیی ئیسلام ئاوایە لە یەك چرکە ساتدا برا و خوشکت بۆ دروست دەکات.

دەستم کرد بە پیتزا خواردن، وتم بۆ ناخۆی؟

کرۆنیکا: وەڵڵاهی شەرمت لێدەکەم.

ماکوان: دەبیخۆ کەسەکەم تۆ خوشکی منیت، ڕوو دەکەمە دیوارەکە تا نانەکەت دەخۆیت.

کرۆنیکا: زیاتر مەبەستم ئەو باسەیە کە بۆی هاتووم، نازانم چۆن باسی ئەو کارە قێزەونانەی خۆمت بۆ بکەم، وەڵڵاهی مەرگ بە ئاوات دەخوازم ئێستا.

ماکوان: خوا عافوت بکات، هەڵەیە و کراوە، دەبێت چارەسەری بۆ بدۆزینەوە.

کرۆنیکا: کۆنتراکتێك هەیە لە نێوانی من و فرانک دا، ئەگەر ئەو کۆنتراکتە بەتاڵ بکرێتەوە، ئەوا من هیچ کێشەم نامێنێت لەگەڵیدا.

ماکوان: کۆنتراکت ئەگەر بە پارە چارەسەر بێت ئاسانە.

کرۆنیکا: تۆ خۆت دەزانی من تاڕادەیەك کێشەی پارەم نییە، بەڵام ڕاستە کۆنتراکتەکە پارەیە، بەڵام هەر تەرەفێك پەشیمان بوویەوە تەرەفی بەرانبەر نرخ دیاری دەکات.

ماکوان: ئەم کۆنتراکتە بۆ چییە؟

کرۆنیکا: ئەو کارەی فرانك دەیکات بەشی زۆرە، من لە چەند بەشێك بەشداریم کردووە، لە کاتی نەفامیمدا ئاواتم ئەوەبوو کە کاربکەم لەو بوارانەدا پارەکەی زۆر زۆر بوو. بەهەرحاڵ بەشە سەرەکییەکەی دەزانیت، نامەوێت سەرت بێشێنم.

ماکوان: ئەگەر مەبەستت پیاوی هەوەسبازە کە بە کوشتنی ئافرەت ئارەزوویان دەوروژێت و بە مردوویی سێکسی لەگەڵ دەکەن، بەڵێ باش دەزانم و ئاگاداری ئەو کارە قیزەونەم.

کرۆنیکا: بەشیکی تری یاری قومارە کە لەسەر وەرزشەوانەکان دەیکەن وەك یاریەکانی (تای بۆکس یان کیك بۆکس).

ماکوان: ناشێ کرۆنیکا کیك بۆکس یاری بکەیت؟

کرۆنیکا: کورە نەوەڵڵا، ئەو ئافرەتە ڕووتانەت بینیوە کە لەگەڵ یارییەکاندا دەچنە سەر ستەیجەکە؟

ماکوان: بەڵێ بینیومە ئێ ئەوە چییە؟

کرۆنیکا: هەر یاریزانێکی کیك بۆکس یەك دوو ئافرەتی لەگەڵدایە، ئەو ئافرەتانە خۆ بەخۆڕایی لەوێ نین، ئەزانی؟

ماکوان: بەلێ بێگومان دەزانم.

کرۆنیکا: لەو بەشەش جۆری هەیە، گرانترینیان ئەوانەن کە ئەگەر یاریزانەکان یەکەم تا سێیەم بن ئەوا دەتوانن ئافرەتێك هەڵبژێرن تا سپۆنسەریان بێت و لەگەڵی ڕابوێرن، بەداخەوە من لەو جۆرەم، کۆنتراکتەکە دەڵێت یاریزانێك تەنها دەتوانێت کە یەکەمی گروپەکەی خۆی بێت ئەو ئافرەتەی کە هەلی بژاردووە بۆ سپۆنسەر کۆنتراکتەکەی بەتاڵ بکاتەوە بەو مەرجەی یارییەکە لەسەر قومار بێت و پەیوەندی نەبێت بە یارییە نێودەوڵەتیەکانەوە کە بۆ وڵاتەکان ڕێکدەخرێت، تێگەیشتی؟

ماکوان: ئەگەر ڕاستیت دەوێت، نەوەڵڵا تێنەگەیشتم.

کرۆنیکا: بەکوردی و پوختی ئەو کۆنتراکتە لە نێوانی من و فرانك دایە، لەبەر ئەوەی زەریبەی لێ یاوە دەتوانێت دژم بەکاری بهێنێت.

ماکوان: ئەم یارییە یاساییە؟

کرۆنیکا: بەڵێ، یاساییە لەبەریتانیا و ئەڵمانیا و ئیسپانیا و زۆربەی وڵاتانی تر دەکرێت.

ماکوان: دەی چاوی دەرێت بابچێت شکات بکات، خۆ ناگیرێیت، ئەو پەڕی پارەکە بێتە سەرت، برۆ ژمارەی بانکەکەت بەتاڵ بکەوە با فرانك هەربۆخۆی سیر بخوات و زوڕنا لێبات.

کرۆنیکا: ڕاستە من کێشەم هەر ئەوە نییە، کێشەکەم فرانکە وازم لێ ناهێنێت، ئەمەویت بڵێم ئایا دەکرێت من خۆم بشارمەوە تا مردن بەم شێوەیە.

ماکوان: ئەی بۆ ناچیتەوە بۆ کوردستان؟

کرۆنیکا: بیرم لێکردۆتەوە، بەڵام چی لەدایکم بکەم، لێرە لەژێر چاودێری پزیشکی دڵدایە، نامەوێت لەبەر خاتری خۆم ئەویش بخەمە ناڕەحەتی و عەزاب، دڵیشم نایەت بەجێی بهێڵم لێرە کەسی نییە.

ماکوان: ڕاستە بەڵام من نازانم چیم پێ دەکرێت با بیکەم، ئەگەر خۆت پلانت هەیە پێم بڵێ.

کرۆنیکا: نازانم سەرم لێ شیواوە و بیرم بۆ ناکرێتەوە.

ماكوان: من زانیاری تەواوم لەسەری نییە، ئەم كەسە شووێنی دیار نییە و دێت و دەچێت و یاری بەخەڵك دەكات، خۆ دەتوانم چوار پیاوی ئازاو چاونەترس بنێرمە سەری، بەڵام دوایی ئازاری تۆ دەدات، تەنانەت من لەخۆشم ناترسم، چوونكە من ئەتوانم خۆم بپارێزم بەڵام خەمی تۆمە.

كرۆنیكا دەستی بە گریان كرد و وتی ئێستا هەست بە تەنهایی دەكەم.

ماكوان: ئاخر خۆ منیش ئەوەندە وەرزشەوان و بەتوانا نیم بەخوا هیچ لەوەرزش نازانم، بەڵام ئەگەر چەقۆیەكم پێ بێت یان تێلایەك لە سێ چوارێك ئەیەم. ئەنجا خۆ ئەمە شەڕی عەشایەری نییە تا بچمە ناوەوە گوێی نەیەمێ، ئەوە هەمووی تەكنیك و هێزە و توانای وەرزشی ئەوێت، منیش نەك هێزم نییە، بەڵكو هیچی لێنازانم.

كرۆنیكا: ئەزانم ئەوە ئیشی تۆ نییە، منیش داوای ئەوەت لێناكەم.

ماكوان: یەك شەیتان شك ئەبەم ئەگەر بەو نەكرێت بەكەس ناكرێت.

كرۆنیكا: شەیتان كێیە مامۆستا ماكوان؟

بەپێكەنینەوە وتم ئەوە یەكەم جارە بە جدی بڵێی مامۆستا ماكوان، ئەو شەیتانە ناوی وەرماشە، ببینم پێی ئەڵێم لەوانەیە ئەو بتوانێت هاوكاریمان بكات.

كرۆنیكا: ئەی بۆ تەلەفۆنی بۆ ناكەیت؟

ماكوان: بڕوابكە تەلەفۆنی نییە، دەنا حەزم بەچارەی نییە، لەبەرخاتری تۆ كارم پێیەتی.

کرۆنیکا: ناوەکەی سەیرە، خەڵکی کوێیە؟

ماکوان: واز لەناوەکەی بهێنە، قەرەجە، خۆشم نازانم خەڵکی کوێیە.

کرۆنیکا: ماکوان توخوا هاوکاریم بکە دەستم لێ بەرمەیە.

ماکوان: دڵنیابە ئەوخەمە سەرسەرم و خوشکی خۆمی، پێشتر پێم نەوتیت خوشکمی؟ دڵنیابە قسەی سەر دەمم قسەی ناو دڵیشمە.

کرۆنیکا: من ئەمڕۆ جێگاکەم ئەگۆڕم، دەچم بۆ ئەم شارە کەس جێگاکەم نازانێت تۆ نەبێت.

ماکوان: ئەو شارە سویدە بۆ لە نەرویج نابیت؟

کرۆنیکا: کێشە نییە، لەوی مۆتێلێکم دەست کەوتووە هەرزانە و نزیکی نەرویجیشە کە دەتوانم هاتوچۆ بە دایکم بکەم بۆ دوکتۆر و خەستەخانە.

ماکوان: وەك وتم ئێستا هیچ بە مێشکمدا نایەت، بەڵام هەرچی ڕوویدا زوو ئاگادارم بکەوە، لە منەوە زۆر دووریش بیت خێرا خۆم دەگەیەنمە لات.

کرۆنیکا: هەندێك دیاریم بۆ هێناویت، ئاوی زەمزەم و دوو دشداشە و هەندێك کتێب لەناو سەیارەکەیە دامنەگرتوە لەگەڵم وەرە با بتدەمێ.

ماکوان: بەسەرچاو بابڕۆین فەرموو.

کرۆنیکا: دەکرێت داوایەکت لێ بکەم.

ماکوان: فەرموو، ئەو جددیاتە چییە کچی خۆم قسە بکە.

کرۆنیکا: ئەوە کلیلی ماڵی خۆمانە، دەتوانیت بچیت شتی ناو سەلاجەکە فڕێ بدەیت نەوەك بۆن بکات، بەو هۆکارە بۆنی ناخۆش دراوسێکان هەراسان بکات و پەیوەندی بە پۆلیسەوە بکەن، نامەوێت هیچ شتێکی نەخوازراو ڕووبدات.

## کردنەوەی دەرگا داخراوەکان

کرۆنیکا داوای لێکردم کە بڕۆم بۆ ماڵیان، منیش هەروا بەئاسانی وتم ئەی خۆت بۆ ناچیت، ئەترسم کامێراکان وێنەم بگرن.

کرۆنیکا: توخوا ماکوان تا ئەم ساتەوەختەش متمانەم پێناکەیت.

ماکوان: نا سوێند بەخوا هەروا ئاسایی هاتەدەرەوە لەدەمم، زیاتر ئەمەوێت بزانم هۆکارەکەی چییە کە خۆت ناچیت؟

کرۆنیکا: ئەترسم یەکێك لە سەگەکانی فرانك لەوێ بێت و بمڕفێنێت، یاخود فرانك خۆی بێت، چیم بۆ دەکرێت؟

ماکوان: بەسەرچاو من دەچم، بەڵام حەزناکەم ئەوەندە بترسیت تۆ خۆت باشتر دەزانیت وڵاتی نەرویج وڵاتی فێمەنیستە، لەم وڵاتە ئێوە خۆتان حاکمن. یەکەم ئافرەت، دووەم مناڵ و سێیەم سەگە، چوارەم پیاوە.

کرۆنیکا بە پێکەنینەوە وتی: یەکجار واش نییە، خۆ گریمان قسەکەی تۆش لە ١٠٠٪ وابێت، من خۆم بەشێکم لەو کێشانە و دەزگای پۆلیس بەدوای منەوە نییە تا خێرا هاوکاریم بکەن.

ماکوان: وایە، باشە گریمان هەموو ئەوەی کە کردوتە و ئەوەی کە فرانك دەیکات بە پۆلیس بڵێین، هاوکاریمان ناکەن؟

کرۆنیکا: جارێکی تریش هەمان پێشنیارت کرد، وەڵامەکەی من ئەوەیە لە نەرویج بەدوای بەڵگەوەن، بەڵگەمان هیچ هەیە؟

ماکوان: تۆ خۆت دەبیتە بەڵگە.

کرۆنیکا: کەواتە دەبێت من بڕۆم سکاڵا سەرەتا لەسەر چەپەڵی خۆم تۆمار بکەم، کارەکە هەروا بەو ئاسانییە نییە، کە بیری لێ دەکەیتەوە مامۆستا ماکوان.

ماکوان: بەهەرحاڵ ئێستا هیچ لە مێشکم دا نییە، کاتم بدەرێ و ماوەیەك بزانم ئەتوانم چیبکەم بۆت.

کرۆنیکا: ئەوە کلیلی ماڵەکەمانە، فەرموو.

ماکوان: ئەی ئەگەر کەسێك لە سەگەکانی فرانك منیان ڕاگرت و وتیان چۆن ئەم کلیلانەت پێیە و تۆ چی ئەم ماڵەیت و لەکوێیت؟ چی بڵێم و چی بکەم باشە؟

کرۆنیکا: نازانم، ئەترسیت؟

ماکوان: کێشەی من زۆرجار ئەوەیە وەکو کەڵەشێرم، جا کەڵەشێر زۆر بێ دەماغە کە ڕێوی دەبینێت، دەڕوات بۆلای و شەڕی لەگەڵ دەکات، دەمەوێت ئەو کەسایەتی کەڵەشێرە واز لێبهێنم، هەوڵبدەم بزانم چۆن لەگەڵ ڕێویەکاندا مامەڵە بکەم.

کرۆنیکا: ببوورە کە وتم دەترسیت.

ماکوان: نا ئاساییە، مرۆڤ بێگومان غەریزەی ترسی هەیە، ئەگەر بشترسێت زۆر ئاساییە، زۆرجار ترس چاکە و خۆشە، ئەزانی؟

کرۆنیکا: نەوەڵڵا نازانم، ئەمە یەکەم جارە بزانم ترس خۆشە و چاکە، من ئەوەندە دەترسم تووشی نەخۆشی دڵەڕاوکێ و سترێسی کردووم، تەنانەت بیرم بۆ ناکرێتەوە، ئیتر خۆشی چی و چاکی چی.

ماکوان: چوویت بۆ ئەو جێگایانەی کە یاری تێدایە، مەبەستم شاری یارییە؟

کرۆنیکا: بەڵێ بە دڵنیاییەوە چووم.

ماکوان: کام یارییەی لەهەموویان ترسناکترە سەرکەوتوویت.

کرۆنیکا: بەڵی سەرکەوتووم.

ماکوان: ئەی نەترساویت لەکاتی کارپێکردن بە یارییەکە، بەهۆکاری خێرایی یان هەر هۆکارێکی تر؟

کرۆنیکا: با ترساوم.

ماکوان: کە تەواو بووە دەستت کردووە بەپێکەنین بەهۆکاری ترسەکەت.

کرۆنیکا: بەڵێ ڕوویداوە.

ماکوان: دەی ئەوە ترسی خۆشە، زۆر ئاساییە ترست هەبێت و لەهەمانکاتیشدا یارییەکە خۆشییەکەی لەوەدایە کە ترست ئەداتێ، وایە؟

کرۆنیکا: وایە، ئێ من چوزانم تۆ فەلسەفییانە بیری لێ دەکەیتەوە.

ماکوان: نا فەلسەفییانە نییە، ئەوە حاڵەتی ترس چاکە، چوونکە هۆشیارت دەکاتەوە و خۆت دەپارێزیت.

کرۆنیکا: ڕاستە تێگەیشتم.

ماکوان: الحمدلله، کلیلەکانم بەرێ.

کرۆنیکا: فەرموو، من دەبێت بڕۆم دایکم بەتەنهایە و کات دڕەنگە.

ماکوان: زۆرباشە خوات لەگەڵ.

لەدوای ڕۆیشتنی کرۆنیکا هەستم بەگۆڕانکارییەکی زۆر کرد کە تێیدا ڕوویداوە، گۆڕانکارییەکە کەسایەتی شەرمن و لەگەڵیدا بەهێزی بۆ دروست کردووە، هەستم بە پەشیمانییەکی زۆر کرد لە ژیانیدا، لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکارییە دەمزانی دنیایەك قسە لەدڵیدا هەیە، جاران ئەگەر من حەزم بەگوێ گرتن نەبوو، بەڵام ئێستا من حەزدەکەم قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام شەرمی ئەو، ڕێگا نادات قسەم بۆ بکات.

هەموو ئێوارەیەك دەچووم بۆ مزگەوت لە نێوان نوێژی عەسر و مەغریب لە کۆتایی هەفتەکەدا کازۆڵ هاتەوە، بەیەکەوە ڕۆشتین بۆ جێگایەك لەناو دارستانێکدا بە دەورمدا بازنەیەکی کێشا و چوومە ناو بازنەکە و داوای کرد هەناسەیەکی قوڵ هەڵمژم و چاوم بنوقێنم تا ٢١ بژمێرە و پاشان چاو بکەرەوە.

ئەوەی پێی وتم ئەنجامم دا، کە چاوم کردەوە لە بیابانێکی وشک و گەرم دا بووم بایەکی گەرم دەهات، خەریك بوو ئەخنکام هەناسەم بۆ نەدەدرا. ڕوومکردە کازۆڵ و وتم ئەرێ لێرە باشتر نەبوو بمهێنیت بۆی؟

کازۆڵ: ئاخر (ابو آناء) تۆ دەزانیت ئەو جێگایەی کە پێشتر ئەو برایانەی لێبوو، ئەوە جەماعەتی وەرماش بردوویانە و داگیریان کردووە.

ماکوان: ئەی بۆ پێشتر پێتان نەوتووم، ئیتر من بۆچی دەبێت لەگەڵ وەرماش کۆنتراکت ببەستم لەکاتێکدا شووێنەکەی ئێوەی داگیر کردووە و بردوویەتی بۆخۆی.

کازۆڵ: لەجەنگی ئێمەدا هەمیشە سەرکەوتوو فەرمانی خۆی دەسەپێنێت.
ماکوان: لای ئێمەش هەروایە، هەمیشە براوەی جەنگ یاسا و قسەی خۆی دەسەپێنێت، بەڵام من دەتوانم لە یارییەکە دەربچم کە مادام ئەوان ئازادن و جێگاکەشتان داگیرکراوە.

کازۆڵ: پەلە مەکە لەم چاوپێکەوتن و ژوانەدا شتت زۆر بۆ ڕوون دەبێتەوە.

ماکوان: من سووتام لەو سەحرایەدا، یان با بڕۆین یان بمگەڕێنەوە بۆ شووێنی خۆم، ئێمە لەکوێین؟

کازۆڵ: لە بیابانی نێوان مەغریب و جەزائیرین، بەڵام لێرەش نامێنین و دەڕۆین.

ماکوان: بۆ کوێ؟

وەکو جاری پێشووو خەتێکی بەدەورمدا کێشا و وتی هەناسەیەکی قوڵ هەڵبمژە و چاوت دابخەو تا ٢١ بژمێرە.

کە چاوم کردەوە مەیمونێکی بچووك لەسەر شانم بوو کە تەماشای جێگاکەم کرد زانیم ئەفەریقایە، بەڵام نەمدەزانی چ وڵاتێکە. هەرچی هاوارم دەکرد کازۆڵ وەڵام نەبوو، باڵداری ڕەنگا و ڕەنگ بەسەرمە دەفڕین و جێگاکەش پڕ بوو لە مەیمون.

چەند خولەکێك بە چواردەوری خۆمدا هەڵخولام گوێم لە دەنگی عەبدولڕەحمان حەزقیلی برام بوو بانگی دەکردم، کە ئاوڕم دایەوە وا شێخ بەرقان، ڕاقی، حەزقیل، سەسیل، میا و حەنانە وەستابوون زیاد لە هەزار جنۆکەی تر لە دوایانەوە وەستابوون، کە زۆربەیان ڕەش پێست بوون، سڵاوم کرد هەموویان بەدەم پێکەنینەوە وەڵامیان دامەوە. زۆر خۆشحاڵیم دەربڕی بە بینینیان.

شێخ بەرقان هاتە لام شتێکی دامێ وتی بیخە دەمت، کە خستمە دەمم تامی ئەوەندە تفت و تاڵ بوو یەکسەر لە هۆش خۆم چووم کاتێک چاوم کردەوە لە دارستانێکدا بووم لەناو جۆلانەیەك وەك کورسی وابوو بەڵام شووێنی خەو بوو، کە هەڵسامەوە حەزقیلم بینی.

حەزقیل: چۆنی برا؟

ماکوان: باشی حەوت برا گیان، باشە ئەوە بۆ وام لێئەکەن؟

حەزقیل: کورە لەبەر ئەوەی تۆ هیچ لە مێشك و دەم و قەڵەمتا ناوەستێت ئاشکرامان دەکەیت، بۆیە جێ گۆڕکێت پێ دەکەین.

ماکوان: ئێ پێم بڵێن قسە مەکە منیش باسی ناکەم و تەواو.

حەزقیل: کێشە نییە باسی ئێرەش بکەیت، چوونکە ناتوانن بگەنە ئێرە. نەك لەبەر ئەوەی دوورە نا، بەڵکو لەبەر ئەوەی توانایان نییە بێنە ئێرە، چوونکە ئەوەی بێتە ئێرە سوڵتانی ئێمە سوڵتانە، لەناویان دەبات.

ماکوان: حەزقیل ئاگام لەخەبەر و باستان نییە، لە نوکی نوکەوە بۆم بگێڕەوە تا ئەم کاتەی بەیەکەوە دانیشتووین، دەی حەزە گیان بە هێواش و لەسەرخۆ گوێم بۆ گرتوویت.

حەزقیل: کوڕ و کچێکمان بووە، ناوی بنێین چی؟

ماکوان: پیرۆزە، بۆ لای ئێوەش دووانە هەیە؟

حەزقیل: نا لە دوو ژن خوای گەورە داویەتی.

ماکوان: کورە تۆ زۆر خەتەری حەزەی برام، ئەتوانم بیان بینم و ماچیان بکەم.

حەزقیل: ئەتوانم بیانخەمە سەر شێوەی مەیمون بۆ ئەوەی بیان بینیت، باشە؟

ماکوان: زەوقسز هیچت نەدۆزییەوە مەیمون نەبێت؟

حەزقیل: ئاخر منالن، جارێ ئەو توانایەیان نییە بخرێنە سەر شێوەی ئینسان.

ماکوان: باشە حەزە گیان، یاخوا تەمەن درێژ بن، بەنازی دایك و باوکیان گەورە بن.

حەزقیل: دایکی کوڕەکەم کوژرا بەدەستی جەماعەتی ویرسان و وەرماش.

ماکوان: خوای گەورە لێی خۆش بێت.

کەوای وت زۆرم پێ ناخۆش بوو، زانیم کە من هۆکار بووم. لەدڵی خۆمدا وتم داخۆ چەند جنۆکەی تر لەناو چووبن بەهۆی منەوە.

بێدەنگی هەردووکمانی داگرتبوو، وتم: حەزقیلی برام شەرمەزارم چی بکەم، داخۆ چەندی تر لە ئیوە بەهۆکاری من کوژرابێت؟

حەزقیل: نا وامەڵێ تۆ بۆچی، هەمووی قەدەری خوای پەروەردگارە.

ماکوان: بەهەرحاڵ خوای گەورە لێم خۆش بێت، ئامین. ئەی باشە شێخ بەرقان لەکوێیە؟

حەزقیل: ئێستا دەچین بۆلایان، جارێ با سوڵتان ئیجازەمان بات.

ماکوان: سوڵتان کێیە؟

حەزقیل: سوڵتان کەسێکی خواناس و بەڕێزە، گەورەی جنۆکەی ئێمەیە لە قسەی دەرناچین، ئەویش هاوکاریمان دەکات.

ماکوان: ناوی چییە، ئێ ناوی سوڵتانە.

ماکوان: واتا سوڵتان ناوی خۆیەتی، من وامزانی سوڵتان مەنسەب و پلەوپایەیەتی.

حەزقیل: ئێ ناوی سوڵتانە و پلەوپایەشی هەر سوڵتانی ئێمەیە.

ماکوان: دەی شێتم بکە.

حەزقیل: نا، بڕوام پێ بکە هەروایە، کە (ان شاء الله)چووین دەیبینیت و قسەشی لەگەڵ دەکەیت، پێم بڵێ دەنگوباسی کرۆنیکا؟

ماکوان: چییە حەزەی برام، ناشێ تەماعت لێی نەکردبێت؟

حەزقیل: حەزم لەناوەکەیەتی، خۆشی بۆ تۆ.

ماکوان: وەڵڵا خێزانم بزانێت ئەوەندە دەست و دڵت باشە بۆ من ڕقت لێ هەڵدەگرێت.

حەزقیل: هەربۆخۆشی وا دەڵێم، بەڵام حەز دەکەم کچەکەم ناو بنێم کرۆنیکا و کوڕەکەشم ناو دەنێم حارث.

ماکوان: حارث-ە کەم بەدڵە، بەڵام کرۆنیکا ناوێکی ئیسلامی نییە. ئەگەر بەقسەی من دەکەی-ت ناوی بنێ مەدینە بۆ خۆشەویستی مەدینەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

حەزقیل: ئەوە بڕیارم دا ناوی بنێم مەدینە، محمد حارث. با ناوەکەی ناوێکی تەواو بێت.

ماکوان: دەمادام وایە کچەکەشت ناوێکی تەواو و پڕی بنێ و ناوی بنێ مەدینەی مونەوەرە، باشە؟

حەزقیل: ناوەکەی ئیمزای لەسەر کرا، قسەکەت قبوڵە و بەسەرچاو.

ماکوان: خوای گەورە بیان پارێزێت و بۆ ئەم ئیسلامە گەورە بن، ئامین.

حەزقیل: ئامین، ئەزانی کازۆڵ تۆی زۆر خۆش ئەوێت، هەمیشە لای سوڵتان باست دەکات.

ماکوان: بۆ کازۆڵ و سوڵتان یەکتر دەناسن؟

حەزقیل: ئەی خوا عەفوت بکات، کازۆڵ وەزیری سوڵتانە بەبێ ڕاوێژی کازۆڵ سولتان هیچ ناکات.

ماکوان: زانیم ئەم جنۆکەیە کەسایەتییەکی سادە نییە، زۆر پڕ زانیاری و خواناسە، زۆر کەسایەتییەکی قورس و گرانە، وایە؟

حەزقیل: تا بڵێیت جنۆکەیەکی زۆر خێرەومەندە، دەستی خێری زۆرە، باوکی پیاوێکی زاناو خواناس بوو، خاوەن پێگەی تایبەتی خۆیانن لەناو ئێمەدا، زۆر بەهیز و ئازایە و شەیتانەکان زۆر لێی دەترسن.

ماکوان: حەزقیلی برام ئێوە زمانی تایبەتی خۆتان هەیە قسەی پێ بکەن؟

حەزقیل: بەڵێ زمانی تایبەتی ئێمە زمانی باکوور و باشووور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە. ئەو چوار زمانە سەرەکییە، بەڵام هەموومان لەیەکتر تێدەگەین.

ماکوان: ناشێ ئێوەش وەکو کوردستانی ئێمە پارچە پارچە کرابێتن؟

حەزقیل: نا، زمانەکەمان لەدێر زەمانەوە وا هاتووە، چوونکە جنۆکەکان لەگەڵ مرۆڤەکان ژیان دەکەن زۆرجار بەزمانی مرۆڤەکان قسە دەکەین، مەگەر ئەو زاراوانەی یاخود ئەو وشانەی لای ئێوە نەبێت ئەوانەی خۆمان بەکار دەهێنین.

ماکوان: وەکو چی؟

حەزقیل: هەندێك ئاژەڵ و خواردن و خواردنەوە و دەرمان، وە هەندێك شتی تر کە تۆ ناتوانیت بیانناسیت.

ماکوان: ئاژەڵ هەیە کە مرۆڤ ناوی نەزانێت؟

حەزقیل: بەڵێ بە دڵنیاییەوە هەیە وەکو جنسی ئێمەیە ئێوە نایبینن، بەڵام ئێمە دەیبینین، هەموویان وزەن، ئێوە یەك جۆریان دەناسن کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەکاری هێناوە ئەویش بۆراقە، وەکو ئەو نمونەیە و نمونەی زۆری تر، ئێوە پێویستتان نییە چوونکە نایبینن.

ماکوان: حەزەی برام ئەمە نوێ بوو بۆ من.

حەزقیل: جاری تریش بۆمان باسکردوویت بەڵام بیرت نەماوە.

ماکوان: ئەی چۆن ئێوە و شێخ بەرقان و جەماعەت ئاوا ئەسیر کران؟

حەزقیل: ئێوارەیەك لەپڕ دایان بەسەرماندا و شەڕێکی قورس ڕوویدا، زۆرێك لەئێمە و لە ئەوانیش کوژران، بەڵام زیاد لە ١٠٠٠ جنۆکە لە ئێمە بەدیل گیران.

ماکوان: ئەی هەموویان بەربوون؟

حەزقیل: بەڵێ، تۆ تەنها ئەو کۆمەڵەیەت بینی کە پێشتر خۆیان نیشانی تۆ دابوو، ئەگینا زۆر بووین.

ماکوان: زۆرباشە، دەنا گێچەڵێکی ترم بە وەرماش دەکرد.

حەزقیل: وا سەیری وەرماش مەکە لەگەڵتا زۆر هێواش و هێمنە، جێگای سەرنجی هەموومانە، هەربۆیە شێخ بەرقان حەزی کرد بتبینێت. ئەمانەوێ ئەوە تاوتوێ بکەین و ئەو باسەت لەگەڵ بکەین، وەرماش ئەوەی لێی دەترسێت سوڵتانە.

ماکوان: ئەم سوڵتانەم نیشان بە بزانم کێیە و چۆنە؟

حەزقیل: ئەوە لەگەڵ شێخ بەرقان بەدوای لاشەیەکدا دەگەڕێین تا سوڵتانی پێ ببینیت.

ماکوان: ئەم جنۆکەیە چییە، سەرۆکە، بەرپرسە، شێخە، چییە؟

حەزقیل: زانایە، موفەسیرە، موئەریخە، موحەدیثە (فەرمووودەناسە)، موفەکیرە، فەقیهە، زانایە لە زمانی عەرەبی، کوڕی شێخ (حەندە ڕووشە) لە عەشیرەتی ڕاقی-ن.

ماکوان: مەبەستت ڕاقی هاورێمانە؟

حەزقیل: نا ڕاقی عەشیرەتێکی گەورەن لە جنۆکە، ناوی ڕاقی هاوڕێمان بەناوی ئەو عەشیرەتەوە ناونراوە.

ماکوان: ئەی کەی دەچین بۆلای؟

حەزقیل: ئەڕۆین بۆلای پەلەمەکە، با ئاگادارمان بکەنەوە، تۆ بۆم باس بکە دەنگوباسی کرۆنیکا، ئێستا خەریکی چییە؟

ماکوان: زۆر گۆڕاوە، ئافرەتێکی زۆر خانمی لێ دەرچووە، ئەوەی کە تێیدا بەدی دەکەم زۆر خواناس و باشی لێ دەرچووە.

حەزقیل: هەوڵبدە هاوکاری بکە، دەستی لێبەرمەدە.

ماکوان: بەخوا درێغی ناکەم، بەڵام کێشەی زۆرە و گۆبەنی زۆری بەدواوەیە. خۆی تێوەگلاندووە لەکاری وا من لە ژیانمدا بیرم لێ نەکردۆتەوە.

حەزقیل: ئاگادارین، کازۆڵ هەمووی بۆ گێڕاینەوە تەنانەت ئەو فیلمەشی بۆ باسکردین کە لە ستۆکهۆڵم چیتان بەسەرهاتووە.

کەوای دەوت پێدەکەنی حەزقیل...

ماکوان: بەڕاست، وامزانی کەس ئاگای لێم نەبووە.

حەزقیل: زۆر دوعامان بۆ کردی، نەکەویتە هەڵەوە، دڵنیابە وەرماشیش بە دواتەوە بوو، بۆ ئاگاداریت زۆر بێزارە لە دەستت.

ماکوان: کەواتە ئەو هیچوپوچە ئاگای لێم بووە؟

حەزقیل: بەدڵنیاییەوە، ئەویش بەدواتەوە بوو. کازۆڵ چاودێری هەردووکتانی دەکرد.

ماکوان: ئەی ماڵەکەت ئاوابێت، کاك کازۆڵی خۆشەویست، ئەرێ بەڕاست لە کوێیە، لە سەحرا و بیابانەکە لێم ون بوو ئیتر نەمبینییەوە.

حەزقیل: ئەویش لێرەیە هاتا پەیدا بوو، جارێ لەخزمەت سوڵتاندایە.

ماکوان: سەسیل دیار نییە؟

حەزقیل: لەگەڵ میا و ڕاقی شێخ بەرقان ناردوونی بۆ جێگایەك، ئەوانیش بەم زووانە دێنەوە، چوونکە دوو ڕۆژی تر کۆبونەوەی جنۆکە سەرکردەکانە، هەروەها کۆنگرەی جنۆکەی خاکی سوڵتانە و باسی سوڕەتی جن و پێگەی جنۆکەیە لە ئیسلام دا و کار و فەرمانەکانیان، بۆیە شێخ بەرقان حەزی کرد لەم کۆنگرەیەدا بەشدار بیت، زانیاری باشی لێوە فێر دەبیت.

ماکوان: کێ باسی سوڕەتی جن و پێگەی جنۆکە دەکات؟

حەزقیل: بەدڵنیاییەوە شێخ سوڵتان (شێخ زاهۆند)، شێخ (باقوش) لەکاتی قسەکردنیاندا ناوەکانیانت پێ دەڵێم، هەموویان زانای گەورەی ئەم ئیسلامەن. تۆش شتێك ئامادە بکە لەوانەیە داوات لێ بکەن قسە بکەیت.

ماکوان: وەڵڵا ئەمە زۆر موهیمە و خۆشیشە، داخۆ باسی چی بکەن حەزەی برام، جا ئەگەر داوا لەمن بکەن من باسی چی بکەم، ئەزموونم نییە وتار بدەم بۆ جنۆکە!.

حەزقیل: خۆ تۆ هەموویان نابینیت، شتێك ئامادە بکە، مەرجیش نییە بەشدار بیت، من لەخۆمەوە دەڵێم نەوەکو لە پڕ داوات لێ بکەن. چوونکە شێخ بەرقان باسی تۆی زۆر کردووە بۆ سوڵتان و هەروەها کازۆڵیش، خۆم ئاگادار بووم بە سوڵتانی وت لەناو شەمەندەفەرەکەدا قسەی زۆر بەهێزت بۆ کرۆنیکا کردووە.

ماکوان: واتا چیرۆکی من و کرۆنیکا هەموو جیهان دەیزانێت؟

حەزقیل: بەڵێ ئەو کۆمەڵەیەی کە تۆ دەناسن، ئاگاداری هەڵسوکەوت و ژیان و هەموو ورد و درشتی تۆن.

ماکوان: لەسەرێکەوە زۆر خۆشحاڵم، لەلایەکی تریشەوە ژیانی تایبەتم نەماوە هەموو جنۆکە لە دەوروپشتمن.

حەزقیل: یەکجار بەو شێوەیەش نییە، ئەم ماوەیە لەژێر چاودێری دا بوویت، لەبەر وەرماش بۆیە حەزدەکەن زیاتر ئاگادارت بن. دەنا هەریەك لەو جنۆکانەش ژیانی تایبەتی خۆیان هەیە، بەڵام تۆ قەرینەکانت زۆر دەگۆڕن دەترسن موسوڵمان بن، ئەو کەسەی کە بانگخواز و قسەکەرن شەیتانەکان زوو زوو قەرینەکانیان دەگۆڕن، تۆش قەرینەکانت زۆرن.

ماکوان: ئێستا قەرینەکەم کێیە، دەزانیت؟

حەزقیل: بەڵێ، خودی وەرماشە، وەرماش لەگەڵتایە و چاودێریت دەکات.

ماکوان: ئەی نازانێت کە من هاتووم بۆ لای ئێوە، ئەگەر هەمیشە لەگەڵما بێت؟

حەزقیل: ئەو زۆر سەری ناپەرژێت، کاری زۆرە، بۆیە خۆشی لەگەڵتدایە بۆ ئەوەی زیاتر بتناسێت، کە خۆی دەڕوات کەسێکی تر لە جێگای خۆی دادەنێت.

ماکوان: چۆن دەزانیت حەزەی برام؟

حەزقیل: کازۆڵ زۆر بەوردی چاودێریتان دەکات، ئاگاداری هەموو شتێکە، ئەوەت لەبیر نەچێت پابەندبوونی کرۆنیکا بە ئیسلامەوە وەرماشی زۆر ئیزعاج کردووە.

ماکوان: جاخۆ نیازم وایە بە وەرماش بڵێم چارەسەری کێشەی کرۆنیکا و فرانکم بۆ بکات.

حەزقیل: هەرگیز شتی وا ناکات، چۆن فرانك ئەگۆڕێتەوە بەتۆ، ئەوە ئەستەمە باش بزانە.

ماکوان: ئێ زۆرباشە، دوو داوام لێکردووە هیچیانی نەکردووە، ئەویش دەکەم بە داوای سێیەم، بەڵکو ئەم داوایەش نەتوانێت جێبەجی بکات، پێت چۆنە؟

حەزقیل: فیکرەیەکی باشە، بەلام با من پێش ڕووداوەکان نەکەوم، چوونکە شێخ بەرقان و کازۆڵ و سوڵتان دەیانەوێت لەو بارەیەوە قسەت لەگەڵ بکەن.

ماکوان: زۆرباشە، ئێمە زۆر دەمێنینەوە لێرە؟

حەزقیل: منیش وەکو تۆ چاوەڕێم، نازام جەماعەت بۆ دواکەوتوون.

ماوەیەك ماینەوە لەپڕ کازۆڵ پەیدا بوو، وامزانی دەڕۆین بۆ لای شێخ بەرقان و سوڵتان.

کازۆڵ: ماکوان دەبێت بگەڕێینەوە بۆ نەرویج، چوونکە وەرماش بە شووێنتا دەگەڕێت، بۆ ئەوی هەموو کارەکان ئاسایی بێت و هیچ هەستێکی بۆ دروست نەبێت، بگەڕێرەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆت، دەبێت هەر ئێستا بڕۆین.

ماکوان: چۆنتان پێ باشە با وابێت، بەڵام بەداخەوە حەزم دەکرد شێخ بەرقان و ڕاقی و ئەو برایانە ببینم.

هەروام وت شێخ بەرقان وتی: تۆ بڵێی ئەوەندە بێ وەفا بم نەیەم بۆلات، دەنگوباست ماکون گیان؟

ماکوان: شێخ گیان من باشم، هەر ئێوە باش بن من هیچم ناوێت.

شێخ بەرقان: ئاگاداری ئیمانەکەت بە بۆ ئەوەی وەرماش هیچ زەرەرێکت پێ نەبات، بەم نزیکانە یەکتر دەبینینەوە، ئێستا بگەڕێرەوە لەگەل کازۆڵ بۆ دوو بەیانی هەوڵ بدەن لێرە ئامادە بن.

ئەوەشت بیر نەچێت لەکۆنگرەی جنۆکەکان بەشدار بیت، دەبێت وتارێک ئامادە بکەیت.

ماکوان: بەخۆشحاڵییەوە لە خزمەتاندا دەبم شێخ گیان سوپاس بۆ ئامۆژگارییەکانت، خوای گەورە پاداشتی خێرتان باتەوە.

کازۆڵ: ئامادەیت بڕۆین؟

ماکوان: بەڵێ، بفەرموو، خوا حافیزم کرد و کازۆڵ بە دەورمدا بازنەیەکی کێشا گەڕامەوە بۆ بیابانە گەرمەکە، لەوێوە لاکێشەیەکی تری کێشا و بەهەمان شیوە هەناسەی قوڵم هەڵمژی و گەڕامەوە بۆ دارستانەکە، بەڵام نەچووینە شووێنی مەیمونەکان، گەڕامەوە بەرەو ماڵ.

ماندوویەتی زۆرم پێوە دیار بوو، خێرا چووم حەمامێکم کرد و بەرەو مزگەوت ڕۆشتم، کە چوومە ناو مزگەوت میلادم بینی.

میلاد: السلام علیکم کاك ماکوان، هاتم بۆ ئێرە بۆ ئەوەی جەنابتان ببینم.

ماکوان: زۆر خۆشحاڵم کاکە میلاد گیان، دەنگ و باست چۆنە، بەینت چۆنە لەگەڵ باوکت؟

میلاد: زۆر سوپاس خوا پاداشتت باتەوە، بەخوا هەر وەك خۆیەتی باوکم زۆر خراپە لەگەڵما، هەرچیم کردووە دەمەوێت کارێکم دەست بکەویت و بڕۆم خانوویەك بگرم بۆ خۆم بژیم. تەنها ساڵێکم ماوە شەهادەکەم وەربگرم لەبەر ئەوەی باوکم قسەی زۆرم پێ دەڵێت و زۆر شەڕم لەگەڵ دەکات خوێندنی ئەمساڵم دواخست.

ماکوان: بۆچی دەخوێنیت میلاد گیان؟

میلاد: لە بەشی هەندەسەی میکانیکم، ئەگەر شەهادەکەم وەربگرم چانسی کارکردنم زۆر دەبێت لە کۆمپانیا گەورەکان، هەرجێگایەك مەکینە و ئەدەواتی ماشینی تێدابێت دەتوانم کار بکەم.

ماکوان: ماشاء الله وەڵڵا شووێنێکی باشت هەڵبژاردووە لە خوێندنەکەتدا، ئەی وەزعی ماددی و گیرفانت چۆنە؟

میلاد: سفر، زۆرجار ژێر سفر، دایکم هاوکاریم دەکات. پارەی خوێندنەکەشم وەرگرت هەموویم خوارد.

ماکوان خوای گەورە ئاسانی بکات.

١٢٠٠ کرۆن لە گیرفانمدا بوو دەرم هێنا و دامێ، بەڵام وتی پارەم ناوێت ئەگەر کارێکم بۆ بدۆزیتەوە مەمنونت دەبم.

ماکوان: تۆ ئەوە هەڵبگرە، من و تۆ براین، کەست بینیوە شەرم لە برای خۆی بکات، بەزۆر خستمە گیرفانی و هەر چۆن بوو ڕازیم کرد، بەڵام زۆر قورس و گران بوو.

لەم قسانەدا بووین کاوە و هەندێك هاوڕێی ترم هاتنە مزگەوت، کاتی نوێژی مەغریب نزیکی ١٥ خولەکی مابوو، چوومە لای کاوە و پێم وت لەگەڵ موحسین جێگاتان هەیە کەسێکی تر بێتە لاتان؟

کاوە: جێگامان هەیە، بەس من حەز ناکەم، ئێستا کار دەکەم حەز دەکەم موحسینیش بڕوات و بەتەنها بم.

ماکوان: باسی میلادم بۆ کرد، وتم نازانم ڕازی دەبێت ئەو یان نا، بەڵام ئەگەر حەزی کرد بۆ ماوەیەك جێگای بکەرەوە، باشە؟

کاوە: ئەوە ئاساییە با بێت و لەخزمەتیدام، با پارەش نەیات.

ماکوان: پارەی چی، هەردەبێت خۆمان هاوکاری بکەین تا کارێکی دەست دەکەوێت.

کاتی نوێژ هات نوێژمان کرد و هاتینە دەرەوە لەمزگەوت، میلادم بانگ کرد و بەکاوەم ناساند. پێم وت ئەگەر باوکت ئیزعاجی کردیت بڕۆ بۆلای کاوە و کوڕێکی سووری ناوی موحسینە لەگەڵ ئەواندا بژی.

میلاد: بەڵام تۆ خۆت دەزانیت کە من پارەی کرێی خانووم نییە لە ئێستادا.

کاوە: براکەم کەس داوای پارەی نەکردووە، پارەت هەبێت و نەبێت من لەخزمەتام، حەز دەکەیت ئەمشەو وەرە.

میلاد: وەڵلاهی خوا پاداشتان باتەوە، بەخوا هەرچی نوێژ دەکەم باوکم شەڕێکم پێ دەفرۆشێت، یان کە نوێژ دادەبەستم دەچیت گۆرانی قادر ئەلیاسی! دەخاتە سەر بە دەنگی بەرز بۆ ئەوەی نوێژەکەم لێ تێك بچێت، شەڕ بە دایکم دەفرۆشێت، بەڕاستی ژیانم لێ تاڵ بووە.

ماکوان: وەڵلا ئەگەر بە قسەی من دەکەیت بڕۆ جلوبەرگ و شتەکانت هەرچیت هەیە بیهێنە و من سەیارەکەم ئەیەم بە کاوە بۆ ئەوەی بۆت بگوازێتەوە، ئەڵێی چی؟

میلاد: وەڵلاهی ئەوەم بۆ بکەن هەرگیز لەبیری ناکەم، خوای گەورە پاداشتان باتەوە، مەمنونتان دەبم.

کاوە: با تۆ بگەیەنینە ماڵەوە جارێ و سەیارەکەت دەبەم، ئەگەر دڕەنگ سەیارەکەم هێنایەوە سویچەکانی لەجێگایەك بۆ دادەنێم، لە دەرگا نایەم با مناڵەکان خەبەریان نەبێتەوە، باشە؟

ماکوان: ئاساییە سەیارەکەش نەهێنیتەوە بەیانی بە قیتار ئەچم بۆ ئیش.

منیان گەیاندەماڵەوە و شەو سەیارەکەی هێنابووەوە، بەیانی کە لە کار تەواو بووم چووم بۆلای کاوە بۆ غەسلەکەی بەختیار، تەماشا دەکەم میلادیش لەگەڵ کاوە سەیارە پۆڵیش دەکات، زۆر خۆشحاڵ بووم، پرسیم چیتان کرد دوێنێ شەو؟

میلاد: ماڵی کاك کاوە ئاوەدان بێت ڕزگاری کردم لە جەهەنەمی باوکم، هەرگیز لەبیری ناکەم.

کاوە بانگی کردم وتی؛ گوناحە زۆر کوڕی چاك دیارە، زۆر گەنجێکی بە ئەدەبە.

ماکوان: دەی خوا جەزات باتەوە کاوەی برام، ئەو ٥ هەزار کرۆنەم بۆ ئەو هێناوە بۆ ئەم مانگە با موحسین بۆڵە بۆڵ نەکات.

## بەهیوای کۆنگرەی جنۆکەکان

لەگەڵ کاوە ڕێکەوتین کە میلاد بەرێتە لای خۆی و سوپاس بۆ خوا کارەکەی ئەنجامدرا، نەك هەر بردییە لای خۆی بەڵکو لەگەڵ خۆیدا لای بەختیار لە غەسلەکە دایمەزراند، بۆ بەیانی ئەو ئێوارەی کە ئەشیاکانیان گواستەوە چووم بۆ لایان، تەماشام کرد هەردووکیان بەیەکەوە سەیارەیان پۆلیش دەکرد، سڵاوم لێکردن خۆشحاڵی خۆم دەربڕی، بڕێک پارەم بردبوو بۆ کاوە تا کرێی مانگێک کرێی خانوو و هەندێك پارە بۆ خەرجی میلاد پێی بێت تا قورسایی لەسەر کاوە و موحسین نەبێت، کاوە قبوڵی نەدەکرد بەڵام بەزۆر پارەکەم پایە، چوونکە من لە هەموویان باشتر بووم لە ڕووی ماددییەوە.

کاوە: کاکە ئەو کوڕە زۆر کوڕێکی موحتەرەمە، زۆر ڕێز دەگرێت، دوێنێ شەو قسەمان زۆر کرد، زۆر بەتوانایە لە بواری وەرزشەوانی و یاری (دەمبڵ) دەکات.

ماکوان: زۆرباشە ئاگات لێی بێت، (دەمبڵ) چییە کاوە؟ ئەوە یەکەم جارە بیبیستم.

کاوە: دەمبڵ یارییەکی ئێرانییە و ئەوانەی زۆر بەهێز نەبن ناتوانن بیکەن. دوو داری گەورە لەسەر شێوەی کوپ یاخود مەرکانەدایە، هەڵیدەسوڕێنێت، ئەوانەی ئەو وەرزشە دەکەن، زۆر زۆر بەهێزن و هەرگیز نابێت شەڕیش بکەن، چوونکە هێزیان زۆر زۆرە، لەوانەیە بەیەك پیاکێشان کەسێك بکوژێت.

ماکوان: بەڕاستە، یەعنی میلاد ئەوەندە بەهێزە؟

کاوە: بەگوێرەی قسەی خۆی بێت وایە، بڕواش ناکەم درۆ بکات.

ماکوان: وەڵڵاهی ئەوە زۆر موهیمە، ئیشی منی زۆر ئاسان کرد.

کاوە: جا تۆ بۆچیتە، خۆ شتی پێ بار ناکەیت؟

ماکوان: نا تۆ جارێ وازم لێ بێنە با ئەو بانگ بکەم ئیشم پێیەتی.

میلاد، میلاد وەرە واز لەو پۆلیشە بێنە کارم پێتە.

میلاد: فەرموو کاك ماکوان گیان ئەمر کە.

ماکوان: تۆ چ وەرزشێک دەکەیت؟

میلاد: کوشتی باستانی و کەمێك (کاپوێیرا)[٢] دەزانم.

ماکوان: باوەڕ بکە نە ئەزانم کوشتی چییە، نە ئەوەی تریش وتت.

کوشتیم بیستووە ئەزانم فارسییە، بەڵام نازانم چ جۆرە وەرزشێکە، ئەوانی تر یەکەم جارمە ناویان ببیستم.

میلاد: کوشتی بە نەرویجی پێی ئەوترێت (بریتینگ) وە بە ئینگلیزی پێی دەوترێت (ورستڵین) (کاپوێیرا) جەنابت دەزانیت لەسەردەمی هێنانی عەبدە ڕەش پێستەکانی ئەفەریقا ئەوان ئەو یارییەیان دەکرد دژی سەرۆکی بەڕازیل، چوونکە بۆ ئەوان قەدەغە بوو وەرزش بکەن، ئیتر ئەم

---

Capoeira[٢]

جۆرە سەمایەیان دەکرد، لە ڕاستیدا ناوی سەمای مەرگە. تا لە دواییدا بوو بە جۆرێک لە وەرزش و خەڵکی بەهێز دەتوانێت بیکات.

ماکوان: ئەی باشە تۆ لە (تای بۆکسین و کیک بۆکسین) نازانیت؟

میلاد: بەڵێ کاك ماکوان هەردووکیان هەر یەکە، بەڵام ئەوە یاری منداڵ و قوماربازەکانە، زۆر بێ سومعەیە ئەو یاریە لەناو وەرزشدا.

ماکوان: میلاد گیان جوان گوێ بگرە چی دەڵێم، یەکەم ڕۆژی یەکترناسینمان لەبیرتە لەگەڵ ئافرەتێک دانیشتبووم پیتزامان دەخوارد؟

میلاد: بەڵی کاك ماکوان، ئەو ڕۆژە هەرگیز لەبیرناکەم.

ماکوان: ئەو ئافرەتە گیرۆدەی دەستی ئەو وەرزشە و دەستی قوماربازەکانە،کۆیلە کراوە، ئێستا خۆی شاردۆتەوە لە ترسی ئەوان پێشتر کەسێکی بێ دین و خوانەناس بوو، بەڵام خوای گەورە هیدایەتی داوە، کۆنتراکتی لەگەل ئەواندا هەیە، یەکەم و دووەم و سێیەمی براوەی ئەو یارییە دەتوانێت بیکڕیتەوە. خێرت دەگات بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە ڕزگار بکەین.

میلاد: ئەگەر یەکەم نەبیت ناتوانیت کۆنتراکتەکە بەتاڵ بکەیتەوە، چوونکە تەنها یەکەمە کە مافی ڤیتۆی هەیە، بۆ نمونە ئەگەر من یاری بکەم و دووەم بم داوای ئەو ئافرەتە بکەم، یەکەمەکە دەتوانێت ڤیتۆی کیک بۆکس لە قومارەکەدا بەکار بهێنێت و بیبات بۆ خۆی.

ماکوان: ئەتوانیت چیم بۆ بکەیت؟

میلاد: سەرەتا دەبێت بزانیت کە من سویندم خواردووە کە لەسەر قومار یاری نەکەم، دووەم خۆ ئەگەر سوێندەکەم شکاند دەبێت بزانم لە کێشی چەند ئەو ئافرەتە کۆنتراکتەکەی بەستووە، سێیەم دەبێت پارەیەك بخەوێنیت حەقی ئەو پشتوێنە بۆ یانەکە یاخود کۆمپانیاکە یاخود هەرکەسێك منیش ئەو پارەیەم نییە.

لەبەر ئەوە ئاسان نییە لە ئێستادا من ماوەی ٦ مانگە تەمرینم نەکردووە و لاشەم هەمووی تێك چووە.

ماکوان: میلاد گیان ئەوانەی باست کرد من هیچی لێ نازانم ئەوەی بیزانم ڕزگارکردنی ئەو ئافرەتەیە، پاشان تۆ وەعدێکم بدەرێ کۆتا ڕێگا کە دەیگرمە بەر ئەم یاری کردنە قومارەیە لەسەر ئەو ئافرەتە.

میلاد: کاکە ماکوان تۆ هەرچی بڵێیت لە خزمەتام، بەڵام ئەو خانمە بانگ بکە بزانم کۆنتراکتەکەی چۆنە وچییە، بەڵام دەبێت ماوەیەکم بدەنێ تا بتوانم تەمرینەکانم دەست پێ بکەمەوە و جەستەم ئامادە بێتەوە.

ماکوان: تۆ خەمی ئەوەت نەبێت، ئەوە هیچ نییە چارەسەری دەکەین بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

میلاد: لە خزمەتام، ئیستا با بگەڕێمەوە سەر کارەکەم، تۆ چیت پێباش بێت وا دەکەین.

ماکوان: إن شاء الله، فەرموو...

دوای ئەوەی کە قسەکانم لەگەڵ میلاد تەواو بوو تەلەفۆنم بۆ کرۆنیکا کرد، وتم پێویستە بتبینم.

کرۆنیکا: کەی و لەکوێ؟

ماکوان: ئێستا، من دێم بۆ لات وەرە سەر مەرزی نێوان سوید و نەرویج، لەوێ ڕێستورانتێکی لێیە لەوێ یەکتر دەبینین.

کرۆنیکا: دایکم ئەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات.

ماکوان: با بفەرموێت لە خزمەتیدام.

فاتمە خان: کوڕم وەرە بۆ ئێرە یاپراخێکی خۆشم دروست کردووە، لە ڕێگا نانی گەرم بهێنە.

ماکوان: باشە بەسەرچاو لای ئێوە نان دەخۆم.

چووم بۆ لای بەختیار لێم پرسی کەی دوکان دادەخەن؟

بەختیار: دوو کاتژمێری تر.

ماکوان: ئەکرێت میلاد لەگەڵ خۆم بەرم، ئیشم پێیەتی مەمنون دەبم هاوکاری بکەیت.

بەختیار: ئەوە کەی قسەیە دەیکەیت، داوای ئیزن لەمن دەکەیت، خۆشم و دوکان و کرێکارەکانیشم لە خزمەتدان.

ماکوان: خوای گەورە لێت ڕازی بێت حەوت برا گیان، بانگی میلادم کرد وتم حەز لە دۆڵمە دەکەیت؟

میلاد: هیوایەتمە، خۆ ئەگەر گۆشتی تیابێت مەلەی تیا ئەکەم.

ماکوان: واتا تۆش وەك من وایت بۆ گۆشت خواردن تەبیعەتی تیمساحت هەیە؟

میلاد: ئەرێ وەڵڵا کاك ماکوان هیوایەتم گۆشتە.

ماکوان: بڕۆ بابڕۆین، خێرا تەلەفۆنم بۆ کرۆنیکا کرد وتم کەسێکی ترم لەگەڵدایە، یاپراخەکە بەش دەکات؟

کرۆنیکا: دایکم مەنجەڵێکی گەورەی لێناوە

ماکوان: وەزعی گۆشت چۆنە تێیدا؟

کرۆنیکا: پڕە لە گۆشت و پەراسو، لێرە گۆشت هەرزانە وەکو نەرویج نییە.

ماکوان: واهاتین نان حازر بکە.

کرۆنیکا: یاخوا بەخێر بێن.

لەگەڵ میلاد کەوتینە ڕێ بەرەو سوید، میلاد وای دەزانی خێزانم دۆڵمەی دروست کردووە و دەچین بۆ ماڵی ئێمە، کە بەرەو سوید چووین وای زانی ئەچم کەرەستەی یاپراخ ئەکڕم، چوونکە بەگشتی نرخی هەموو شتێك لە سوید هەرزانترە لە چاو نەرویج. کەوتینە ڕێ لەڕێگا پرسیارم لێ دەکرد دەربارەی کیک بۆکسین، وتی کاك ماکوان بێخەمبە، توانام زۆرە بەڵام پێویستم بەکاتە بۆ بونیادنانەوەی جەستەم، کە لاشەم بونیاد نایەوە خەمت نەبێت، دڵنیات دەکەمەوە بێخەمبە.

ماکوان: برا عەزیزەکەم من هەموو ئەو یارییانە بە حەرام دەزانم، با قومارەکەشی لەولاوە بووەستێ، خۆت دەزانیت من خۆم ئامۆژگاری خەڵك

دەکەم کە دوور بن لەو جۆرە کارانە، بەڵام براکەم چارمان ناچارە کە ئەو موصیبەتە هەرچۆنێك بێت لێی ڕزگار بکەین ئەو خوشکە، کەسی نییە هەردەبێت هاوکاری بکەین.

میلاد: هیچ کەسی نییە؟

ماکوان: براکەم ئەگەر کەسێکی باشت هەبوایە تووشی ئەو هەموو کارەساتە دەبووی؟، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: ئەگەر ئیماندار هاوکاری یەکتری بوون خوای گەورەش هاوکارییان دەبێت.

میلاد: زۆر ڕاستە!

ماکوان: ئێستا دەچین بۆ ماڵی ئەو کچەی کە لە دوکانی پیتزاکە بینیمان، بەڵام نابێت لای کەس باسی بکەیت، چوونکە ئەوان خۆیان شاردۆتەوە لە ترسی ئەو باندە مافیا قومارچییە.

میلاد: نا کاک ماکوان، بێخەمبە، چۆن باسی دەکەم.

ماکوان: زۆر باشە ئەی پێم بڵێ لای کاوەت بەدڵە؟

میلاد: خوا پاداشتت باتەوە، بەڕاستی کاك کاوەش زۆر پیاو بوو لەگەڵمدا، هاوکارم بوو ماڵی ئاوا بێت.

ماکوان: هەر دەبێت وابێت، ئەو ئیماندارە و هاوشاری خۆتە.

بەڕێگاوە تا چووینە ئەو شارەی کە کرۆنیکا و دایکی لێبوون داوام لێکرد ئەدرەسەکەم بە نامەیەك بۆ بنێرێت، تا گەیشتین لەگەڵ میلاد باسی ئایین و وەرزشمان دەکرد. چووینە بەردەرگای ماڵەکەیان کرۆنیکا دەرگای کردەوە

و پێشووازییەکی گەرمی لێکردین، چوومە لای دایکی و دەستیم ماچ کرد. میلادیش لاسایی منی کردەوە دەستی فاتمە خانی ماچ کرد، دانیشتین بۆ نانخواردن، نانخورا و کرۆنیکا چای ئامادەکردبوو دەیزانی من حەزم لە چایە دوای نانخواردن. بە کرۆنیکا و میلادم وت من لەگەڵ فاتمە خانم هەندێك قسەم هەیە، پێشتر کرۆنیکام ئاگادار کردبووەوە کە هەرچی شتە بۆ میلادی باس بکات دوایی لەگەڵ میلاد پلان دادەنێین و قسە و باسی لەسەر دەکەین.

من لەگەڵ فاتمە خان کەوتمە قسە، کرۆنیکا و میلادیش لە بەلەکۆنەکە دانیشتن قسەیان دەکرد.

بە فاتمە خانم وت زۆر خۆشحاڵم کە ئەتبینم دڵخۆشیت.

فاتمە خان: وەڵڵا باوکەکەم ئەوەی تۆ کردوتە، مەگەر خوای گەورە پاداشتت باتەوە. بەخەوو خەیاڵێش بیرم لێنەدەکردەوە کە چیمەن نوێژ بکات و لەگەڵما بێت بۆ عومرە، زۆر مەمنونتم.

ماکوان: دڵەکان لەنێوان پەنجەی خوای پەروەردگارە، خوای پەروەردگار هیدایەتی داوە، لەبیرت نەچێت ئەوەندەی نارەحەتی و تاریکی بینیووە چیمەن، بۆیە ئێستا وا باوەشی کردۆتەوە بۆ نووری ئیسلام.

فاتمە خان: هەمیشە خەریکی خوێندنەوەیە بە کتێب و ئینتەرنێت و دایمە بەیەکەوە گوێ لە تۆ دەگرین، بەخوا ئێستا بەیانیان ئەو هەڵمدەسێنێت بۆ نوێژی بەیانی لە خوای گەورە بەزیاد بێت، بەڵکو بیدەی بەشووو ماکوان گیان، باماڵومنداڵی هەبێت.

ماکوان: بە پشتیوانی خوای گەورە هەندێ ئیش و کاری ماوە با بۆی جێبەجێ بکەین، إن شاء الله کوڕێکی باش و خواناس و دەست و داوێن پاکی بۆ ئەدۆزمەوە.

فاتمە خان: ئەی پارەی ترت نەدەمێ بینێریتەوە بۆ فەقیر و هەژار؟

ماکوان: با نزیك بینەوە لە جەژنی قوربان ئەو کات لێت وەردەگرم، پارەکەی تریان بۆ دابەش کردبوویت و ناوی ئەو ماڵانەشیان ناردبوو بۆ من منیش دام بە چیمەن، نازانم پێی وتیت کە چۆن پارەکەمان دابەش کردووە؟

خاتمە خان: ئەرێ بەخوا هەمووی بۆ خوێندمەوە، خوا خێری تۆش بنووسێت.

ماکوان: من ناوی کاوەشم نووسیوە لەگەڵ تۆ بێت بۆ حەج، کە مادام چیمەنت لەگەڵ بێت ناوی ئەو دەکوژێنمەوە و لەگەڵ چیمەن بۆ خۆتان دوو بەدوو بڕۆن.

فاتمە خان: ئەوە تۆ دەڵێی چی، بەخوا بەبێ ئەو کوڕە ناڕۆم، ئەو یەکەم جار ڕازی بووە ئەزانم چەندە دڵی خۆش بووە چۆن دڵی دەشکێنم و پەشیمان دەبمەوە، ئەوە بەڕاستە هەر باسیشی مەکەوە، وەکو کوڕی خۆم وایە با لەگەڵمان بێت، مادام تۆش متمانەت پێیەتی زۆر گرنگە لەگەڵمان بێت.

ماکوان: خوای گەورە بیخاتە میزانی حەسەناتت، خۆشم هەر چاوەڕێی ئەوەم لێ دەکردیت فاتمە خان گیان، بەخوا هێندەی ئامینە خانی دایکم حورمەتت هەیە لام.

فاتمە خان: خوای گەورە ئامینە خانی دایكت بۆ بهێڵێت، ئەی ڕۆڵە با پارەكەت بەمن لای تۆ بێت، ئیتر با ئەوەنە پێت نەڵێمەوە، باشە؟

ماكوان: باشە لە خزمەتا.

هەڵسا چوو پارەكەم بۆ بهێنێت، منیش چووم بۆلای كرۆنیكا و میلاد لەگەرمەی قسەدا بوون، پرسیم: میلاد كێشەكەمان بۆ چارەسەر دەبێت؟

میلاد: قورسە بەڵام هەوڵی لەگەل ئەدەین.

ماكوان: تۆزێكم بۆ باس بكەن، بزانم.

میلاد: ئەم خوشكە لە بەشی كێشی ٦٥-٧٥ كۆنتراكتی نوسیووە، منیش ٨٥ كیلۆم، ئەبێ دە كیلۆ یان زیاتر دابەزم بۆ ئەوەی بڕۆمە ئەو بەشەی ئەوان و قوبوڵ بكرێم، بەڵام پارەكە زۆر زۆرە لە تواناماندا نییە بیدەین.

میلاد پێی وابوو دەبیت پارەكە من بیدەم و كرۆنیكا خۆی پارەی نییە!

ماكوان: پارەكە چەندە؟

میلاد: سەد هەزار كرۆنە بۆ یانە و كۆمپانیا، ئینجا ئێمە نە یانەمان هەیە نە كۆمپانیا، بۆیە ناتوانین بچینە ناوەوە. خۆ ئەگەر لە ڕێگای كۆمپانیایەك یاخود یانەیەكەوە بچینە، ئەوا مەرجە ئێمە و پارەكەش قبوڵ بكەن، لێرەدا پرسیار ئەوەیە كێ ئەوە لەگەڵ ئێمە دەكات؟

ماكوان: ڕێگا چارە چییە، ئەوەی باست كرد كێشەكانە، چۆن چارەسەری بكەین؟

كرۆنیكا: خۆم هەموو پارەكە ئامادە دەكەم هەرچەندی بوێت.

میلاد: ئەگەر پارە هەبێت من ناهێڵم بە پشتیوانی خوا پارەکەت بفەوتێت، لە فینلەندا یانە هەیە مەمنونە کە بچێتە ناو ئەو یارییە و منیش دەیانناسم، بەڵام من پێویستم بە ٦-٨ مانگە تا بتوانم کێشم دابەزێنم و دەست بکەمەوە بە تەمرین کردن، پێویستیشم بە ڕاهێنەرێکی باشیش دەبێت.

ماکوان: ئەوەی باسی دەکەیت چەندی تێدەچێت؟

میلاد: ئەگەر ماوەی ساڵێک دابنێین بە تێروتەسەلی بۆ من و ڕاهێنەر و شووێنی ڕاهێنانەکە ٣٠٠-٤٠٠ هەزار کرۆنی دەوێت، ئەگەر زۆر ڕەزیلییش بکەین و مانگی ٣٠ هەزار کرۆن حساب بکەین ئەوا ٢٠٠ هەزاری تێدەچێت.

ماکوان: من ٥٠٠ هەزار کرۆن ئاماە دەکەم، تۆ دڵنیام بکەوە لەسەرکەوتن، من زیاترتان بۆ ئامادە دەکەم وەك دیاری.

میلاد: ئەگەر نیو ملیۆن کرۆن ئامادە بێت ئەوا من پشتێنەکە دەبەم، پشتیوان بەخوا.

کرۆنیکا: مامۆستا ماکوان چی بڵێت من لە قسەی دەرناچم.

ماکوان: ئێوە بەردەوام بن لە قسەکانتان، من دەچم بۆلای فاتمە خان.

فاتمە خان نزیکەی ١٥٠ هەزار کرۆنی بۆ هێنابووم بۆی دابەش بکەم بەسەر فەقیر و هەژاردا، منیش عەرزم کرد با جارێ پارەکە بمێنێت، پێ دەچێت خۆمان پێویستمان بێت بۆ کرۆنیکای دابنێ فاتمە خان.

فاتمە خان: کوڕم ئەمە بەشی فەقیرە، ئاگام لێتانە و گوێم لەهەموو شتێك بوو، چیمەن هەمووی بۆ باسکردووم، خەمت نەبێت بۆ ئەو دە ئەوەندەی

تر هەیە. خوای گەورە تۆ سەلامەت بكات كێشەی پارەت نەبێت. خۆت لە ڤیدیۆیەكدا دەڵێیت پارە لە پێناوی خوا ببەخشن خوا لە دەردو بەڵا و موصیبەت ڕزگارتان دەكات،، ئەوە منیش لە پێناوی خوا دەیبەخشم بەڵكو خوای گەورە ئەو كچەم ڕزگار بكات و پاك بێتەوە.

ماكوان: خوای گەورە تەمەن درێژت بكات و بۆ ئێمە و هەزارانیشت بهێڵێت.

كات درەنگ بوو داوام لە میلاد كرد كە بگەڕێینەوە بۆ نەرویج، لە ماڵئاوایی كردندا بووین كرۆنیكا زەرفێكی هێنا.

كرۆنیكا: مامۆستا ماكوان ئەو پارەیە بەكاربهێنە بۆ ڕاهێنانی كاك میلاد.

كە تەماشام كرد و پرسیم چەندە وتی٢٥٠ هەزار كرۆن كە هەمووی ١٠٠٠ كرۆنی بوو، وەرم نەگرت وتم هەڵی بگرە نەوەك پێویستت پێی بێت من. لە حسابی بانكییەكەم پارەم هەیە. كە لەڕاستیشدا تەنها ٧ هەزار كرۆنم هەبوو.

كرۆنیكا: بەخوا پارەی تریشم زۆرە، تۆ جارێ ئەوە سەرف بكەن، دوایی خۆم قسەت لەگەڵ دەكەم، ئەگەر لێشم وەرنەگریت چیتر قسەت لەگەڵ ناكەم و كارەكەش هەڵدەوەشێنمەوە.

ماكوان: باشە كێشە نییە.

پارەكەم لێوەرگرت و پێم وت بیرت نەچێت من براتم و لەپشتتم، خەمی هیچت نەبێت.

كرۆنیكا: ئەزانم خوای گەورە لەمنت نەسێنێت،

ماڵئاوایم لێ کردن و بە گیرفانی پڕەوە هاتینە دەرەوە. لەناو سەیارەکە بە میلادم وت لەبەیانییەوە دەست دەکەیت بە ئیش و کارەکان بۆ ڕێکخستنی تەمرینەکانت، هەموو مانگێك ۳۰ هەزار کرۆن لە من وەربگرە، میلاد نەیزانی کە کرۆنیکا پارەکەی یاومەتێ، چوونکە کاتێك کە پارەکەی بۆ هێنام ئەو چووبووە ناو سەیارەکە و چاوەڕێی منی دەکرد.

میلاد: جا کاك ماکوان پارەت هەیە، بەخوا زۆرە ئەو پارەیە بۆ تۆ هەڵناسوڕێت.

ماکوان: خوای گەورە ئاسانی دەکات، ئێمە شەرەفی خوشکی موسوڵمان دەکڕینەوە و سەری بەرز دەکەینەوە بیر لە پارە مەکەوە، خوای پەروەردگار پاداشت و ئەجرمان بۆ بنووسێت.

میلاد: ۳۰ هەزار زۆر زۆرە، جارێ با بە ۲۰ هەزار دەست پێ بکەم هەوڵ ئەدەم کەمتریشی بکەمەوە بۆ ۱۵ هەزار.

ماکوان: وەکو وتم بیر لە پارە مەکەوە، ۳۰ هەزارت ئەدەمێ نانی باش بخۆ و خۆت هیلاك بکە و کام ڕاهێنەرە باشە ئەوە بەکاربهێنە.

میلاد: باوکم باشترین ڕاهێنەرە، بەڵام دڵنیام کە هاوکاریم ناکات.

ماکوان: من قسەی لەگەڵ دەکەم.

میلاد: کاک ماکوان بە خوا لەم دنیایە بەس ڕقی لە تۆیە، شتی وا مەکە بە قسەم بکە قسەی لەگەڵ مەکە چوونکە دڵنیام بە قسەت ناکات.

ماکوان: ئەی ئەگەر باوکت نەبێت کێی تر هەیە کە زۆر بەتوانا بێت؟

میلاد: کەسێکی تر هەیە لە ئەڵمانیا ئەژی، ئەویش وەکو باوکم بەهێزە.

ماکوان: باوکت تەمەنی چەنە؟

میلاد: ٥٥ ساڵە، بەڵام زۆر بەتوانایە.

ماکوان: زیاتر لەکوێ دادەنیشێت، تەلەفۆنەکەیم بدەرێ.

میلاد: جێگایەکی وای نییە هەمیشەیی بێت، بەڵام خەریکی سەیارە کڕین و فرۆشتنە.

ماکوان: من هەولێك ئەیەم بزانم چی دەبێت، بەس پێم بڵێ لەگەڵ کام حیزبە، لە حیزبە کوردییەکانی ڕۆژهەڵات.

میلاد: دیموکراتە، بەڵام وازی هێناوە، بەلام ئەوانی خۆش ئەوێت.

ماکوان: زۆرباشە، بیر لە هیچ مەکەوە تەنها کێشی خۆت دابەزێنە و خەریکی وەرزش و ڕاهێنانەکانت بە، چەند مانگی تر پێویستت بە ڕاهێنەر دەبێت.

میلاد: ئەگەر بەردەوام بم و ڕۆژانە ڕاهێنان بکەم سێ مانگی تر پێویستم پێیان دەبێت.

ماکوان: ئەی خۆت ناتوانیت کاری ئەوان بکەیت؟

میلاد: نا، ئەوان ئەزموونیان هەیە، هەمیشە پێویستت بە ڕاهێنەر دەبێت.

ماکوان: ئەمەوێت فیلمێك لەگەڵ باوکت دروست بکەم، باوکت ئەزانێت لەگەڵ من پەیوەندیت هەیە؟

میلاد: نا، نازانێت.

ماکوان: زۆر باشە، باوکت بڕوای چۆنە بە (پیرشالیار)؟

میلاد: هەر سوێند بەو دەخوات، بەڕاست ئەوە کێیە؟

ماکوان: هەر زۆر باش و فرە خاسە، من بەیانی دەچمە لای و قسەی لەگەڵ دەکەم، ناوی چییە باوکت؟

میلاد: ناوی مام فەرهادە، بەڵام لە ڕاستیدا ناوی علی یە و ناوەکەی خۆی گۆڕیووە بە مام فەرهاد، بەخوا کاك ماکوان باوکم پیاوێکی زۆر بێئەقڵە تکایە مەچۆ بۆلای، نەوەك قسەی هەڵە بکات.

ماکوان: نا وامەڵێ دەبێت هەر ئیحترام و ڕێزی باوکت بگریت.

بەردەوام بووین لە قسەکردن تا گەیشتینەوە ماڵەوە.

بۆ بەیانی خۆم ئامادە کرد بۆ کۆنگرەی جنۆکەکان، چاوەڕێ بووم کازۆڵ بێت بە شووێنما، بەڵام لەکار گەڕامەوە چووم بۆ ئەو جێگایەی کە بردمی بۆ لای بەرقان و حەزقیل، بەڵام خەبەرێك نەبوو گەڕامەوە بەرە و مزگەوت وتم بەڵکو لەوێ بیبینم لەوێ وەرماشم بینی وتم سەرکەوە بۆ چاوشارکێم لەگەڵ دەکەیت، خۆت لێ شاردومەتەوە هاوڕێیەتی وا نابێت! هەر ئاوڕم داوە لە تەنیشتم لەناو سەیارەکەدا دانیشت.

وەرماش: دەنگوباست ماکوان؟

ماکوان: سوپاس باشم دەنگوباسی تۆ، بۆ دەرناکەویت لەکوێیت، هیچت بۆ کردم بۆ ئەڵماسەکان؟

وەرماش: ئەوەی تۆ داوای دەکەیت زۆر قورسە و بۆم ناکرێت.

ماکوان: ئەی داوای چیت لێبکەم دەتوانیت بۆم بکەیت؟

وەرماش: وەڵلا دنیایەك ئاڵتون و شتی کۆن دەزانم لەکوێ حەشار دراوە، پێت دەڵێم برۆ بیبە بۆ خۆت، باشە؟

ماکوان: شتی وام ناوێت، چی لێبکەم. دوایی سەریشم تیابەریت.

وەرماش: چیت دەوێت پێم بڵێ.

ماکوان: کچێکی هاوڕێم هەیە ناوی کرۆنیکایە، کێشەی هەیە لەگەڵ هەندێك مافیا و خوێڕی، ئەتوانی بۆم چارەسەر بکەیت؟

وەرماش: مەبەستت فرانکە؟

ماکوان: دەی باشە ئەیناسیت لە زومرەی جەماعەتی خۆتانە.

وەرماش: جا ئەو هاوڕێ و خۆشەویستانەی کە ئەو دەپارێزن، کێ دەتوانیت لە ئێمە بچێت بە دەوریا.

ماکوان: ئەی من خۆشەویستتان نیم، داوایەکی بچوکت لێ دەکەم ناتوانیت، داوای گەورە دەکەم هەر ناتوانیت بیکەیت، توخوا تۆ بەڕاست هیچت پێ دەکرێت، توانات هەیە یان تەنها ئەهلی قسەی؟ وەرماش: وانییە، لەبەر تۆ هەموو هاوڕێکانتم ئازاد کرد، کەچی تۆ هاوکار نیت.

ماکوان: نەخێر ڕاست ناکەیت، هەموو هاورێکانمت گرت بەهۆکاری من و چەند داوایەکم لێ کردی هیچت بۆ نەکرا، ئێستاش کە ئەوانت لێ کردم قسەی چەند زڵ بۆ دەکەیت، نامەوێت برۆ ئەوان بگرەوە، مەمنونت نابم.

وەرماش: کاکە خۆ ئەوان مریشك نین بیانگرم، بۆ وا توڕە بوویت.

ماکوان: داوای ئەوە دەکەم ئەو (باوەحیزەم) بۆ ئاقڵ بکەیت، ئەوەت پێ ناکرێت ئەی داوای چی بکەم، تۆ ڕێك لە دێوەکەی بەرنامەی بەرنامە دەچیت، تەنها قسەت پێیە و هیچی تر.

وەرماش: ماکوان، فرانك زۆر چالاکە لەگەڵ هاوڕێکانی من، ئەوەی ئەو دەیکات ئێمەش ناتوانین بیکەین. لەبەر ئەوە لەمێشکی دەربکە هاوکاریت بکەم بەرانبەر بە فرانك، چوونکە دەزانم، چوونکە دەزانم کە کرۆنیکاشت موسوڵمان کردووە و ناردوتە بۆ حەج، ئیمەش هەموومان لێت تووڕەین.

ماکوان: بڕۆنن کام کێوەی بەرزە بیگرن، تۆ کە پیاوی ئەوە نەبیت کارێکم بۆ ئەنجام بدەیت، ئیتر من چۆن گوێتان بۆ دەگرم.

وەرماش: تۆ بۆ بە شتێکەوە دەنووسێیت کە ئێمە خۆشمان دەوێت هاوکاری سەرەکیمانە.

ماکوان: جامن هەرچی بڵێم و داوا بکەم یان دەڵێیت قورسە یان دەڵێیت خۆشەویستمانە، من هەست دەکەم تۆ تەنها ویستت ئەو هاوڕێ جنۆکانەم لێ بکەیت، ئیشی خۆتت کرد، هەڵسە بڕۆ ملت بشکێنە، تەواو نەییتەوە بەلامدا.

وەرماش: توڕە مەبە، من دەڕۆم کاتێکی تر دێمەوە جارێ ماڵت ئاوا بێت بۆ ئەو هەموو قسەیەی پێت وتم.

ماکوان: دەبڕۆ فشەکەر، بە ملی شکاوت بڕۆیت.

بەڕاستی ملی شکاند و نەما لە چاوتروکانێکدا، زۆر پەست بووم زانیم کازۆڵ بەهۆکاری ئەوە نەهاتووە، کۆنگرەکەم لەدەست دەرچووو بۆ من زۆر گرنگ بوو، بەڵام بەداخەوە.

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و سەرقاڵی کاری ڕۆژانە و ژیانی ئاسایی خۆم بوو، هیچ دەنگێك نەبوو، ئەو سێ مانگەش تەواو بوو کە داوایان لێکردم. ڕۆژێك بیرم لەوە دەکردەوە سەیارەکەم بگۆڕم بە سەیارەیەکی نوێ، چوونکە هەستم دەکرد زوو زوو خراپ دەبێت و ئەشیای دەشکێت، ماندوو بووە. بۆیە چووم بۆلای مامە بەختیاری هاوڕێم وتم بچین بۆ چەند پێشانگایەك تا سەیارەکەم بگۆڕم.

بەختیار: بابڕۆین .

ماکوان: دەنگو باسی میلاد و کاوە؟

بەختیار:کاوە زۆر باشە، بەڵام میلاد کاری تری دۆزیوەتەوە ماوەی دە ڕۆژە لای من نەماوە.

ماکوان: ئێ الحمد لله، ئەی نەیوت ئیشەکەی چییە؟

بەختیار: کارەکەی زۆرباشە، لە کۆمپانیای (بۆش)ی ئەڵمانی دامەزراوە و لەبەشی حسابات و ژمێریاری کار دەکات، ئەم ماوەیە زۆر لاواز و زەعیف بوو بوو، هەرچی وتم ئەگەر کێشەت هەیە با هاوکاریت بکەم، هەستیشم کرد کە پارەی پێیە، لەکاتی ئیسراحەت ماشاءالله بەقەدەر سێ کەس ئەخوارد.

ماکوان: الحمد لله کە وەزعی باشە، لەوانەیە بیری دایك و باوکی بکات بۆیە زەعیف بووە.

کە بەختیار وای وت زۆر دڵخۆش بووم زانیم کە خەریکی وەرزشە و ئەوەندە ئەمانەت پارێزە هیچی بەوان نەوتووە.

بەختیار: بەڕاستی کوڕێکی زۆر بەئەدەبە، خۆشم ئەوێت دەستپاك و ئیشکەر بوو.

ماکوان: الحمد لله.

بەختیار: چییە هەرچی ئەڵێم ئەلێی الحمد لله؟

ماکوان: دەی برا هەر ئەبێ بڵێم الحمد لله باشترە، چوونکە وەکو ئەوە وایە خۆمان پەروەردەمان کردبێت، بۆیە سوپاس بۆ خوا.

بەختیار: ڕاستە، الحمد لله.

ئەویش کەوای وت سەیرێکی کردم و دەستی کرد بە پێکەنین، بەختیار وتی ئەچم بۆ لای کوڕێکی هاوڕێم ئەویش غەسلی هەیە گوایە پارەی قەرزارە و ئەچێت لێی وەربگرێتەوە، وتی دوایی ئەچین سەردانی چەند پێشانگایەکی تر دەکەین، چووین بۆ غەسلەکەی کاك زرار هەولێری، دوای سڵاوکردن لە نووسینگەکەی دانیشتین زۆر ڕێزی گرتین، چەند کەسێکی تری لێبوو نەمدەناسین.

کاك زرار: وتی ئەوە کاك مەلا ماکوانە.

دووانیان زۆر خۆشحاڵ بوون، یەکێکیان بەساردی تەوقەی لەگەڵ کردم، کە ئێمە دانیشتین ئەو هەڵسا بڕوات کاك زرار وتی: مام فەرهاد بۆ کوی دەڕۆیت، ئەی مامەڵەکە تەواو نەکەین؟

ئەوکات زانیم ئەوە باوکی میلادە و لەداخی من دەڕوات.

ماکوان: کاك زرار ئەگەر من و مام بەختیار لەکاتی ناوەخت هاتین دەڕۆین و دوایی دێینەوە، با مامەڵەکەی جەنابت و مام فەرهادی بەڕێز تەواو بێت، ویستم ئیحراجی بکەم.

کاك زرار: نەوەڵڵا شتی تایبەتمان نییە، سەیارەیەکی هەیە دەمەوێت لێی بکڕم.

مام فەرهاد: نا، وتم با قەرەباڵغ نەبێت، میوانەکانت بە ئیسراحەت دابنیشن. من دەچمە دەرەوە جگەرەیەك دەکێشم.

ماکوان: مام فەرهاد دانیشە برا من خۆشحاڵم بە ناسینت، بەلەهجەکەشتا دیارە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی نیشتیمانی لە شاری کرمانشاه دەچێیت وایە؟

وتم ئێستا لە دڵی خۆیدا دەڵێت وەڵڵا من خۆشحاڵ نیم بە ناسینت.

مام فەرهاد: زۆر بەڕێزەوە لە خزمەتاندام، منیش خۆشحاڵم بە ناسینت.

ماکوان: باسی مامۆستا ڕەبیعیم کرد کە بەدەستی کۆماری شیعەنشینی ئێران لەسێدارە درا، هەربۆ ئەوەی موجامەلەی بکەم، وتم ئەزانی من خەڵکی ناوچەی ئێوەم چەندە خۆش ئەوێت، بەڕاستی موسوڵمان و کاکەییەکانتان مەبەستم یەرسانییەکان بوو، هەمووی خەڵکی بەڕێز و کورد پەروەرن.

مام فەرهاد: وەڵڵا کاك ماکوان من سوپاست دەکەم، من لە یەرسانییەکانی ئەو ناوچەیەم.

ماکوان: بەڕاستی مام فەرهاد، ئێمە لەناوچەی خۆمان زۆر ڕێز و حورمەتی یەرسانییەکانمان لایە، بەتایبەت لەناوچەی هەڵەبجە (هاوارییەکان) زۆر بەڕێزن، لەگەل ئەوەش کە موسوڵمان نین بەخوا لە ڕەمەزاندا یەك کاکەیی و هاواریی نابینیت جگەرە بکێشێت، هەموویان ڕێزی موسوڵمانەکان دەگرن.

زۆر بە شان و باڵی یەرسانییەکانداهاتم، ئاگام لێبوو زۆری پێخۆش بوو.

## ئاشتبوونەوەی میلاد و مام فەرهاد

قەدەری خوای گەورە وابوو کە لە غەسلەکەی کاک زرار گەیشتم بە باوکی میلاد، هەندێك گفتوگۆمان کرد، پرسیارم لێ کرد کە ئێیی چی دەکات؟

مام فەرهاد: خەریکی سەیارە کڕین و فرۆیشتنم.

ماکوان: وەڵڵا مام فەرهاد منیش دەمەوێت سەیارەکەم بفرۆشم، سەیارەیەکی نوێ بکڕم، بۆ هاوکاریم ناکەیت؟

مام فەرهاد: سەیارەکەت چییە و بەچەند دەیفرۆشیت؟

ماکوان: وەرە بچین تەماشایەکی بکە و ئەگەر کرا هەر لەوەی خۆم چەند مۆدێل سەرووتر دەکڕم. ئەوەی خۆم هەست دەکەم ماندوو بووە، چوونکە من بۆ کار بەکاری دەهێنم.

بەیەکەوە هەڵساین چووین بۆ لای سەیارەکەم، تۆزێ تەماشای کرد. پێم وت بڕۆ کەمێك لێبخوڕە بزانە چۆنە؟

مام فەرهاد: بڕۆ بەیەکەوە دەرۆین، ئەم جۆرەی تۆ (ئەڤانگاردە) سەیارەیەکی نایابە، بۆ دەیفرۆشی عەیبی چییە؟

ماکوان: گڵۆپی مەکینەکەی داگیرساوە لەوە دەترسم.

مام فەرهاد: ئەی لە جیهازت نەیاوە، ناڵێت لەچی دەردەچێت؟

ماکوان: بردمە شەریکە وتی تەنها پشکنینەکەی ١٥٠٠ کرۆنە، هەرچی لە پشکنینی بۆ دەکەن دەبێت لای خۆشیان چاکی بکەیت، منیش لە ئێستادا نەم زانی چییە لەوانەیە زۆری تێبچێت.

مام فەرهاد: جا ئاوا بیفرۆشیت پارەی کەم دەکات، من لە ماڵەوە جیهازم هەیە پشکنینی بۆ دەکەین بزانین لەچی دەردەچێت، خۆ لە وانەیە شتێکی ئاسان بێت، ئیتر بۆ ئەو هەموو پارەیەی تیا خەرج دەکەیت.

ماکوان: جا وەڵلا مەمنونیش دەبم.

مام فەرهاد: بابڕۆین بۆ مالێ ئێمە لە گەراجەکە پشکنینی بۆ دەکەین، زۆرمان پێ ناچێت.

ماکوان: فەرموو زۆر سوپاسی هاوکارییەکەت دەکەم مام فەرهادی بەڕێز.

مام فەرهاد: لە خزمەتام، بەڵام حەز دەکەم بزانیت من زۆر شارەزا نیم لەزمانی نەرویجی و ئینگلیزی، کوڕێکم هەیە ئەو باش لێی دەزانێت ئەویش لەماڵ نییە، ئەگەر خۆت لێی تێبگەیت زۆر باشە.

ماکوان: ئەگەر زانیم ئەوە نووری عەلا نوور، ئەگەر نەمزانی دەینووسین و دەیبەین بۆ کۆمپانیایەك پێمان بڵێن.

مام فەرهاد: ئێ زۆر باشە

ماکوان: حەقی ماندوو بوونەکەشت ناهێڵم بفەوتێت مام فەرهاد.

مام فەرهاد: کورە جا ئەوە چییە لەخزمەتام.

ماکوان: مام فەرهاد پیاوێکی ڕۆح سووك و خۆشەویستی لە دڵما، چوویتە دڵمەوە زوو هەست دەکەم زۆر نزیك بین لەیەکەوە.

لە دلی خۆما وتم ئێستا یەك جرتم بۆ لێ ئەیات!.

مام فەرهاد: بەڕێزی کاك ماکوان، هەرچەندە من دەمێکە جەنابتان دەناسم لەسەردەمی پاڵتاکەوە، تۆش خاوەن ڕێزی، بەڵام جاروبار زۆر بە شان و باڵی عەرەبدا دێیت، نازانم لەگەل کوردایەتی بەینت چۆنە؟

ماکوان: بڕواناکەم بە شان و باڵی عەرەبدا هەڵبەم من، بەلکو بە شانوبالی ئیسلام دا هەڵئەیەم، لەوانەیە جەنابتان بەهەڵە تێگەیشتبێتن.

مام فەرهاد: ئاخر مەبەستم ئیسلامە.

ماکوان: دەی برا مافی خۆمە، تۆ ئایینەکەی خۆت خۆش ناوێت؟ ئەگەر کەسێك قسەی بە ئایینی یەرسان بلێت قبوڵی دەکەیت؟

مام فەرهاد: نا، مەبەستم ئەوەیە زیاتر گرنگی بە ئیسلام ئەدەیت، گرنگی بە کوردایەتی نادەیت.

ماکوان: تۆ بڕوات بە ئازادی مرۆڤ هەیە؟

مام فەرهاد: بەدڵنیاییەوە، مەبەستم ئەوەیە کە کێشەی ئێمە کێشەی ئیسلام یان یەرسانی نییە، بەلکو کێشەی ئێمە کوردستانە.

ماکوان: ئەم قسەیەی بەڕێزتان ٪٥٠ی ڕاستە، بەڵام ٥٠کەی تری ناتەواو و نوقسانە، دەزانی؟

مام فەرهاد: بۆ ناتەواوە؟

ماکوان: ئێران کە خاوەنی دەوڵەتە کام سیستەمە بەکار دەهێنێت بۆ حوکمڕانی؟

مام فەرهاد: سیستەمی کۆماری ئیسلامییە.

ماکوان: ئەردوگان چەکی دەستی بۆ هەڵبژاردنەکانی تورکیا چییە و چی بەکار دەهێنێت؟

مام فەرهاد: ئیسلامەتی و ستراتیژیەتی عوسمانی.

ماکوان: داعش چۆن دەوڵەتی یان بنووسین لێرە دەوڵەتێکی یەك ساڵی دامەزراند؟

مام فەرهاد: بەئیسلام.

ماکوان: شیعە و سوننەی عێراق کام ئاڵایەیان بەرزکردۆتەوە، عەلمانییەت، نەتەوایەتی، یان ئیشتراکی..هتد.

مام فەرهاد: هەموویان هەر بە ئیسلام قسە دەکەن.

ماکوان: وڵاتانی چواردەور بە چی قسە ڕۆشتوون لە جیهاندا، وەکو سعودیە، ئیمارات و قطر..هتد.

مام فەرهاد: هەموویان سیستەمی ئیسلامە.

ماکوان: ئەفغانستان چی؟

مام فەرهاد: هەر ئیسلام بەکاردەهێنێت، طالیبان و حکومەتەکەش.

ماکوان: ئەی لوبنان، حەسەن نەسروڵلا زۆر بەهێزە، خاوەنی کام ئایدیایە؟

مام فەرهاد: هەموویان هەر ئیسلام.

ماکوان: کام دەوڵەت دیموکراسی و لیبراڵی یان هەرناوێکی تری لێ دەنێین لەچواردەورماندا هەیە؟

مام فەرهاد: شك نابەم هەموو دیکتاتۆرن.

ماکوان: ئەی ئەگەر منیش هاوارم کرد وەکو ئێوە خاوەنی ئیسلامم بۆ ئێوە دەولەتتان هەیە و من نیمە، ئەوە بەهێزە یان بڵێم شووعیم و دیموکراسیم کام لەم سیستەمانە قسە ڕۆیشتووە و خەڵک گوێی بۆ دەگرێت لەم ڕۆژهەڵاتی ناوەندەدا؟

مام فەرهاد: مەبەستت چییە؟

ماکوان: مەبەستم ئەوەیە بۆیە داوای ئیسلام دەکەم، کورد هەرچی ڕێگایە هەیە تاقی کردۆتەوە لە شۆڕشی خۆیدا لەدوای داگیرکردنی، پێشتر بە ئیسلام عەزیز بوون، کە وازی لێ هێنا ڕسوابوو، جەنابت دەزانی کەریم خانی زەند کورد بوو، خاوەنی هەموو دەوڵەتی ئێران بوو، دیناوەرییەکان کورد بوون خاوەنی دەوڵەتی دیناوەری بوون، هەزبانییەکان کورد بوون دەوڵەتەکەیان لە ئازەربایجانەوە دەستی پێ دەکرد تا بابان و سۆران، بەهدینان، دەیان ئیمارەتی تر، ئادەی یەک ناوی دەوڵەتی کوردی عەلمانی یاخود بێجگە ئیسلامیم پێ بڵێ؟

مام فەرهاد: ئەوە گەیشتین، با سەیارەکە فەحس بکەم.

ماکوان: لە خزمەتام مام فەرهاد گیان خۆشحاڵم بە ناسینت.

دابەزین چووە گەراجەکە منیش لەگەڵی دابەزیم، هەڵبەت ئەو سەیارەکەی لێدەخوڕی شۆفێر بوو، ماوەیەك خەریك بوو هەڵەکەی بۆ دۆزیمەوە، جیهازەکەی پێی وتین، من تەقەی سەرم دەهات و هیچم لێنەدەزانی، ئەو پەیامەی کە پێی داین نووسیم و دەستخۆشیم لێکرد، دەستم کرد بە گیرفانما ۱۰۰۰ کرۆنم دەرهێنا بیەمێ.

مام فەرهاد: لاییبە بەپارە بۆم نەکردوویت، بڕۆ بچینە ماڵەوە سەرو چایی بخۆینەوە.

ماکوان: نابێت تۆ ماندوو بوویت، هەر دەبێت لێم وەربگریت، بۆ چایەکەش ماڵت ئاوا بیت بۆ جارێکی کە.

مام فەرهاد بە پێکەنینەوە: بۆیە نایتە ژوورەوە تەنها لەبەر ئەوەی یارسانم و موسوڵمان نیم.

ماکوان: وەڵڵا برا وانییە، فەرموو با بڕۆینە ژوورەوە.

کە چووینە ژوورەوە چووینە ژووری دانیشتنەکەیان کەسی لێ نەبوو، خۆی بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم، گوێم لە دەنگی کچێك بوو وتی؛ باوکە تۆی هاتیتەوە.

مام فەرهاد: بەڵێ باوکە گیان منم، دایکت لەکوێیە؟

خێزانی وەڵامی دایەوە وتی لێرەم چیت گەرەکە عەلی؟

مام فەرهاد بە لەهجەی کرمانشاهی بە خێزانی وت: وەرە میوانمان هەیە چایەك حازر بکە.

خێزانی بەڕێزی هاتە ژوورەوە زۆر بەڕێزەوە بەخێرهاتنی کردم، مام فەرهاد وتی خێزانم ناوی (گلارە)یە، لەگەڵ خۆیدا کچێکی هێنا، دەستی گرتبوو، هەستم کرد کە کچەکەی نابینایە.

مام فەرهاد: ئەم کچەم نابینایە، ماوەی ساڵێکە وای لێهاتووە چاوی زۆر زەعیف بوو تا وای لێهات هیچ نابینێت ئێستا، ناوی (میلا)یە.

خۆشحاڵی خۆم دەربڕی بەڵام زۆر خەفەتم خوارد بۆ میلا، کچێکی تەمەن ١٦-١٧ ساڵ دەبوو.

مام فەرهاد و خێزانی چوونە دەرەوەی ژوورەکە، گوێم لێبوو خێزانی پەشۆکابوو وتی ئەرێ ئەوە خۆ ماکوان کەریمە.

مام فەرهاد: بەڵێ کێشەی سەیارەکەی هەبوو بۆم چاك کرد.

دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵ میلا، زۆر شیرین و ڕۆح سووك بوو.

ماکوان: لەپۆلی چەندی میلا گیان؟

زۆر بە حورمەتەوە وەڵامی دامەوە، زۆر بە ئەدەب بوو.

ماکوان: تاقانەیت یان خوشك و برای ترت هەیە؟

میلا: برایەکم هەیە ناوی کاکە میلاد-ە.

ماکوان: خوا لێت نەسێنێت، ئەی چاوت نایەشێت، دەمێکە نابینیت؟

میلا: ماوەی ساڵێك دەبێت، دوکتۆرەکانیش نازانن هۆکاری چییە.

ماکوان: لەماڵەوە گوڵە باختان هەیە؟

میلا: گوڵەباخ چییە، من نازانم دایکم ئەزانێت.

بەنەرویجی وتم مەبەستم گوڵی ڕووسە-یە ئەنجا تێگەیشت.

گلارە خانم: بەڵێ کاك ماکوان هەمانە، دەیکەینە ناو چایی.

ماکوان: بێزەحمەت چەند پەڕەی گوڵەباخێکم بۆ بکەرە ناو پەرداخێك ئاو و بۆم بهێنە.

لە کتێبی ئیبن قەیمی جۆزی و ئەبوبەکری ڕازیدا باس کراوە کە گوڵەباخ بکرێتە ناو ئاو و چەند قەترەیەکی بکرێتە چاو، لەگەڵ ڕوقیەی شەرعی بە پشتیوانی خوای گەورە چارەسەرە، هەرچەند ماڵەکە موسوڵمان نەبوون، بەلام من بە ئومێدی هیدایەت دانیان بەو کارە چووە دڵم بۆ ئەو خێزانە.

مام فەرهاد: ئەوە پەرداخە ئاوەکە و گوڵە باخەکەش، من نازانم خۆت چەندت ئەوێت تێکەڵی بکە، بۆچیتە؟

ماکوان: دەرمانی کوردەواری و ئیسلامییە، ئیسلام فێری کردووین لە کتێبە ئیسلامییەکاندا باسکراوە، ئەگەر ئیجازەم بەیت چاوی میلا خانمی پێ تەڕ بکەم، چەند ئایەتێك لە قورئانی بەسەردا دەخوێنم، ئەگەر ڕازی بن، بەڵکو خوای گەورە شیفای بات.

مام فەرهاد: برا تاقی بکەرەوە خۆ زەرەر ناکەین.

ماکوان: دەست نوێژم نییە، ئەکرێت بچم دەستنوێژێك هەڵبگرم.

مام فەرهاد: بەدڵنیاییەوە، فەرموو برا ماڵی خۆتە.

دەستنوێژم هەڵگرت و دوو ڕکعات نوێژم کرد و داوام لە خوای گەورە کرد کە شیفای ئەو کچە بدات و هیدایەتی ئەمماڵەش بدات، میلادیش شاد بکاتەوە بە دایك و باوکی.

سوڕەتی نوور ئایەتی ٣٤و ٣٥م خوێند بەسەر گوڵاوەکەدا.

وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ آيَاتٍ مُّبَيِّنَاتٍ وَمَثَلًا مِّنَ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾

واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە چەندەها ئایەت و فەرمانی ئاشکرا و ڕووغان بۆ دابەزاندوون و هەروەها چەندەها غوونە و سەرگوزەشتەی ئەوانەی پێش خۆتان کە تێپەڕیان کردووە، هاوڕێ لەگەڵ پەند و ئامۆژگاری بۆ خواناس و پارێزکاران.

اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَن يَشَاءُ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾

واتە: خوا نوور و ڕووناکی ئاسمانەکان و زەویە (نوور و ڕووناکی بەخشە پێیان)، غوونەی نوور و ڕووناکیەکەی وەك تاقێك وایە چرایەکی تێدا بێت، چراکەش لەناو شووشەیەکدا بێت شووشەکەش وەك هەسارەیەکی گەش و پرشنگدار وابێت و داگیرسابێت بە ڕۆنی درەختی موبارەك و بەفەڕی زەیتوون، ڕووی نە لە ڕۆژهەڵات و نە لە ڕۆژئاوا بێت (لە شوێنێکدا بێت بەیانی و ئێوارە خۆر لێی بدات)، ڕۆنەکەشی (ئەوەندە پاك و بێگەردە) خەریکە خۆی دابگیرسێت و ڕووناکی بداتەوە، ئەگەر ئاگریش لێی نەدات، ئەو هیدایەت و ڕێنموویی یە کە قورئانە ڕووناکی یە لەسەر ڕووناکی،

خوایش هیدایەتی ئەو كەسانە دەدات كە دەیەوێت و شایستەن بۆ لای نووری خۆی كە قورئانە، خوا چەندەها نموونە دەهێنێتەوە بۆ خەڵكی (تا لە نموونە مەعنەویی یەكان تێبگەن) خوایش بەهەموو شتێك زانایە...

دوای ئەوە وردە وردە ئاوەكەم دەكردە دەستی خۆی بیهێنێت بە چاوەكانیدا، پاشان كەمێك خوێم كردە ئاوەكە و یەكی سێ دڵۆپم كردە هەردوو چاوەكەی.

پاش چا خواردنەوە هەڵسام ماڵئاواییم لێ كردن، بە مام فەرهادم وت كە تۆ دێیتەوە لەگەڵم بۆ غەسلەكەی كاك زرار؟

مام فەرهاد: بەڵێ سەیارەكەم لەوێیە، ئەگەر بمبەیتەوە مەمنون دەبم.

ماكوان: لە خزمەتام با بڕۆین.

داوای لێبوردنم لێ كرد كە ئەگەر ئەو كارە بەدڵی تۆ و خێزانت نەبوبێت، بەڵام خۆم پێنەگیرا بۆ كچەكەت، هەرچەندە ئەستەمە، بەڵام ئومێدی نەبڕاوەم بە خوای خۆم هەیە.

مام فەرهاد: ئەوە تۆ دەڵێی چی كاك ماكوان، ڕاستە پێشتر خۆشم نەدەویستیت و بە قەدەر هەموو دنیا ڕقم لێت بوو، بەڵام ئەمڕۆ كە بەخزمەتت گەیشتم و ئەو كارەت كرد بۆ كچەكەم بەخوا هێندەی براكانم خۆشەویست بوویت لەلام.

ماكوان: خوای گەورە شیفای كچەكەت بدات و براكانیشت بۆ بهێنێت، برای عەزیز خۆ ئەگەر دینیشمان جیاواز بێت خۆ خەڵكی ولاتێكین.

ئەزانی من و جەنابت چەندە شتی موشتەرەک و هاوبەشمان بەیەکەوە هەیە، تۆ بڕوات بە خوا هەیە منیش بڕوام پێیەتی هەر لەوەوە بیگرە تا هەواو خاك و خواردن و زمان و ژیان کە هەموویان بەیەکەوە پەیوەستن، مەگەر وانییە؟

مام فەرهاد: بە دڵنیاییەوە وایە.

کەوای وت خەریك بوو بڵێم ئەی خوا ڕووت ڕەش بکات، ئەی بۆ میلادی کوڕت دەرکرد، بەڵام دانم بە خۆداگرت و هیچم نەوت تەنها وتم ئەوە بۆ من گرنگە مام فەرهادی بەڕێز.

کە گەڕاینەوە بۆ غەسلەکە ئاگام لێبوو بەختیار پەست بوو.

بەختیار: ئەوە لەکوێیت؟

ماکوان: ببوورە لەگەڵ مام فەرهاد ئیشێکم بۆ هاتە پێش، بڕۆ با بڕۆین.

بەختیار: کات درەنگە ڕۆژێکی تر دەڕۆین.

ماکوان: باشە بابڕۆین ئیشم پێتە.

خوا حافیزیمان لە کاك زرار و هاوڕێیانی تر کرد و بەجێمان هێشتن.

بەختیار: ئەوە بۆ وا دڵخۆشی، شتێکی خۆش ڕوویداوە؟

ماکوان: ئەزانی ئەم مام فەرهادە کێ بوو؟

بەختیار: نەوەڵلا نازانم، بەڵام ئەوە دەزانم کە کوردی ئێرانە.

ماکوان: ئەوە باوکی میلاد-ە.

بەختیار: بەڕاست؟ جاخۆ میلاد ئەیوت باوکم زۆر ڕقی لە کاک ماکوانە.

ماکوان: وەڵڵا چوومە ماڵیان و دانیشتین و چاشمان خواردەوە.

بەختیار: سەیرە، جا لەبەر ئەوە دڵخۆشی؟

ماکوان: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە بۆ ئەوە دڵخۆشم، ئەی چەندە گرنگە میلاد و خانەوادەکەی ئاشت بکەینەوە، بەڵکو میلاد ببێتە ڕێنیشاندەری دایکی و باوکی و کەسوکارەکەی، ئەوە بۆ من زۆر زۆر گرنگە و بە وەزیفەی خۆمی دەزانم.

بەختیار: خوای گەورە بە خێر بۆت بنووسێت، ئەی بە میلاد دەڵێیت؟

ماکوان: هەفتەی داهاتوو دەیبینم و بۆی باس دەکەم کە چۆن لەگەڵ باوکی بووم بە هاوڕێ، چوونکە زۆر دەترسا دەیوت نەچی بۆلای باوکم، بۆ زانیاریشت مام فەرهاد زۆر بەهێزە ڕاهێنەری کوشتی باستانی ئێرانە.

بەختیار: میلاد بۆی باسکردووم کە باوکی زۆر بەهێزە، میلاد خۆشی بەهێزە ماشاءاللهی لێبێت، ڕۆژێك لە دووکان بە هەردوو دەستی پێشی سەیارەیەکی بەرز کردەوە.

ماکوان: سوپاس بۆ خوا کەوا بەهێزە.

لەگەڵ بەختیار جیابووینەوە دیسان وەك ڕۆژانی ڕابردوو سەرقاڵی ئیش و کار و ژیانی ئاسایی بووم، ماوەی سێ ڕۆژ بوو چاوەڕێی کازۆڵ یان سەسیلم دەکرد کە یەکێکیان دەرکەون، کەچی دەنگیان نەبوو.

نیوەڕۆیەك لە مزگەوت سەرقاڵی خوێندنەوەی قورئان بووم، میلاد هات سەلامی لێکردم، وتم دەنگوباست دیار نیت؟ هەواڵم زانیوە کە کاری نوێت دۆزیوەتەوە! پیرۆزە.

میلاد: خوای گەورە پاداشتی خێرت باتەوە، نەموویست ئیزعاجت بکەم، زانیم زۆر سەرقاڵیت.

ماکوان: وانییە، هەمیشە خۆشحاڵم کە قسەت لەگەڵ بکەم کاك میلادی بەڕێز، دەنگوباسی وەرزشەکەت؟ هەست دەکەم کەمێك کێشت دابەزیووە؟

میلاد: لە ماوەی ئەم مانگەدا پێنج کیلۆ کەمم کردووە، نامەوێت بەخێرایی کێش کەم بکەم تا جەستەم لاواز نەبێت و ئەنەرژی (Energy) لەدەست نەیەم، بەڵام بێخەمبە زۆر بەهێزەوە ڕاهێنان دەکەم.

ماکوان: کە لە نوێژ تەواو بوویت، پارەی مانگی داهاتووت ئەیەمێ، خۆم هەر ویستم پەیوەندیت پێوە بکەم، بەڵام وتم کۆتایی هەفتە بێت، بەڵام یەکترمان دیوە، با کارەکە نەبێت بە دووجار.

میلاد: کاک ماکوان گیان پێویست ناکات، ئێستا کار دەکەم پارەم هەیە، سوپاس بۆ خوا.

ماکوان: پارەی کاری خۆت بۆ خۆت، ئەم کارە بۆ ڕزگارکردنە، پێویستە لە هیچت کەم نەبێت، تا مێشکت سەرقاڵ نەبێت بە پارە و توانای وەرزشت نەمێنێت. ئەوە گومانی تێدا نییە هەموو مانگێک هەرچی پێداویستی وەرزش و ڕاهێنانەکەتە دەگرمە ئەستۆ پێویست ناکات

ئەوەندە بیڵێینەوە.

میلاد: باشە کاک ماکوان من ١٠ هەزار کرۆنم بەسە، خۆ ئەوەش نەبووایە من هەر وەرزشم دەکرد، خۆم حەزی پێ دەکەم.

ماکوان: شتی وا نابێت، هەردەبێت ٣٠ هەزارەکە وەربگریت تا شەش مانگ، ئەگەر زانیمان لە تواناماندا نییە، دەیکەین بە ٢٠ هەزار پارەی خۆشت کۆبکەرەوە تۆ دوو ڕۆژی تر دەبێت ژن بهێنیت و ماڵ دروست بکەیت.

میلاد: باشە کاک ماکوان گیان تۆچی دەفەرمویت با ئەوە بێت، بەڵام من بۆ شتێکی تر هاتم بۆ خزمەتی بەڕێزت نازانم چی بڵێم و چۆن سوپاست بکەم، مەگەر تەنها خوای گەورە پاداشتت باتەوە.

ماکوان: چی بووە میلاد گیان؟

میلاد: دوو ڕۆژ پێش ئێستا دایکم تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی کاک ماکوان کەریم لێرە بووە.

ماکوان: ڕاست دەکات چووم باوکت سەیارەکەی بۆ فەحس کردم بیرم چوو پێت بڵێم، زۆر پیاوێکی موحتەرەمە، بەڵام زۆر ڕقی لە منە.

میلاد: وەڵڵاهی کاک ماکوان گیان باسیان کرد کە ڕۆشتوویت بۆ ئەوێ، نازانم چی ڕوویداوە، بەڵام بەخوا ئێستا باوکم تۆی زیاتر لە من خۆشتر دەوێت.

ماکوان بە پێکەنینەوە: ئاخر نە تۆی خۆش دەوێت و نەمنیش، چۆن شتی وا دەبێت.

میلاد: خوشکە بچوکەکەم میلا، کە قورئانت بۆ خوێندووە و ئەو گوڵاوەت کردووە بە چاویا لە دوای ئەوەی کە تۆ ڕۆشتوویت بە دایکمی وتووە لەو کاتەوەی کە کاك ماکوان قورئانی بۆ خوێندووم، چاوم بینیویەتی و کاك ماکوانم بینیوە بۆ ماوەی چەند خولەکێك چاك بۆتەوە، دوای ئەوە وەکو خۆی لێهاتۆتەوە.

ماکوان: بەڕاستە؟ یان لە خۆتەوە قسە دەکەیت.

لەخۆشیا نەمدەزانی چی بکەم...

میلاد: وەڵڵاهی بۆ ئەوە هاتووم، باوکم داوای کرد بچین بۆلای بەڵکو میلای خوشکم چاکبێتەوە، وەڵڵاهی باوکم ئەیوت بەبێ ماکوان نەیەیتەوە بۆماڵەوە.

ماکوان: یەعنی بەینتان باش بوو لەگەڵ باوکت؟

میلاد: وەکو عەرزم کردیت دوو ڕۆژ پێش ئێستا دایکم تەلەفۆنی بۆ کردم، من پێشتر دایکم و خوشکەکەم لە بازاڕ دەبینی، وتم بەخوا نایەمەوە تاقەتی باوکمم نییە دەست بکات بە قسەی ناشیرین کردن، دایکم وتی تۆ وەرەوە من دڵنیات دەکەمەوە کە باوکت هیچ ناڵێت، منیش لەبەر قسەی دایکم چوومەوە، کاتژمێر ٦ی ئێوارە بوو باوکم وتی: ڕۆلە خەڵک ئاوا ڕێزی باوکی ئەگرێت، ئیسلام وا دەڵێت؟ دەڵێت باوکت و دایکت بەجێ بهێڵە؟

منیش وتم بەخوا باوکە ئەگەر تۆ منت دەرنەکردایە من هەرگیز نەدەڕۆشتم.

ئاگام لێی بوو زۆر دڵ نەرم بوو، وتی دەی با منیش تورەبم خۆ دنیا خراپ نابێت، ئیتر زانیم پەشیمانە چووم دەستم ماچ کرد، زۆر دڵخۆش بوون زۆر

سوپاسی جەنابتی کرد، منێش نەموێرا هیچ بڵێم کە تۆ دەناسم، وتم نەوەك قسەم لێ دەربهێنێت، ئیتر باسی میلای خوشکمی کرد، میلاش خۆی بۆی باس کردم کە چی ڕوویداوە، جا ئێستا بۆیە هاتم باوکم میلای زۆر خۆش دەوێت، زیاتر لە ٢٠٠ هەزار کرۆنی تا ئێستا بۆ خەرج کردووە هیچ چارەسەرێکی نەبووە، ئیتر دوێنێ زۆر بەزەیم بە باوکما دەهاتەوە، دوێنێ شەو باوکم و دایکم باسی تۆیان دەکرد منیش هەموو ئەوەی لە نێوانماندا ڕوویدابوو بۆم باس کردن.

ماکوان: کەواتە ئێستا کێشەت نەماوە لەگەڵیان سوپاس بۆ خوا، ئەی کە نوێژت کرد باوکت هیچی نەوت؟

میلاد: نا کاک ماکوان نەیبینیم هەر چوومە ژوورەکەی خۆم، بەڵام کە نوێژمان کرد لەگەڵم وەرە بۆماڵەوە، بە باوکم وت کاك ماکوان قسەی من ناشکێنێت.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە، قسەت ناشکێنم و لەخزمەتاندام، با نوێژ بکەین بەیەکەوە دەڕۆین، ئەمڕۆ ئیشم نەبوو هەر بەدوای شتێك دەگەڕام سەرقاڵ بم پێوەی ئەوە بۆم دروست بوو، لە خزمەتی جەنابتدا دەبم.

نوێژمان کرد و لەدوکانی پاکستانییەکان هەندێك شیرینیم کڕی، لەناو ئێرانییەکاندا بەتایبەت کوردی ڕۆژهەڵات کە دەچن بۆماڵی یەکتری شیرینی دەبەن، منیش ئەو نەریتەم زۆر پێ جوانە، چووین سڵاومان کرد بەو پەڕی ڕێزەوە مام فەرهاد پێشووازی لێ کردین.

مام فەرهاد: پێش هەموو شتێك من داوای گەردن ئازادیت لێ دەکەم بەداخەوە، کاتێك میلادی کوڕم لەگەڵ من عاجز بوو، تۆ بەڕاستی هەڵسایت بەکاری من، لە بیرم ناچێتەوە کە پارەکەت داوەتێ و پاشان

جێگای نیشتەجێ بوونت بۆ پەیدا کردووە، جا کاکە ماکوان من ئەو کارەت زۆر بەرز دەنرخێنم.

ماکوان: قوربان ئەوە وەزیفەمە، من جەنابتم نەناسیوە و کاکە میلادیشم هەر نەناسیبوو، بەڵام خۆی هەر زوو وەکو دەمکەلی هەتاو زوو دەرکەوت کە چەندە بەئەدەب و مولتەزیم و خاوەن ڕێزە، من هیچم نەکردووە بەڵکو ڕێزی خۆی بووە کاکە میلاد، چەندەها باوك ئاواتە خوازە کە کوڕەکانی وەکو میلاد بەئەدەب و خاوەن حورمەت و دەستپاك و دەم پاك و ڕاستگۆ بن و بێ فرت و فێڵ بن وەکو میلاد، جا ئیمە پێویستە سوپاسی جەنابت بکەین کە کوڕێکی ئاوا بە ئەخلاق و بە ڕەوشتت پەروەردە کردووە و پێشکەشی کۆمەڵگات کردووە.

هەستم کرد مام فەرهاد زۆر حەزی بە قسەکانم دەکرد و خۆشحاڵ بوو، ئینجا بزمارم داکوتی بە تابوتەکەدا و وتم: مام فەرهاد ئەو ئازادییەی کە بڕوات پێیەتی ئەو کورەتی ئاوا پەروەردە کردووە، ئەویش ڕاسترین ڕێگای هەڵبژاردووە، ئەمەوێت پێت بڵێم هەر خۆت ڕووت بێت بڵێی کوڕم هەیە.

مام فەرهاد: زۆر سوپاس کاک ماکوان نان ئامادەیە، دڵنیابە گۆشتم لە سوید کڕیوە حەڵاڵە، میلاد دەزانێت، ئێمە هەر گۆشتی حەڵاڵ دەکڕین، جا دوودڵ مەبە لە خواردنەکەمان.

ماکوان: ئەزانم مام فەرهاد گیان، جارێ پێم بڵێ گلارە خانم چی دروست کردووە، من و میلاد زۆرمان برسییە.

مام فەرهاد: وەڵڵاهی نازانم تۆ حەزی لێ ئەکەیت یان نا، بەڵام سەوزی خۆرشتی لێناوە، خواردنێکی ئێرانییە.

ماکوان: ئەوە بەڕاستە، من زۆری حەز لێ دەکەم، تۆ دەزانیت من زاواتانم، خێزانم کوردی ڕۆژهەڵاتە، جا ئەگەر نانی هەورامی لەگەڵ بێت ئیتر ئەوە تەواوە.

گلارە خانم: وەڵڵاهی بەداخەوە نەمانماوە، چەند ڕۆژە هەر دەڵێم نان دەکەم ڕێکنەکەوتووە، وەڵڵاهی بەداخەوە، بەڵام نانی تیریمان هەیە.

ماکوان: ئاساییە گوێی مەیەرێ، نانی تیری عەیبی نییە، ئەی کوا میلا؟

مام فەرهاد: میلا گیان کچم وەرە نانەکەت بخۆ، مامە ماکوان بانگت دەکات.

میلا هات من چووم بۆ لای وتم وەرە تۆ لای خاڵی خۆت دابنیشە، قاپەکەی خۆم خستە بەردەستی و وتم میلا خان من ئەمڕۆ خزمەتت دەکەم گوڵە جوانەکەی خاڵی.

زۆر خۆشحاڵ بوو سوپاسی کردم.

مام فەرهاد: کاك ماکوان ماڵی خۆتە شەرم مەکە.

ماکوان: باوکم خوای گەورە لێی خۆش بێت، هەموو جارێك دەیفەرموو چوویتە هەر ماڵێك بانگیان کردیت بۆ نان خواردن زۆر بخۆ، خواردنەکەیان بۆ تۆ دروست کردووە ئەگەر پێیان خۆش بوو ئەوا کە زۆرت خوارد خۆشحاڵ دەبن، خۆ ئەگەر پێیان ناخۆش بوو هەر زۆر بخۆ بۆ ئەوەی دڵیان شەق بەرێت!.

مام فەرهاد بە پێکەنینەوە: هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی باوکت بێت کە تۆی خستۆتەوە، ئەویش هەر خۆی ڕووی بێت بڵێت خاوەنی ماکوانم. بەڕاستی پیاوێك لێرەیە پێشمەرگەی ناوچەی ئێوەیە باسی باوکتی بۆ کردم.

وتی کە باوکی ماکوان پیاوێکی زیرەك و سیاسییەکی زۆر بەناوبانگی ناوچەی پێنجوێن بووە، باسی ئازایەتی و ئەوەشی کرد کە پەیوەندی کۆمەڵایەتی زۆر بەهێز بووە و خۆشەویستی ناو خەڵک بووە.

ماکوان: ماڵی تۆش و ئەویش ئاوابێت.

سەرقاڵ بووین بە نانخواردنەوە، کە تەواو بووین میلام بانگ کرد وتم گوڵە جوانەکەی خاڵی خۆت پێم بڵێ کە قورئانەکەم خوێند گولاوەکەم کرد بە دەستا و خۆت کردتە چاوت چی ڕوویدا بە دوور و درێژی بۆم باس بکە.

میلا: کاك ماکوان تۆزێك هەستم بە ئارامی کرد، پاشان تۆزێك هەستم کرد سەرم قورس بوو، ئیتر چاوم کرایەوە جەنابتم بینی و چاوم داخرایەوە، پاشان جارێکی تر جەنابتم بینییەوە، بەڵام وەکو یەکەم جار نەبوو زۆر تەڵخ بوو چاوم، ئیتر هیچ ڕووی نەداوە.

چاوم هەر تاریکە.

ماکوان: من چیم لەبەرا بوو میلا گیان؟

میلا: کراسێکی شین و پانتۆڵێکی جینس، سەعاتەکەی دەستت قایشەکەی قاوەیی بوو، موستیلەیەکت لەدەستا بوو، ناوەکەی قاوەیی بوو لە ڕەنگی سەعاتەکەت و قایشەکەی وایە؟

ماکوان: زۆر ڕاستە، باجارێکی تر دووبارەی بکەینەوە، میلاد لەباخەکەتاندا گوڵە باخی تیا نییە؟

میلاد: بەرێوەڵڵا زۆرمان هەیە بچم بیهێنم.

ماکوان: ئەتوانی بە سەیارەکەی من بڕۆیت بۆ نزیك ترین دەریا لێتانەوە دەبەیەك ئاوی سوێری دەریام بۆ بهێنیت، تا تۆ دێیتەوە من و باوکت گوڵەکە دەچنین.

میلادم نارد ئاوی دەریا بهێنێت، ترسام کە خوێ بکەمە ئاوەکە ئازاری چاوی بدات، بەلام ئەبوبەکری ڕازی دەڵێت: باشترین ئاو بۆ پاك کردنەوەی چاو ئاوی دەریایە، چوین گوڵە باخێکی زۆرم لێکردەوە، چوونکە زانیم ئەمە ئیشی یەکجار و دووجار نییە، تەلەفۆنم کرد بۆ خێزانم چوونکە ئەو لەمن شارەزاترە و بەشێکی دەرمانسازی خوێندووە، هەندێك زانیاری باشی دامێ و پاشان داوام لێ کرد کە سەیرێکی کتێبی (الطب النبوي) ئیبن قەیم بکات چیتر لەوبارەیەوە باس دەکات، ئەوەی کە زیاتر دەستمان کەوت کلی چاو بوو کە چاو زۆر ئیسراحەتی پێ دەکات، کرتنی خەنەیە لە سەر کە چاو و مێشک و سەر ئیسراحەتی پێ دەکات، هەروەها کەمی ڤیتامین ئەی و خواردنی خەفەت و گریانی زۆر هۆکاری نابینایی و بیناییش لای خوای پەروەردگارە.

میلاد گەڕایەوە، ئاوەکەم کردە ناو تەشتێك و گوڵەکانم تیا خوساند نزیکەی نیو کاتژمێر سورەتی نوورم بەسەردا خوێند، بەمیلادم وت کە بچێت دەستنوێژ بشووات و دەموچاوی خوشکەکەی پێ بشووات و قورئان بخوێنێت بەسەریا.

چوونکە زانایان دەفەرموون باشترین ڕوقیەی شەرعی ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی بۆ خۆی بخوێنێت یان کەسی نزیکی بێت، تۆش خوشکتە هەوڵ بدە بە ئیخلاسەوە بیخوێنە، کە ئاوەکەمان بەکارهێنا زوو زوو دەموت میلا گیان هیچ دەبینیت؟

میلا: نا هەر وەکو خۆمم.

زۆر سترێس بووم کەسێکم دەناسی لە تورکیا خەریکی دەرمانی گیایی بوو، تەلەفۆنم بۆ کرد ناوی محمد ئەرکان بوو، کوڕێکی ئیمانداری خەڵکی تورکیا بوو، لە ئەڵمانیا یەکترمان ناسی، بە ڤایبەر تەلەفۆنمان بۆ کرد حاڵەتەکەم بۆ باسکرد بە عەرەبی، چوونکە خەریجی زانکۆی ئەزهەر بوو، باوکی لە شێخانی ناوچەی باتووم بوو لە نەقشبەندییەکان بوون، وتی دەبێت لەو حاڵەتەدا چاوی بە کل بڕێژن و دوای بیشۆن و پەڕۆیەك بە چاویەوە ببەستن، گوڵاوەکەی با هەمیشەیی پێوەی بێت دوای ٢١ جار بۆ ٢١ ڕۆژ بەردەوام بن لەسەری، لەگەل سوڕەتی نوور لەگەڵ سوڕەتی الأنبياء بەسەر ئاوەکەدا بخوێنن، بەڵکو خوای گەورە شیفای بدات، ئەگەر ئەوە چارەی نەبوو هەڵمی قاوە بابچێت بە چاویدا بەڵام ئاگادار بن چاوی نەسووتێت دەبێت زۆر زۆر وریا بن.

لەم قسانەدا بوون میلا بە میلادی وت کاکە چاوم یاری دەکات، وتی ئەتانبینم بە تەڵخی و دادەخرێت، خێرا ئەوەم بە محمد ئەرکان وت، وتی وازی لێ بهێنن با ئیسراحەت بکات، بەڵام با لە ژوورێکی تاریك دابنیشێت، یان چاوی ببەستێت تا ٢١ ڕۆژ ئەو کارەی بۆ دووبارە بکەنەوە، هەستم کرد کلی چاوەکەیان ئەسڵ نییە، لە مزگەوت مەغریبییەکان بەکاریان دەهێنا، بە میلادم وت وەرە بڕۆین بۆ لای سۆماڵییەکان یان مەغرببیەکان

ئەوان زۆر بەکاری دەهێنن، بەڵکو زیاترمان دەست بکەوێت و باشتربێت لەم کلەی کە ئێوە هەتانە.

ئاگام لە باوکی میلاد بوو زۆر خۆشحاڵ بوو، وتی با منیش بێم لەگەڵتاندا، هەموو بەرەو مزگەوت ڕۆشتین تا لەوێ کل بەدەست بخەین.

## گەڕانەوەی حەزقیل بۆ گۆرەپانی ڕووداوەکان

زۆرجار مرۆڤەکان بە ئاشکرا هەست بە یارمەتی خوای پەروەردگار دەکەن، هەست دەکات لە پشتی کارەکانەوەیە بەبێ ویستی تۆ دەسووڕێت و ئامانجێك لەپشتیەوەیەتی، زۆرجار ڕووداوەکان ڕووئەیەن بەبێ ویست و ئاگاداری تۆ هەر بۆ ئامانجێکە، نەمدەزانی ئەو ئامانجە هەمووی قەدەری خوای گەورەیە، ئاخر شتێکی ئاسایی نییە ئافرەتێك لەوپەڕی تاوان و بێڕەوشتی، ئێستا تەنانەت ڕووی نایەت تەلەفۆنیش بکات و قسەم لەگەڵ بکات، هەرچی هەیە دەیبەخشێت بۆ ئەوەی تاوانەکان پاك بکاتەوە، ئەمە بەئاشکرا دەستی خوای پەروەردگاری لە پشتە، پێم دەڵێن هەرگیز بە چاوی بەتاوان و کاری ڕابردوو تەماشای خەڵکی مەکە، بەو چاوە تەماشای بکە کە لەواقیعەکەدا دەژی.

چۆن سوجدە بۆ خوا نەبەم لە کاتێکدا باوکی میلاد لەسەر ئیسلامەتی کوڕەکەی کە پارچەیەکە لە جەرگی دەیکاتە دەرەوە، بەڵام ئێستا خۆی شووێنی کوڕەکەی دەکەوێت بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی چارەسەرێك بۆ کچەکەی بەدەست بهێنێت، کچێك تەمەنی ١٦-١٧ ساڵ کوێر دەبێت، لەوانەیە هەزارەها جار وتبێتی کە چەندە نادادپەروەری هەیە لەم ژیانەدا کە چاوەکانی لێ سەندۆتەوە، بەڵام نابینابوونی ئەم کچە دەبێتە هۆکارێك بۆ چوونە بەهەشت و گەڕانەوەی دایك و باوکی و لەگەڵ خۆی دەیانبات بۆ ژیانێکی باشتر، ئەمەش ناوی قەزا و قەدەری خوای باڵادەستە.

لەکاتێکدا لە جێگایەك دادەنیشیت بۆ تێرکردنی سکت، یاخود بۆ چا خواردنەوە یان قاوەیەك، یان شەربەت و ساردییەك دەخۆیتەوە، ئاشنات

دەکات بە مرۆڤێك، ئەو مرۆڤە کێشەی مرۆڤێکی تری پێ چارەسەر دەکەیت. تۆش خۆت بەشێکی لە چارەسەر، بەڵام هۆکاری ناسین و تەعاروفت دەبێتە هۆی ڕزگارکردنی خەڵکانی زۆر. بۆت گرنگ نییە کە ئەو کەسە ژنە یان پیاوە، گەنجە یان پیرە، چوونکە خوای مەعبودمان دەفەرمووێت:

یَا أَیُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاکُم مِّن ذَکَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاکُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَکْرَمَکُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاکُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِیمٌ خَبِیرٌ ﴿١٣﴾ الحجرات

واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە هەمووتانمان لە نێرومێیەك دروست کردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە)، وە کردوومانن بە گەلان و تیرە و هۆزانی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە..بەڕاستیی بەڕێزترینتان لای خوا ئەوەتانە کە زۆرتر لە خواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بە هەمووان.

کەواتە وا ئەزانیت بەتەنها کاربکەیت و ئیشت دەڕوات، بڕوا بکەن ژیان وەکو ماڵێك وایە پێویستی بەهەموو جۆرە کەلوپەلێکە بۆ ناوماڵەکەت.

لەم ژیانەدا مرۆڤەکان کەلوپەلی ئەم ژینەن تا کارەکانمان بڕوات، ئەو جۆرەی کەلوپەلانە لە مرۆڤەکاندا دەردەکەوێت، مرۆڤ هەیە وەکو تەنکی ئاو وایە پارێزەری پاکوخاوێنییە، هەیە وەکو تەلەفزیۆن وایە تەنها ئەهلی قسەیە و هیچی لەبارا نییە، مرۆڤیش هەیە جێگای حەسانەوەی خەڵکی ترە ئارامت ئەیاتێ وەکو کورسی و قەنەفە وایە، مرۆڤیش هەیە وەکو بەتانی و لێفەیە داپۆشەری عەیب و عاری مرۆڤەکانە، هەیە وەکو ئاوێنە وایە خاڵی دەموچاوت یان گەورە نیشان دەدات یان هەیە بچووکی دەکاتەوە هەیشە وەکو خۆی نیشانت ئەیات، مرۆڤ هەیە وەکو فلچەی تەوالێت وایە پێویستە هەبێت بۆ پاککردنەوەی پیسی...هتد.

لە ئەنجامی ئەم چەند دێرەی خوێندتەوە ئەمەوێت ئەوەت پێبڵێم کە پێویستە هەموو جۆرێك لە مرۆڤەکان بناسیت، بەڵام مەرج نییە هاوڕێیەتی بکەیت، تەنها بزانە زۆرجار مرۆڤ کە دەناسیت تەنها نمەی بارانە، بەڵام ئەگەر هاتوو هاوڕێیەتیت کرد زۆرجار هاوڕێیەتییەکەی دەبێتە لێزمەی باران و قوڕ و چڵپاو دروست دەکات، وەکو مێش وایە لە کونێکی بچووکەوە دێتە ژوورەوە دوایی هەرچی دەرگا و پەنجەرە هەیە واڵای دەکەیت دەرناچێت.

ئێوە هەوڵ بدەن نمەی باران بن، بۆنی زەوی خۆش بکەن. هەوڵ بدەن شەونم-ی بەیانیانی گوڵ بن بۆ ئەوەی لە نیوەڕۆدا فێنکایی و شکاندنی تینوێتی گوڵ بن، لە ئازار و خەم و خەفەت مەترسە، چوونکە نزیکت دەکاتەوە لەخوای پەروەردگار. لە عیشق مەترسە چوونکە دڵ نەرم دەکات و فێری گریانت دەکات، هەمیش با ئامانجێکت هەبێت، تا ئەو ئامانجە هیوات بۆ دروست بکات، لەسەر پەتی سێدارە هیوا بڕا و مەبە، لەوانەیە قەدەرت بگۆڕێت بۆ ژیان، وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت:

قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلاَّ الضَّالُّونَ ﴿٥٦﴾ الحجر

واتە: ئیبراهیم وتی: ئایا کێ نائومێد دەبێت لە ڕەحمەت و بەخششەکانی پەروەردگاری، مەگەر کەسانێك کە گومڕاو سەرگەردانن.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت:

يَا بَنِيَّ اذْهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلاَ تَيْأَسُواْ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ ﴿٨٧﴾ يوسف

واتە: (دوای چەند ڕۆژێك یەعقوب فەرمانی دا بەکوڕەکانی و وتی:) کوڕەکانم بچنەوە و گوێ هەڵخەن بۆ یوسف و براکەی، لە سۆز و میهرەبانی خواش نائومێد مەبن، چوونکە بەڕاستی کەس نائومێد نابێ لە سۆز و میهرەبانی خوا جگە لەکەسانی خوانەناس و بێ باوەڕ.

خوێنەری بەڕێز نامەوێت بە قسەی باق و بریق سەرقاڵت بکەم، بەڵام دەمەوێت لەوە تێبگەیت مەملەکەتی شەیتان شەڕی من و تۆیە لەگەڵ شەیتانەکانی جنۆکە و مرۆڤ. بەزمانێکی زۆر سادە دەدوێم و باسەکانتان بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام ناوەرۆك ئاسان نییە، ناوەرۆك پڕ پڕە لە وشەی نهێنی. وشە دیارەکان خۆت دەیخوێنیتەوە، بەڵام گرنگە وشە جەوهەرییەکان بە دڵ بخوێنیتەوە، لەوە تێبگە کە چەندە ئازارم چەشتووە، لەوە تێبگە کە چەندە خەمم خواردووە، چەندە ئاخ و ئۆفم هەڵکێشاوە، لەوە تێبگە کە چەندە دووریم چەشتووە، ئەزانم لەوانەیە بڵێیت ئەوە کێشەی خۆتە و کێشەی من نییە، منیش دەڵێم تۆ ڕاست دەکەیت، بەڵام گرنگە ئەو فرمێسکانەی من هەڵموەراندوون تووشی تۆ نەبێت، ئەو ئاهوناسۆرەی من چەشتوومە تۆ تووش نەبیت، ئەو سوێیەی بە دلی مندا هاتووە بەدڵی تۆدا نەیەت، منیش دەمەوێت تۆ کێشە و موشکیلە نەبیت.

پشوویەك بوو، ویستم دەردە دڵێك بکەم لەم نیوە شەوەدا و لە کونجی زیندان‌دا چیرۆکی مرۆڤ و شەیتانتان بۆ دەگێڕمەوە، ئای چ شەوێکی پڕ خەفەتە ئەگەر دەکرا مانگم ڕادەسپارد بێتە لات و چیرۆکی تەنهایی من لە زیندان بۆ تۆ باس بکات!، خۆ ئەگەر مام و نەمردم خۆم بۆت باس دەکەم بە پشتیوانی خوا.

کەواتە بە پشتیوانی خوا گەڕاینەوە بۆناو باس و مەملەکەتی حەقیقەتی شەیتان لەگەڵ مام فەرهاد و میلاد چووینە مزگەوت بۆ یەکەم جار مام

فەرهاد هاتە مزگەوت، لەوێ لە مەغریبی، جەزائیری، پاکستانی، سۆماڵییەکانمان پرسی کەوا کلی ئەسڵیمان دەوێت، ناونیشانیان داینێ و چووین بۆ دوکانەکە کڕیمان، بە میلادم وت ڕۆژانە ئەو کارە ئەنجام بدەن کە ئەمڕۆ ئەنجامممان دا.

میلاد: ئاخر من نازانم قورئان بخوێنم، هەر ئەو چەند سوڕەتەم لەبەرە کە بۆ نوێژ دەیانخوێنم.

ماکوان: بزانە ئەو ئاوە بەشی چەند ڕۆژی دەکات، کە تەواو بوو دێم بەسەریدا دەخوێنم، بەڵکو خوای گەورە شیفای بات.

مام فەرهاد: تکا دەکەم کاك ماکوان هاوکاریمان بکە.

ماکوان: مام فەرهاد گیان میلا خوشکەزامە، میلاد برامە و تۆش نووری چاومی تکایە ئەو قسەیە مەکە، ئەوە وەزیفەمە و من لە خزمەتاندام.

مام فەرهاد: ئەوەت لێ ڕادەبینم، میلاد گیان با چیتر عەزیەتی کاک ماکوان نەیەین خۆمان دەچینەوە بۆ ماڵەوە.

ماکوان: ئەوەم پێ ناخۆشە، من و تۆ بەیەکەوە لە جیگایەك بووین، ئاخر چۆن بەجێتان دەهێڵم هەمووی ١٠ خولەکە، فەرموون با بڕۆین. لەناو سەیارەکەم لەسەر قورئان بوو لامبرد، لەبەر ئەوەی قسەمان دەکرد.

مام فەرهاد: برا لای مەبە، وەڵڵا قورئان زۆر ئارامم دەکاتەوە، خۆ منیش بڕوام بە حەزرەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) هەیە، تۆ دەزانی ئێمە بڕواشمان بە ئیمامی عەلی هەیە و زۆرمان خۆش دەوێت؟

ماکوان: ئەی کەریم خانی زەند، کەسێکی چۆن بووە مام فەرهاد؟

مام فەرهاد: کاک ماکوان ئێمە پێمان وایە ئەو کەسەی کە دەسەڵات دەگرێتە دەست بەشێك لە خوایەتی پێ دەدرێت، ئەزانم ئەڵێی چی؟

ماکوان: کەواتە مەنەئی ڕابەری ئێران بە خوا دەزانیت؟ ئی تۆ کافری بە دوو دیودا.

دیوی یەکەم ئەگەر خوایە تۆ دژی وەستاوی، خۆ ئەگەر ڕێزت گرت جاش و پیاوی ئێرانی، پێم بڵێ کامیان ڕاستە؟

مام فەرهاد: بەخوا من زۆر شارەزا نیم، بەڵام پیاوە گەورەکان و شێخ و پیرەکانمان وا دەڵێن.

ماکوان: ئەی ئیمامی (عەلی) ت چۆن خۆش دەوێت، لەگەڵ حەزرەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لەکاتیکدا تۆ یەرسانیت؟

مام فەرهاد: بە خوا ئەوەش نازانم.

ماکوان: تۆ بڕوات بە ئایینی یەرسانی هەیە، چەند کتێبت لەسەر خوێندۆتەوە؟

کتێبی یەرسانی بە ناوی (سەرەنجام) کتێبی ڕەش-ت خوێندۆتەوە؟

مام فەرهاد: هەر نەمدیووە لە ژیانمدا.

ماکوان: دەی تۆ کەی یەرسانیت؟ تۆ هەر نازانیت دینەکەت چییە.

کاتێك گەیشتین وتم دێم ماڵئاوایی لە خاتوو گلارە و دادە میلای گوڵ دەکەم، بەڵام ئەمانەتی تۆ و میلاد، چوونکە زۆر ئیشم پێیەتی لەم ڕۆژانەدا دێمەوە خزمەتت و زیاتر قسە دەکەین. ماڵئاوایم لە هەردووکیان کرد، زۆر

دڵی میلام خۆشکرد، پێم وت خەفەت مەخۆ بە پشتیوانی خوا چاك دەبیتەوە، چپاندم بە گوێی میلاد دا پێم وت، باسی ئیسلامی بۆ بکە و فێری بکە.

میلاد: بەینی خۆمان بێت موسوڵمانم کردووە.

دوای ئەوەی ماڵئاواییم لێ کردن زۆر دڵخۆش بووم بە قسەکەی میلاد، کە وتی میلام موسوڵمان کردووە، بیرم لەوە کردەوە مادام ئیمان لە دڵیا چەکەرەی کردووە، بۆیە خوای پەروەردگار وردە وردە بینایی بۆ دەگێڕێتەوە.

خولیا و ئارەزوومەندی کازۆل بووم، کۆنگرەی جنۆکەکانم لەدەست چوو، زۆر بێزار بووم لەوەی کە سێ مانگەکە تەواو بووە و کەچی هیچکام لە جنۆکە موسوڵمانەکان دیار نەبوون، لە دڵێ خۆمدا دەموت بەخوا ئەوانیش تاقەتیان لێم چووە، ڕۆژێك لە کار دەگەڕامەوە چوومە فرۆشگایەك هەندێك خواردن و پێداویستیم کڕی، سەیر دەکەم کە وەرماش لەبەشی چوونە ژوورەوەی فرۆشگاکە وەستاوە و چاودێری من دەکات، منیش کە نزیك بوومەوە لێی پێم وت کام لە داواکانمت جیبەجێ کردووە؟

وەرماش: داواکانت داواکاری نابەجێن.

ماکوان: کە نابەجێن بۆچی دەرکەوتویت و هاتوویت بۆ ئێرە، زۆرم خۆش دەوێیت؟ وەکو وتم ملت بشکێنە و بڕۆ.

وەرماش: وا قسە مەکە لەسەرت زۆر دەکەوێت، تۆ دەزانی من زۆر خاترت دەگرم.

ماکوان: کوره دەبڕۆ شەیتانی مەلعون، ئایەتەلکورسیم خوێند، (سبحان الله) دەموچاوی گۆڕا زۆر ناشیرین بوو، بەڵام نەڕۆشت و لەگەڵمدا مایەوە، یەکی سێ جار سورەتی (الإخلاص، الفلق و الناس)م خوێند، هەستم کرد زۆر لاوازە و پێستی وشك بووە و ئێسقانەکانی خەریکە تێك بشکێن و بەتەواوەتی ڕەنگی گۆڕا و سیحری نەما، هەموو دەمی کونێکی گەورە بوو، سێ جار سورەتی (الزلزال)م خوێند، سوپاس بۆخوا ملی شکاند و لەبەر چاوم نەما، دواى دیارنەمانیشی بەردەوام بووم لە قورئان خوێندن و زیکر و بەردەوام دەموت: (لا إلَه إلَّا اللهُ وحدَه لا شَريكَ له، له المُلكُ وله الحمدُ يُحيِي ويُميتُ وهو على كلِّ شيءٍ قدير).

بەدەم زیکر کردنەوە پێداویستییەکانم هەڵگرت و کڕیم بەرەو ماڵەوە بەڕێ کەوتم، لە دڵی خۆمدا وتم، حەزت دەکرد جنۆکەکان ببینیت، ئەوە بینیت، بەڵام یەکەمجار بوو بەو شێوە ناشیرینە وەرماش ببینم، زۆر ترسناك و پیس دیار بوو، سوپاس بۆ خوا زانیم کە هیچی پێ ناکرێت زۆر گوێم پێ نەدا و چوومە ماڵەوە، پشووم دا دوای نانخواردن هاتمەوە دەرەوە لە نێوان نوێژی عەسر و مەغریب بوو، بەرەو مزگەوت کەوتمە ڕێ، لەڕێگا حەزقیل-م بینی.

وتم: حەزەی برام یان نایەن یان کە دێن هەموو بەیەکەوە دێن، بەڵام خۆشحاڵم کە تۆ هاتوویت، ئەی ناترسیت لەو شتە پیسە کەناوی وەرماش-ە.

حەزقیل: سڵاوت لێبێت بە سڵاوی ئیسلام (السلام عليكم ورحمة الله و بركات)، وەکو هەموو جارێك خۆی دەڵێیت، نەوەڵڵا ئەمڕۆ لەو فرۆشگایە زۆر لاوازت کرد، ترسی نەماوە، دەسەڵات و توانای کۆتایی هات بەسەر ئێمەدا.

ماكوان: وعليكم السلام حەزەی برام، خۆشحاڵم بە شەوق و زەوقی، بەڵام نەمتوانی بێم بۆ كۆنگرەكە، كازۆڵ نەهات بە شووێنمدا، بەڵام تاڕادەیەك زانیم بەهۆكاری (تەڕەماش) وەرماش بوو.

حەزقیل: وەڵڵا جیگات خاڵی بوو هەموو باسیان دەكردیت، بەڵام زۆر قەرەباڵغ و خۆش بوو، خەڵك زۆر هاتبوون.

ماكوان: بەڕاست؟ تۆزێكم بۆ باس بكە.

حەزقیل: بەڕێگاوە نابێت، ئێستا خەڵك دەڵێن ئەم پیاوە شێت بووە لە خۆیەوە قسە دەكات، بڕۆ بچینە جێگایەك دابنیشین.

چووینە پاركێك و حەزقیل دەستی كرد بە قسە كردن.

وتی كەوا زۆرێك لە سەرۆك و سەرۆك عەشیرەتەكانی جنۆكە هاتبوون.

ماكوان: ئەوانەی زاناو زیرەک بوون كێ بوون؟

حەزقیل: واو (ماشاءالله) زۆر زۆر بوون، لەوانەی بانگێشت كرابوون (مەلیك مەزهوب، مەلیك مەیمونی ئابانوخ، موڕە، مەلیك ئەبا محضری الأحمر)ئەمانە هەموو سەركردە و مەلیكەكان بوون، سەرۆك عەشیرەتەكان (شێخ بەرقانی خۆمان..).

ماكوان: بۆ شێخ بەرقان سەرۆك عەشیرەتە؟

حەزقیل: بەڵێ، سەرۆك عەشیرەتی بەرقانە، ئەوانیش دوو بەشن، بەشەكەی تریان كەسێك بەناوی بەرقانی یەهودی سەرۆكایەتیان دەكات.

ماكوان: واتا ئەوەی ئێمە شێخ بەرقانی ئیسلامە، ئەی كێی تری لی بوو؟

حەزقیل: سەید مەی طەطەڕوون، سەید شەمهوش، ئەبیعی زویعە، سەید طارش، علی شرامیط، علی صونادی، ئەب یوسف، ئەبا دیباج، ئەبا موزیق، ئەبا نوح) ئەمانە سەرۆك عەشیرەتەکان و گەورەکان بوون هاتبوون، ئەمانە بە ملیۆنان سەرباز و خەڵکیان لەگەڵدایە.

ماکوان: کەوایە زۆر هاتبوون، ئەی ئەم ناوانەی کە باست کردن چین و خەریکی چین، یەکەم جارە ئەم ناوانە ببیستم.

حەزقیل: خۆت دەزانی کە ئێمە زۆرین کار لە ملیۆندا نییە، بەڵام ئەم ناوانە ناگۆڕێن، لە ڕاستیدا مەگەر بە دەگمەن ئەو عەشیرەتە هەموو لەناو بچن و ناوەکان بگۆڕێت. بۆ نمونە (مەلیك مەزهوب) لەوانەیە دوو هەزار ساڵ بێت هەر ئەو ناوەیە کە بۆ وەچەکانی بەکار دەهێنن، چوونکە ناوی گەورەکان ناگۆڕێت و لەناو ناچێت، خۆ شێخ بەرقانی خۆمان کە بوو بە سەرۆك عەشیرەتی بەرقان ناویان نا بەرقان، پێشتر ناوی سماع بوو.

ماکوان: ئێ حەزەی برام شتی ترم بۆ باس بکە، ئا بیرم کەوتەوە با پرسیارێك بکەم، ئەمڕۆ ئەو تەڕەماشە دەموچاوی گۆڕا کە قورئانم خوێند زۆر ناشیرین و پیس و ترسناك بوو.

حەزقیل: دەی هەروایە، چوونکە جنۆکەکان خۆیان دەگۆڕنە سەر لاشە و شێوەی مرۆڤ، هەریەکەیان لە شەیتان و مرۆڤەکان تایبەت بە خۆیان هەیە. جنۆکە موسوڵمانەکان چوونکە ترس و هالەی موسوڵمان بوونیان هەیە و خۆیان ئیماندارن کەم دەگۆڕێن. ڕووخساریان جوانە، چاومان بەگشتی ڕەنگی قاوەییە، چاومان بادامییە ئەگەر تەماشای سپێنەی چاومان بکەیت هەمووی سپییە وەکو بەفر وایە، لە ڕادەبەدەر سپیایەتی دەبینیت، وایە؟

ماکوان: وەڵڵا حەزەی برام وا باسی دەکەیت، خەریکە موعجیبی چاوتان دەبم.

حەزقیل: هەر بەڕاستیمە، تەماشای بکە هەموو جنۆکە موسوڵمانەکان گلێنەی چاویان هێلکەییە.

ماکوان: ئەی شەیتانەکان چۆنن؟

حەزقیل: ئەوان چاویان جۆراوجۆرە، هەیانە پرتەقاڵییە، یان نارنجییە، هەیە زیوییە، مرۆیان هەیە، هەشیانە سەوزە، بەگشتی هەموو ڕەنگەکانیان هەیە، زۆربەیان قژیان زەردە یان زیبویەکی ڕۆشنە، پێستیان دەگۆڕێت لەگەڵ ڕەنگی قژیان، بە جۆری ڕەنگی قژیان دەتوانیت کەسایەتییان بناسیت.

ماکوان: تەنها شەیتانەکان ڕەنگیان دەگۆڕێت؟

حەزقیل: ئەوە مەبەستم تەنها موسوڵمانەکانە لە گۆڕانی پێستیان، بە دڵنیاییەوە شەیتانەکانیش دەگۆڕێن، بەڵام جیاوازترن.

ماکوان: چۆن؟

حەزقیل: جنۆکە کافرەکان زیاتر پێستیان وشکە، ڕەنگیان خۆڵەمێشی ماتە، ئەگەر جوان سەرنج بەیت چاویان داقڵیشاوە بێ برژانگن، دەمیان گەورە و لێویان نییە.

ماکوان: ئەمڕۆ ئەو سەگبابەم بینی وابوو، بەڵام پێشتر هەستم کرد ئاساییە.

حەزقیل: بۆ ماوەیەك ئاسایی دەیانبینیت، بەلام کە ڕوقیەت خوێند یان زۆر مایتەوە لەگەڵیان بەتەواوەتی هەستیان پێدەکەیت.

ماکوان: ئەمڕۆ وەرماش هەڕەشەی لێ دەکردم.

حەزقیل: هەمیشە هەڕەشەکانیان بە جدی وەربگرە، چوونکە ئەمانە زۆر ڕەق و بێ بەزەیین، عەزاب و ئازاری خەڵکی دڵخۆشییان دەکات، ئەمانە دەستیان لەگەڵ شەیتانی جنۆکە و شەیتانی مرۆڤ تێکەڵە.

ماکوان: جارێکی تریش بۆت باس کردم کە ئەمانە ئازار و ئەشکەنجە دلخۆشیان دەکات.

حەزقیل: بڕوا بکە باشترین دڵخۆشییان وە خۆشترین کاتەکانیان ئەوەیە کە ببینن خەڵک گاڵتە بە یەکتری بکەن، یان خۆیان گاڵتە بە مرۆڤەکان بکەن و پێیان ڕابوێرن، حەزیان بە ئاژاوەیە، حەزیان بە پیس و پۆخڵی مرۆڤ هەیە، لە قەرەباڵغیدا زۆر دڵخۆشن، بەبێ هۆکار ئازاری مرۆڤ دەدەن، بۆشیان گرنگ نییە کە مرۆڤەکە کێیە.

ماکوان: باشە ئەی ئێوە وەرزعتان چۆنە لەگەڵ مرۆڤەکاندا، بەگشتی؟

حەزقیل: لەناو جنە موسوڵمانەکانیشدا هەیە کە ڕقیان لە مرۆڤەکانە، بەڵام ئازاری کەس نادەن، ئەگەر زۆر تورەبن شتێکی ماڵەکەی دەشکێنن، بەڵام بۆ زانیاریت کافرەکان زۆر پیسن، تەنانەت کە دەسەڵاتیان دەبێت بەسەر مرۆڤدا جگەری دەخۆن، زۆر حەزیان بە جگەری مرۆڤە. جا کە ئەشیخۆن حەزیان بەوە کە مڵچە مڵچ بکەن، حەز دەکەن خوێنەکەی بە دەست و دەمیاندا بێتە خوارەوە.

ماکوان: ئەمانە زۆر پیس و خەتەرناکن.

حەزقیل: نا، یەکجار واش نا کە بترسیت، ئەوان زۆر لە مرۆڤ دەترسن، هەرکارێك دەکەن دژی ئێوە خێرا لەترسا تووشی هەناسە بڕکێ دەبن، کە زۆریان بۆ دێت هاواری خوا دەکەن فریایان بکەوێت.

ماکوان: بۆ بڕوایان بە خوا هەیە؟

حەزقیل: هەرچی جنۆکە هەیە لەم بوونەدا هەمووی بڕوای بە خوا هەیە، بەڵام ئیبلیس و داروودەستەکەی زۆرێکیانیان هەڵخەلەتاندووە بە درۆ و قسەی بێ ماناو پڕوپووچ.

ماکوان: باشە ئەم ئیبلیسە بە تەنها چۆن ئەم هەموو شتەی پێ دەکرێت.

حەزقیل: تەنها نییە زۆرن، جارێ ژنێکی هەیە هەر زۆر پیس و نالەبارە. وزەی زۆر بەهێزە بەڵام ناویان ناوە (بنت ابلیس) خۆی ناوی (نائلە مەلعون)ە، یان شەیتانەکان پێی دەڵێن (دایکە تەبعە)، بۆ زانیاریت لە هیندستان دەیپەرستن، باجی ئەدەنێ و قوربانی بۆ دەکەن، بۆ ئەوەی لەشەڕی بەدوور بن.

ماکوان: جا چۆن زانییان ئەمە ژنی ئیبلیسە؟

حەزقیل: لە هیندستان ساحیر و کتێبی سیحر زۆرە لە کتێبەکانیان هەیە بەناوی مەرجان و جادوو لەوێ دەریانهێناوە و ساحیرەکانیش پێیان خۆشە خەڵکی ئەو کارە بکات.

ماکوان: ئیش و کاری چییە ئەم مەلعونە؟

حەزقیل: زیاتر لەگەل ئافرەتە بێدینەکان کار دەکات، مرۆڤە کافرەتەکان تووشی وەسوەسە دەکات، ناهێڵێت کچ شوووبکات، بەتایبەت ئەو

کچانەی کە تەمەنیان هەیە و ئێوەی مرۆڤ پێیان دەڵێن قەیرە، کاری خەلکی سەرکەوتوو تێك دەدات، بۆ زانیاریت وەرماش لەنەوەی ئەو (نائله مەلعون)ە یە.

ماکوان: ئەی بەنەعلەت بن، پەنا دەگرم بە خوا لەم شەیتانانە.

حەزقیل: ماڵت ئاوا بێت من بۆچی هاتووم بۆلات، خەریکە کارەکەی خۆم لەبیر دەچێتەوە.

ماکوان: خێر حەزەی برام بۆچی هاتوویت و چیت پێیە پێم بڵێ؟

حەزقیل: شێخ بەرقان دەیوت بابەتێک ئامادە بکات لەسەر جنۆکە و ناسینی ماکوان بۆ جنۆکەکان و وەکو لێکۆڵینەوەیەك، سوڵطان زۆر خۆشحال بوو کە شێخ بەرقان باسی تۆی کرد بۆی، وتبوی ماکوان کەسێکی بەتوانایە، کە نەوتوانی لە کۆنگرەکە بەشدار بیت، پلانیان هەیە کە بێیت بۆ لامان و کۆڕێکت بۆ بگرن کە زۆرێك لە سەرۆك عەشیرەت و مەلیکەکان بانگ دەکەن، هەروەها دەیوت بەردەوام بێت لەگەل میلا، ئەم دەرمانەی ناردووە وتی با لەگەڵ ئەوەی کە کردوویەتی بەردەوام بێت، ئەمەشی تێکەڵ بکات بە پشتیوانی خوای پەروەردگار چاك دەبێتەوە.

ماکوان: ئەم دەرمانە چییە؟

حەزقیل: پێم نییە، خستوومەتە ناو سندووقی پۆستەکەتان، کە ڕۆشتیتەوە بۆمال دەریبهێنە، لەناو زەرفێکی شین دایە، وەکو خۆڵ وایە.

ماکوان: چۆن بەکاری بهێنم؟

حەزقیل: لەگەڵ گولاوەکە تێکەڵی بکە و ، کە بەیانیان لەخەو هەڵدەستێت باچاوی پێ بشووات ، شێخ بەرقان دەیوت با لە تاریکییەوە یەکسەر نەیەتە بەر ڕوناکی خۆر.

ماکوان: واتا چۆن تێناگەم؟

حەزقیل: بۆ نموونە بەیانی کە لەخەو هەڵدەسێت ڕاستەوخۆ لە جێگایەکی تاریکەوە نەیەتە بە ڕۆشناییەکی زۆر، با لە ژوورەکەدا بمێنێتەوە و هەرچەند خولەکێك پەردەی ژوورەکەی لابدات تا چاوی رادێت لەسەر ڕۆشناییەکە، خۆ ئەگەر چاوی کراوە بێت لەبەر هەتا و نەیکاتەوە، با لەبەر ڕوناکی بەهێزدا دانەنیشێت تا ماوەیەك، ڕوونە؟

ماکوان: ڕوونە، ئەی دەرمانەکە چییە؟

حەزقیل: دەرمانەکە چەند جۆرە گوڵ و گیایەکە، نازانم لای ئێوە ناوی چییە، کە هاتی خۆت لە شێخ بەرقان بپرسە، باشە؟

ماکوان: زۆرباشە، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە، ئەی کوڕەکە کەیە؟

حەزقیل: نازانم ئەویش لەکاتێکی نزیکدا ئاگادارت دەکەمەوە، من دەبێت بڕۆم کاتی نوێژی مەغریبە.

ماکوان: پەلە مەکە، ئەی سەسیل، کازۆل میا و جەماعەت کەی دەبینم؟

حەزقیل: قسە دەکەینەوە من دەڕۆم خوات لەگەڵ.

لەپڕ حەزە دیار نەما و منیش چووم بۆ مزگەوت نوێژەکەم کرد و گەڕامەوە بۆماڵەوە تەماشای سندوقی پۆستەکەم کرد زەرفێکی شینی تیا بوو، کە

کردمەوە دەرمانەکە وەکو تۆز وابوو، بەڵام بۆنی زۆر خۆش بوو تەلەفۆنم کرد بۆ مام فەرهاد هەواڵی میلادم پرسی.

مام فەرهاد: هەر وەکو خۆیەتی، بەڵکو سبەینێ بێت، ئاوی ترم بۆ هێناوە لە دەریاوە، قورئانی بەسەردا بخوێنە، میلادیش ویستی تەلەفۆنت بۆ بکات، بەڵام ئەوە لە لام دانیشتووە هەندێ کاری پێتە.

ماکوان: بابفەرمووێت، بە پشتیوانی خوا سبەینێ دێم، کە لە ئیش تەواو بووم.

میلاد: کاک ماکوان، ئەو کچە تەلەفۆنی بۆ کردم دەیوت بە مامۆستا ماکوان بڵێ لەگەڵ مندا دەیەوێت بمانبینێت، نازانم تەلەفۆنی بۆ خۆت کردووە؟

ماکوان: نەوەڵڵا تەلەفۆنی نەکردووە، ئێ باشە کاتی لەگەل دابنێ و بابیبینین، یان پەلە مەکە تا سبەینێ بە یەکەوە قسەی لەگەل دەکەین.

میلاد: زۆرباشە، لەخزمەتام، بەڵام پێت نەچێت میلا ئاوی نەماوە کە قورئانی بەسەردا خوێنرابێت.

ماکوان: پشتیوان بە خوای گەورە دوای ئەوەی لە کار گەڕامەوە یەکەم ئیشم ئەوە دەبێت کە بێمە خزمەتی ئیوە.

میلاد: دایکم دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات.

گلارە خانم: کاک ماکوان گیان لەگەڵ خێزانی بەڕێزت قسە بکەم؟

ماکوان: بە خۆشحاڵییەوە، یەك خولەك بانگی بکەم.

خێزانم بانگ کرد لەگەڵ گلارە خانم قسەیان کرد، نزیکی دە خولەک زیاتر، پاشان خێزانم هات وتی سبەینێ لەماڵی دایکی میلاد دەعوەتین، چوونکە پێشتر باسی میلاد و خانەوادەکەیم کردبوو بۆ خێزانم.

سبەینێ دوای کار دەرچووین بۆ ماڵیان و میواندارییەکی شاهانەیان کردین و خواردنێکی پاك و خۆش و جوانیان دروست کردبوو، منیش دەستم کرد بە خوێندنی سورەتی (النوور) بەسەر ئاوی دەریاکەدا و پەڕەی گوڵەباخەکەم تێکرد و هەندێك لە دەرمانەکەی حەزقیلم تێکرد، بەردەوام بووم لەخوێندنی قورئان. تەماشای حەوشەکەم کرد حەزقیل لای داری گوڵەباخەکە وەستابوو. زانیم ئیشی پێمە چوومە لای باخەکە و دەستم برد بۆ گوڵەکە و وتم با هەستت پێ نەکەن.

حەزقیل: دەرمانەکە ڕەزیلی تێدامەکە هەمووی تێکە بۆ جارێکی تر بۆت دەهێنم و دەیخەمە هەمان جێگا، چوونکە من بەکارم هێناوە، زۆر باشە؟

ماکوان: باشە، ویستم تۆزێکی لێ هەڵبگرم مادام بۆم دەهێنیت کێشە نییە.

حەزقیل: بێخەمبە بۆت دەهێنم، هەروەکو پێم وتی کاتێك لە تاریکی ئەڕواتە بەر ڕۆشنایی بەهێز، وردە وردە ڕۆشنایی بدات لە چاوی.

ماکوان: خوای گەورە بیخاتە میزانی حەسەناتتان.

خوا حافیزیمان لێکرد و گەڕامەوە بۆ سەر تەشتە ئاوەکە و قورئانم بەسەردا دەخوێند. کارەکەم تەواو کرد لەگەڵ میلا و خێزانم نوێژمان بە جەماعەت کرد و زۆر دوعای خێرم کرد بۆ میلا و داوام کرد لەوانیش دوعای خێر بۆ میلا بکەن، ئەڵبەت مەبەستم میلاد و خێزانم بوو.

پاشان بە مام فەرهاد و میلاد و دایکم وت پێویستە بن لە ڕۆشنایی زۆر بەهێز ئەم چەند ڕۆژە ئاگاداری ، ئەوەی حەزقیل پێ وتووم بە وانم وت.

بەمیلادم وت هیچت دەربارەی ئەو کچە بۆ باوکت و کەسوکارت باس کردووە؟

میلاد: نەخێر کاک ماکوان هیچ نازانن.

ماکوان: من دەڕۆم لەگەڵ باوکت قسە دەکەم و تۆش تەلەفۆنی بۆ بکە بزانە چی دەوێت، پێشی بڵێ ماکوان لای منە.

میلاد: باشە کاک ماکوان ئەی ئاو و گوڵاوەکە نەکەین بە چاوی میلا-دا؟

ماکوان: با تۆزێك تاریك بکات، ئەو کات بە پشتیوانی خوا کارەکە ئەنجام دەدەین، بەڵام ئێستا دەمەوێت لەگەڵ باوکت قسە بکەم تۆ بڕۆ تەلەفۆن بکە بۆ کرۆنیکا.

مام فەرهادم بانگ کرد هەموو باسەکەم بۆ گێڕاوە لە سەرەتاوە چۆن ناوسیوومە، چۆن میلادی کوڕیم ناسیووە، کە پێویستە بەهێز و بازووی میلاد و تەکنیکی جەنابت ئەو کچە ڕزگار بکەین، وتم خۆ تۆ ئەگەر لەبەر ئیسلامەتی نایکەیت ئەوا هیچ نەبێت کوردە و لەسەرمان پێویستە هاوکاری بکەین.

مام فەرهاد: چی لێم داوا دەکەیت بۆت بکەم؟

ماکوان: میلادم بۆ بەهیز بکە و لەو کارانەی کە میلاد پێویستی پێیەتی، چوونکە من هیچی لێنازانم، وەکو پارەش خەمت نەبێت من هاوکاریت دەکەم.

مام فەرهاد: كوره بابە عەیبە، هەرباسی پارە مەكە، بەسەرچاو بەڵام میلاد زۆر بەهێزە و زۆری لێدەترسم، خوای گەورە ڕەحمی كردووە كە خۆی كوڕێكی بە ئەدەب و ئارامگرە.

جا بۆیە دەڵێم خەمت نەبێت كارەكەی پێ ئەنجام دەدرێت، منیش ئاواتمە ڕۆژێك لە ڕۆژان مەدالیایەك یان پشتوێنێكی ئاڵتون بەرێت.

ماكوان: باشە خوای گەورە سەركەوتووی بكات، بەڵام من نازانم كارەكە چۆنە، هەوڵبدەن ئاسانكاری بۆ ئەو كچە بكەن، چوونكە خێرێكی زۆر گەورەیە و بێكەس و كارە. میلاد ئێستا قسەی لەگەڵ دەكات، نازانم چی ڕوویداوە هەست دەكەم ڕووی نییە لەگەڵ من قسە بكات.

مام فەرهاد: دڵنیابە وەكو كچی خۆم تەماشای دەكەم، هاوكاری تەواوی میلادیش دەكەم، بەڵام با دایكی نەزانێت ئەگینا ناهێڵێت یاری بكات، میلادیش زۆر بە قسەی دایكی دەكات و لە قسەی دەرناچێت.

ماكوان: ئەی ئافەرین، ئاگام لێ بوو میلاد تەلەفۆنەكەی داخستەوە لەگەڵ منداڵەكانی من و خوشكەكەی یاریان دەكرد، بانگم كرد وتم چی ڕوویداوە؟

## ڕۆڵ و کاریگەری مام فەرهاد لە ڕووداوەکان

لەماڵی مام فەرهاد نانمان خوارد پاشان ڕوقیەی شەرعی و دەرمانەکەی حەزقیلم کردە ناو ئاوەکە لە کۆتاییدا باسی کرۆنیکا و باروگوزەران و چۆنییەتی ناسینی میلادی کوڕیم کرد بۆ مام فەرهاد. لە دانیشتنەکەمان بەردەوام بووین، میلاد قسەی لەگەڵ کرۆنیکا کرد، ئاگام لێبوو نەیدەویست لەبەر چاوی باوکی باسی تەلەفۆنەکەیم بۆ بکات کە لەگەڵ کرۆنیکا چییان وتووە.

ماکوان: میلاد براکەم وەرە بزانم چی ڕوویداوە؟ کرۆنیکا شتێکی هەبوو کە تایبەت بێت بە کێشەکەی؟ یان هەر ویستی قسە لەگەڵ تۆ بکات.

میلاد: بەڵێ قسەی زۆری پێ بوو، پێشم وت کە قسە لەگەڵ کاک ماکوان بکە، وتی لەڕووم نایەت خۆت قسەی لەگەڵ بکە.

ماکوان: چی بووە چی ڕوویداوە؟

میلاد: ئاساییە قسە بکەم، یان کاتێکی تر؟

مام فەرهاد هەڵسا بڕوات وتم پێویست ناکات، باوکت برا گەورەی منە، هەموو شتێك دەربارەی کرۆنیکا دەزانێت، قسەم بۆ بکە. با باوکیشت گوێی لێ بێت.

میلاد: بەگریانەوە قسەی لەگەل من کرد، تەلەفۆنەکەی دایکی نەگۆڕاوە، لەڕێگای دایکییەوە ئەو پیاوە، ناوەکەیم بیر نەماوە چیی بوو هەڕەشەی لی کردووە.

ماکوان: مەبەستت فرانکە؟

میلاد: بەڵێ، داوای دەکرد کە ناکرێت ئاوا خۆی بشارێتەوە، دەیوت مەمنونتان دەبم هاوکاریم بکەن لەدەستی ئەو کابرایە ڕزگارم بکەن.

ماکوان: سەیرە چۆن قسەی لەگەڵ فرانك کردووە، با خۆم تەلەفۆنێکی بۆ بکەم بزانم چی بووە و زیاتر لێی تێبگەم.

تەلەفۆنم بۆ کرد وتم کرۆنیکای خوشکم چۆنی دایکت چۆنە؟ بۆم باس بکە بزانم چی ڕوویداوە؟

کرۆنیکا: لەگەڵ دایکم بڕیارمان دا کە خانووەکەمان بفرۆشین بۆ ئەو مەبەستە گەڕاینەوە و تا هەندێك کەلوپەلیش بەرین کە پێویستمان پێیبوو، لەگەل نووسینگەیەکیش قسەم کردبوو کە خانووەکەم بۆ بفرۆشن دەبو بچوومایە تا کلیلەکان بدەمە دەستیان، نازانم کام سەگ لە سەگەکانی فرانك ئێمەی بینیبوو تەلەفۆنی کردبوو بۆ دایکم. دایکیشم وایزانیبوو کە ئێوەن ئەو زۆر ژمارە و شتەکان ناناسێتەوە تەلەفۆنەکەی جواب یابووەوە، لە ڕێگای ئاواتی برامەوە ژمارەکەی دایکمیان وەرگرتبوو، وتبووی دەمەوێت قسە لەگەڵ کرۆنیکا بکەم.

دایکم تەلەفۆنەکەی دایە دەستم نەیوت کێیە، منیش بە خەیاڵی تۆ یان کاک میلاد وەڵامم دایەوە، کە گوێم لێ بوو فرانك بوو وتی چی بووە بۆ خۆتم لێ دەشاریتەوە؟ پێم بڵێ با هاوکاریت بکەم، زانیم کە بەڕێگاوەیە تا بێتە لامان ویستی بە قسە سەرقاڵم بکات، خێرا کلیلەکانم دایە دەستی کەسێك لە نووسینەگەکەوە هاتبوو ئیتر ئەوێم بەجێ هێشت، بەڵام قسەی لەگەل دەکردم. میش هیچم نەوت تەنها ئەوەندەم دەوت کە وازم لێ بێنێت، من و تۆ تازە ناتوانین لەگەل یەك بژین، بەڵام ئەو هەر نەرم بوو

لەگەڵم تا هاتە بەر دەرگایماڵەکەمان و زانی کە لەوێ نەماوم. ئەنجا دەستی کرد بە جنێودان پێم و هەڕەشە کردن لێم.

پێم وت هەڕەشە مەکە دەنگەکەت هەمووی تۆمارە و ئەیدەمە دەست پۆلیس، وتی بڕۆ بیانەرێ جا منیش ئەو کۆنتراکتەی کە ئیمزات کردووە ئەیدەمە دەست پۆلیس. منیش پێم وت بڕۆ بیدە بە پۆلیس و یەکسەر تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

چەند جار تەلەفۆنی کردەوە وەڵامم نەدایەوە ئەوە هەموو ڕووداوەکە بوو.

ماکوان: زۆرباشە، لە ڕاستیدا کارێکی باشت کردووە، خەمت نەبێت چارەسەری هەمووی دەکەین، بە پشتیوانی خوای پەروەردگار، ئەی باشە کچێ تەلەفۆنت بۆ بۆمن نەکرد؟

کرۆنیکا: بەخوا ماکوان بەقەدەر هەموو دنیا شەرمت لێ دەکەم زۆر خەجاڵەتی دەردەبڕم کە قسەت لەگەڵ دەکەم، دەنا نازانیت کە چەندە بەڕێز و نزیکی لێم، ئەوەی منی هێشتوتەوە لەم دنیایەدا تەنها تۆیت.

قسەکەم پێ بڕی وتم نەوەك قسەی تر بکات مام فەرهاد گوێی لە قسەکان بوو، وتم خوشکی عەزیزی منیت خوای گەورە کارت بۆ ئاسان بکات، دڵنیابە کە لە پشتت وەستاوین و من و کاك میلاد کەسوکاری تۆین.

ماڵئاوایم لێکرد و بە مام فەرهادم وت گوێت لە قسەکانی بوو، چی دەڵێیت و چی لێ تێدەگەیت؟ خوێندنەوەت چییە و چی بکەین بۆی باشە؟

مام فەرهاد: وەڵڵا دەڵێم با بڕۆین ئەوەندەی لێ بدەین تا هەناسەی تیا نامێنێت.

ماکوان: ئەزانم ئەوە بیرکردنەوەی هەموو کوردێکە و ئاساییە، بەڵام با پلانێکمان هەبێت.

مام فەرهاد: پلان ئەوەیە چەکوشێك بدەم بە سەریدا.

ماکوان: ئاوانابێت، ئەی میلاد تۆ هیچ پلانێکت هەیە، هیچ شك دەبەیت؟ بۆ ئەوەی ئەو کچە لە دەستی ئەو بەرازە ڕزگار بکەین.

میلاد: بەخوا کاك ماکوان ئێوە چی بڵێن من ئەوە دەکەم، پلانی من قسەی ئێوەیە.

ماکوان: مام فەرهاد من پلانێك لە مێشکمدایە، ماوەی مانگێکە ئەم سەراوسەری پێ دەکەم، بابۆت باس بکەم تۆش دوایی قسەی خۆتی لەسەر بکە و با میلادیش ڕای خۆی لەسەر بڵێ و زیاد و کەمی بکات.

هەردووکیان گوێیان شل کردبوو بۆ پلانەکەم، کاتێك کە تەواو بووم لە باسکردنی هەردووکیان وتیان ئێمە ئامادەین، زۆر سوپاسم کردن و وتم ئاخر دەبێت لەگەڵ ئەو ستافە هەمووی قسە بکەم تا بتوانین بەبێ کەلێن و بەتەواوەتی کارەکە ئەنجام بدەین، چاوەڕێم بکەن با لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تریشم قسە بکەم.

لەگەڵ ماڵ و منداڵ خۆمان ئامادە کرد و ماڵئاواییان لێبکەین، چووم ماڵئاوایی لە میلا و دایکی بکەم، هەر ئەوەندە وتم میلا گوڵە جوانەکەی خاڵی چاوت چۆنە هەر تاریکە؟

میلا: چاوم زۆر باشە دەتانبینم، بەڵام زوو زوو تەڵخ دەبێتەوە، بۆیە هیچم نەوت، وتم نە وەك جاران چیتر نابینمەوە.

کەوای وت خێرا سوجدەی شووکرم برد، مام فەرهاد پرسی کاك ماکوان چییە، وتم برا میلا چاوی دەبینێت.

مام فەرهاد: چاوت دەبینێت میلا گیان؟

میلا: بەڵێ باوکە زۆر باشە.

دەستی بەگریان کرد، وتی دەترسم وەك جارانم لێ بێتەوە.

چووم دەستم خستە سەرشانی و وتم گوڵەکەی خاڵی مەترسە بەشێکی زۆری هۆکاری نەبینینەکەت لە ترسەوەیە، تەواو چاك بوویتەوە، ئەگەر خوا نەخواستە نابینا بوویتەوە هەرکاتیە، چوونکە تۆ چاوت هیچ کێشەی نییە، تەنها ئەوەی کە خێزانم بۆی باس کردووم سیگناڵی بینینت هەڵە دەکات و ئەویش هۆکاری کەمی ڤیتامین دی یە کە ماددەیەکی تیایە بەناوی ڕێتینال کە ئەم ماددەیە هاوکارە لە دروستکردنی گەردێك کە پێویستە تا چاو بتوانێت هەست بە ڕوناکی بکات و ڕەنگەکان ببینێت. بە پشتیوانی خوا تۆ چاك بوویتەوە و هەوڵ بدە ڤیتامینەکان بەتایبەت ڤیتامین ئەی کە گرنگە بۆ هەستی بینین بخۆ.

مام فەرهاد دەگریا و هاواری دەکرد (أشهد ان لا اله الإ الله وأشهد أن محمد رسول الله)، میلاد باوەشی کرد بە باوکیدا و گلارە خانمیش باوەشی کردبوو بە میلاد دا.

من و خێزانیشم لە خۆشیا دەگریاین، ئانا و لین و میلاش سەیری ئێمەیان دەکرد و پێدەکەنین. ئای کە دیمەنێکی جوان و خۆش بوو، باوەشم کرد بە مام فەرهاد دا وتم برا دوو جار پیرۆزە، جاری یەکەم بۆ شایەتومانەکەت

جاری دووەم بۆ چاکبوونەوەی میلا. خوای گەورە مەحفوزتان بکات و گەورەترین ئاهەنگ دەگێڕم بۆ ئێوە بە پشتیوانی خوا.

مام فەرهاد: من نازانم چی بۆ تۆ بکەم مام ماکوان گیان؟

ماکوان: دوعای خێر و چاکە و هاوکاری کردنمان لە کێشەی ئەو کچەدا.

مام فەرهاد: ئەو کچە وەکو میلای کچم وایە بێخەمبە.

خوا حافیزیمان کرد و گەڕاینەوە ماڵەوە، سبەینێ چووم پلانەکەم بۆ کاوە و بەختیار باس کرد، ئەوانیش ڕازی بوون، هێشتا پێویستیم بە سێ کەسی تر هەبوو نەمدەزانی بەکێ بڵێم. ئەوەی لێم ڕادەبینی و ئازا بوو کوڕێکی مەغریبی هاوڕێم بوو ناوی (مونیر) بوو خاوەنی دوکانی پیتزا بوو کە باسەکەم بۆ ئەو کرد وتی تۆ بێخەمبە برایەک و ئامۆزایەکی خۆم دەهێنم لەخۆم باشتر و بەهێزتر بن. ستافەکەم تەواو کرد تەنها کرۆنیکا مابوو کە ئاگاداری بکەمەوە، تەلەفۆنم بۆ کرد سەرەتا لەگەڵ دایکی قسەم کرد، هەستم کرد دایکی زۆر خەفەتباری چیمەنی کچی بوو، بۆیە وتم دڵنیابە کە کێشەکەی بە زووترین کات چارەسەر دەبێت، تەلەفۆنەکە بدەرە دەست چیمەن کاری زۆرم پێیەتی.

ماکوان: جوان گوێبگرە بزانە چیت پێدەڵێم و پلانەکەمان چییە.

سەرەتا دەبێت بە فرانك بڵێی کە شوووت کردووە بە کوڕێکی خزمی خۆت ناوی ماکوان-ە، بانگی دەکەیت بۆ جێگایەك دەڵێیت دەیەوێت بتبینێت.

کرۆنیکا: کەی پێی بڵێم؟

ماکوان: خۆم ئاگادارت دەکەمەوە، دەبێت ڕۆژانی شەممە و یەك شەممە بێت، باشە؟

کرۆنیکا: بۆ ئەم کارە پارەت پێویست نییە؟

ماکوان: نا، پارەم بۆ تەرخان کردووە خەمت نەبێت.

کرۆنیکا: سوێندت دەدەم بە خوای پەروەردگار، چیت سەرف کرد دەبێت ئاگادارم بکەیتەوە تا پارەکەت بۆ بگەڕێنمەوە.

ماکوان: دوعای خێر بکە سەربکەوین پارە کێشە نییە.

کۆتایی هەفتەم دانا کە هەموو ئەو کورانە کۆ ببنەوە و جێگام دەست نیشان کرد لەدەرەوەی شار لە سەیرانگایەك، بەلام دوور لە خەڵکی، گۆشت و خەڵوز و خواردنەوە و چەرەساتم کڕی پێکەوە بەرەو ئەوێ ڕۆشتین.

مام فەرهاد، میلاد، کرۆنیکا، کاوە، بەختیار، مونیر و برا و ئامۆزاکەی و خۆشم بەرەو ئەو جێگایە ڕۆشتین.

پێشتر کرۆنیکام ئاگادار کردبووەوە کە بە فرانك بڵێ با لەو جێگایە چاوەڕێمان بکات.

دەشمزانی کە فرانك بەلایەنی کەمەوە سێ چوار کەسی لەگەڵدا دەبێت. کە نزیك بووینەوە جەماعەتی خۆمانم پەرتەوازە پێ کرد بۆ ئەوەی ئەوان نەزانن کە ژمارەمان زۆرە.

من و کرۆنیکا ڕۆشتین لە سەر لێواری چەمێك دانیشتبووین چاوەڕێی فرانکم دەکرد، قولاپێکم دابووە دەست میلاد لە نزیکمانەوە بە حساب

خەریکی ماسی گرتن بوو لەگەڵ باوکی، بەڵام بە جۆرێك کە ئێمە هەر نەناسن.

چاوەڕێ بووین سەیارەیەك لە جۆری ڕانج ڕۆڤەر هات، ئەوەی پێشبینیم کرد وا دەرچوو، پێنج کەس دابەزین، هەموویان قەبە و بەهێز دیار بوون، ڕووە و ئێمە هاتن.

فرانك ڕووی کردە کرۆنیکا و وتی هاوسەرەکەت ئەم ماسییەیە؟

منیش کرۆنیکام خستە پشتی خۆمەوە، وتم پێ ناچێت لەگەڵ ماسی قسە بکەیت، من تیمساحم. پەنجەی هێنا بۆلای دەمم وتی بزانم ئەتوانی گازی لێ بگریت.

هەرکە نزیکی کردەوە لە دەمم گازێکم لێ گرت و پاڵێکم پێوە نا.

پێشتر بە میلاد و باوکیم وتبوو کە زانیتان دەست دەوەشێنێت کامیان زۆر خۆی بە بەهێز دەزانێت دەست و قاچێکیم بۆ بشکێنن، بەڵام شکانی تەواوەتی کە بارەیان لێ هەڵبسێت.

کە پاڵەکەم بە فرانکەوە ناو گازەکەم لێ گرت کرۆنیکا ترسا و شڵەژا لە تاوا کەوتە ناو ئاوەکەوە، بانگی میلاد و باوکی کرد، وەڵڵا هەر وام وت خێرا مام فەرهاد هەردوو دەست و قاچێکی یەکێکیان کەلە پاچە کرد، ئیشارەتم دانابوو بۆ ئەوانی تر، سەیر ئەکەم میلاد یەکێکیانی هەڵگرتووە ئەڵێی فەرشی ئەتەکاند ئەیکێشا بە ئەرزەکەیا، من وتم دەست و قاچی دوانیان بشکێنن ئەوا دەست و قاچی چواریان شکاندبوو. خۆشم بەرەو ڕووی فرانك ڕۆشتم داخی زۆر لەدڵما بوو، ئیشارەتم کرد بۆ جەماعەتی دووەم

هاتن، کە هاتن تووشی شۆك بوون، هەموویان لە جێگای خۆیاندا وەستابوون.

ڕووە و فرانك ڕۆشتم یەخەی کراسەکەیم گرت، بانگی کرۆنیکام کرد وتم ئەم مریشکە بوو هەڕەشەی لێ دەکردیت؟

کرۆنیکا: بەڵێ خۆیەتی، زۆر ئازاری یاوم.

بە نەرویجی قسەم ئەکرد، وتم وەرە بەئارەزووی خۆت پیای بکێشە.

کرۆنیکا: نا پێویست ناکات.

ئاگام لێی بوو دەترسا..

ماکوان: مادام بە قسەم ناکەیت ئەبێ پێڵاوەکەت دابکەنیت و بە پێڵاوەکەت پیای بکێشی، ئەگەر بە قسەشم نەکەیت ئەوا ئەیکەم بە چەقۆ.

کرۆنیکا لە ترسی ئەوەی تووندی نەکەم لەسەری پێڵاوەکەی داکەند و بە هێواشی پێیایدا دەکێشا، منیش پێڵاوەکەم لێ وەرگرت هەتا هێزم تیا بوو کێشام بە سەریا سێ جار وتم ئاوا پیای بکێشە، دەی.

ئاگام لە کاوە بوو زوو زوو شەقی هەڵئەیا لەو چوارەی تر مام فەرهادیش ئەیکێشا بەسەریانا، کرۆنیکاش بە ئارەزووی دڵی من پێڵاوەکەی کێشا بە سەری فرانکا وەکو سەگ دەیقوروسکاند.

وتم یەڵڵا برۆ ناو ئاوەکە، خۆت دەڕۆیت یان بتخەمە ناوی، کە وام وت لەدەستم ڕای کرد، مونیر و نەبیلی برای شووێنی کەوتن، بە شەق هێنایانەوە بەردەستم.

ماکوان: کێ ماسیە و لەدەستم دەخلیسکێت؟

فرانك: چیت دەوێت لێم؟

ماکوان: جارێ با بتخەمە ئاوەکەوە.

فرانك: با مۆبایلەکەم دەربهێنم.

ماکوان: باشە مۆبایلەکەت گرانە.

مۆبایلەکەی دەرهێنا و دایە دەستم، منیش فڕێم دایە ناو ئاوەکە وتم بزانم سەگێکی بەوەفای بچیت بیهێنیتەوە، مۆبایلەکەم فڕێ یایە ناو ئاوەکە و فرانك چوو بیهێنێتەوە، تا ئەو هاتەوە مام فەرهاد سویچی سەیارەکەی لێ سەندبوون، ئەوانیش نەیانئەتوانی ڕابکەن خۆ ئەگەر بیان ویستایە ڕابکەن بە دەردی فرانك ئەچوون، بێجگە لەوەی دەست و قاچیان کەلەپاچە ببوو.

فرانک هاتە دەرەوە لە ئاوەوە و وتی چیت دەوێت؟

ئەگەر ئەو (قەحبەت) دەوێت بیبە بۆ خۆت، کەوای وت شێت بووم، ئەوەندەم پیا کێشا، میلاد هاواری کرد وتی کاك ماکوان بەسە دەستی خۆت بریندار بووە خوێنی لێ دێت، بەسە با شتێکی لی نەیەت بە دەستتەوە.

پێم وت ئەبێ بچیت قۆنەرەکانی کرۆنیکا ماچ بکەیت.

فرانك: ئیتر وازمان لێ بێنن با بڕۆین.

ماکوان: پێڵاوەکانی کرۆنیکا ماچ دەکەیت، یان لێرەدا وەکو سەگ بوتۆپێنم؟

فرانك: پێڵاوی ماچ ناکەم، بەڵام داوای لێبوردنی لێ دەکەم.

ماکوان: کارێکی باشە، ئادەی بتبینم؟

لەو کاتەدا یەکێك لە سەگەکانی فرانك وتی ئازارم زۆرە وازمان لێ بهێنن بابڕۆین، وەڵڵا قسەکەی تەواو نەکردبوو میلاد پەلاماری دا، دەستێکی شکاندبوو وەڵڵا ئەوی تریشی قرتەی لێوەهات.

دەبوو بە زمانی ئەوان قسەیان لەگەڵ بکەم، چوونکە ئەمزانی ئەوان مافیان و ڕەحم لە دڵیاندا نییە، بۆیە نەدەبوو من بەڕەحم بم بەرانبەریان، وتم فرانك ئێستا کاتی قسەکردنمانە، فێری قسەکردن بوویت یان جارێ ماوتە فێرت بکەین، کەمێکی ترت پیا بکێشم یان بەسە؟

فرانك: فەرموو بزانم چیت دەوێت؟

ماکوان: ئەم هاتنەت میوانداری من بوو، بەڵام دڵنیابە ئەمجارە من دێم بۆلات، باش بزانە کە من هەموو شتێکت دەزانم. تۆ بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆت بە (مەفیوز) دەزانیت، بەڵام تۆ مریشکیت من بە (مەفیوز)ی لەدایك بووم. جیاوازیمان زۆرە. لێرە تۆ ناتوانیت ئەوەی دەتەوێت بە کورد و فارس و عەرەبی بکەیت. ئێمە زۆرین تۆ و مریشکەکانت ئەگەر دە کەسیش بن ئەوا ئێمە سەد کەسین، جا کارێك مەکە کە کار و ژیانت لێ تێك بدەم، ڕوونە؟

فرانك: باشە بابڕۆین.

ماکوان: ستێلای کچت خۆش دەوێت؟

فرانك: بە دڵنیاییەوە.

ماکوان: ئاگات لە کچەکەت بێت، ئاگات لە کاروکاسبیەکەت بێت، تێگەیشتی؟

فرانك: باشە وازم لێ بهێنە بابڕۆین.

ماکوان: هەڵسن ملتان بشکێنن، وەکو وتم چاوەڕێ بن ئێمە دەبینە میوان، باشە؟

فرانك بە تۆنێکی هەڕەشە ئامێز وتی باشە چاوەڕیتانم.

ماکوان: دەبێت زۆر باش چاوەڕوانم بیت، بەڵام ئەمجارە خەڵکی بەهێزتر بانگ بکە با گیرفانیان پڕ بێت لە فیشەک.

فرانك: وازمان لێ دەهێنیت بڕۆین؟

ماکوان: ملتان بشکێنن، چاوەڕێی چیت، تۆزێکی ترتان لێ بدەین؟

فرانك: سویچی سەیارەکەمان بەنەوە.

بەچاو ئیشارەتم کرد بۆ مام فەرهاد بیاناتەوە، ئەویش بۆی فڕێ یان، هەڵیان گرتەوە و ڕۆیشتن، ئێمەش دەستمان کرد بە گۆشت برژاندن، ئاگام لێ بوو عەرەبەکان زۆر سەرسام بووبوون بە میلاد و باوکی. من و مام فەرهاد چووینە گوێ چەمەکە و کرۆنیکاشمان لەگەڵ بوو، عەرزم کرد ئەم پلانی (ئەی) سەرکەوتوو بوو، پلانی بی دەبێت تەواو بکەین بۆ ئەوەی بزانین کاردانەوەیان چیی دەبێت.

مام فەرهاد: زۆر باشە، سوپاس بۆ خوا زۆر باش بوو.

ماكوان: ماشاءالله زۆر بەهێزی خوای گەورە تەمەن درێژ و لەش ساغت بكات، بەڵام توخوا جگەرە مەكێشە، با ماندوت نەكات.

مام فەرهاد: ان شاء الله كەی پلانی (بی) دەست پێ بكەین؟

ماكوان: بابڕۆین لەگەڵ جەماعەت قسە بكەین ئەوانیش ئاگادار بن.

كرۆنیكا زۆر بیدەنگ بوو، هەستم كرد كە زۆر ترسابوو و زۆر شەرمەزار بوو كە ئەم هەموو كوڕە باشە هاتوون هاوكاری دەكەن، بەلام شەرم وەكو چارشێو دایپۆشیبوو، لەگەڵ هەموو ستافەكە قسە بكەم و پلانی (بی) كەوتە جێبەجێ كردنەوە.

كاتمان دانا بۆ ڕۆژی سێ شەممە، پێم وتن بەڵام ئەبێ ئەوە بزانن كە ئەمجارەیان زۆر ترسناكە، لەوانەیە لێدان بخۆین و ئازارمان پێ بگات، یان ناڕەحەتمان بكەن، لە ئێستاوە ئەگەر ئەزانن لە تواناتاندا نییە و بۆتان ناكرێت با كەسێكی كە بخەمە شوێنەكەتان. ئەمە بەمانای ترسنۆكی نییە، مانای وایە تەنها ئەوەندەم پێ دەكرێت.

سوپاس بۆ خوا وەڵامی هەموویان پۆزەتیڤ بوو، ئەوەی كە زیاتر خۆشحاڵی كردم مام فەرهاد بوو كە خۆی بە خاوەنی كێشەكە دەزانی، لای عەرەبەكان وتمان كە كرۆنیكا كچی مام فەرهادە.

هەرچەندە ئەوان نەیاندەزانی بەتەواوەتی كێشەكە چییە، بەڵام زۆر هاوكار بوون. بەڕاستی خەڵكی مەغریب زۆر زۆر مەرد و جوامێرن.

ڕۆژی سێ شەممە كاتژمێر ٤ی دوای نیوەڕۆ هەموومان بەیەكەوە ڕۆشتین بۆ پێشانگای سەیارەی فرانك، كوڕەكانم دابەش كرد، من و كرۆنیكا

بەیەکەوە ڕۆشتین قۆڵی کردبوو بە قۆڵمدا، مام فەرهاد لە تەنیشتمەوە دەڕۆشت، میلاد لە تەنیشت کرۆنیکاوە.

زۆر بە هێمنی خۆمان کرد بە پێشانگاکەدا بە هێواشی و لەسەرخۆ تەماشای سەیارەمان دەکرد، فرانك لە ئۆفیسەکەیەوە سەیری دەکردین، یەکێك لەوانەی کە لەگەڵیدا بوو بینیم دەستی لە ملیا بوو، چووم بۆلای وتم دەستت چۆنە؟

وتی هاوڕێ لەعنەتییەکەت زۆر ئازاری یاوم لە سێ لاوە شکاوە.

ماکوان: ئەگەر ئاقڵ نەبن، ئەمڕۆ کەلەتان ئەتەقێنێت، ڕوونە؟

من پەیوەندیم بە هیچەوە نییە، بڕۆ لەگەڵ فرانك قسە بکە.

کەوای وت خۆشحاڵ بووم زانیم ترس لە دڵیاندا دروست بووە، هیچیان بۆ ناکرێت.

فرانك هاتە دەرەوە لە ئۆفیسەکەی هات بۆلام و وتی چیت دەوێت؟

زۆر گوێم نەیایە و مەشغوڵی سەیرکردنی سەیارە بووم، دوای ماوەیەك بەدیارمەوە وەستا، وتم؛ پێم نەوتی من دێم دەبم بە میوانت. تۆ زۆر بێ ئەدەبی و هیچ ئەتەکێتێک نازانی، میوانداری چۆن وا دەبێت.

فرانك: چیت دەوێت من وازم لە کرۆنیکا هێناوە بۆ تۆ، تەواو من بیری لێ ناکەمەوە.

ماکوان: بیری لی دەکەمەوە دەمەوێت کۆنتراکتی کیک بۆکسێنەکە بەتاڵ بکەمەوە یان ئەتەوێت هەرچی سەیارە هەیە لێرەیا هەمووی بسووتێنم بە فەرمانبەرەکانیشتەوە.

فرانك: وەرە با بڕۆینە ئۆفیس قسە بکەین، هیـن بە و هیچ مەکە.

ماکوان: تۆ بڕۆ ئەم سەیارەیە زۆر جوانە با تۆزێ تەماشای بکەم، دێم لاچۆ لەبەرچاوم، جوانی ئەم سەیارە هێمنی کردووم، کە تۆ دەبینم هەموو گیانم دەبێت بە بورکان، جارێ بڕۆ ونبە لەبەرچاوم.

کەوام وت خێرا ڕۆشت، کاوە هات بۆلام وتی لە فیلمی (جۆن ویکس) ئەچیت، ئەوەندە قورسی مەکە لەسەریان، ئاگات لێیان نییە چۆن تۆقیون بیانکە بە هاوڕێ.

ماکوان: نا با هەردوور بن، با نەمانناسن دوای بزانن کە ئەم ستافە تەنها لەبەر تۆڵە سەندنەوە لەوان کۆبووینەتەوە ئەوا یەك یەك دێن تۆڵەمان لێ دەکەنەوە، هەرگیز ناهێڵم بماننناسن.

کاوە؛ ڕاست دەکەیت، ئەمانیان نییە ئەم کافرانە.

ماکوان: دوور مەکەونەوە لەیەکتری هەمیشە تۆ و بەختیار بەیەکەوە بن، ئەو سێ مەغریبیەش با بەیەکەوە بن، مونیرم بۆ بنێرە قسەی لەگەڵ دەکەم.

مونیر هات بۆلام وتی ئەبو ئانا چیت دەوێت؟

ماکوان: هەوڵ بەن وەکو پاسەوان وابن چاوتان لە هەموو دەوروبەر بێت، هەست بکەن کە بەدوای شەڕدا دەگەڕێن، باشە؟ هەوڵ بەن لای دەرگای سەرەکییەوە بووەستن.

مونیر: بێ خەمبە وادەکەین.

کرۆنیکام برد و چووم بۆ ئۆفیسەکەی فرانک، میلاد و باوکیشی لە نزیك ئۆفیسەکەوە وەستابوون.

فرانك: چی دەخۆنەوە؟

ماکوان: باشە خەریکە فێری میوانداری دەبیت، من قاوەیەك دەخۆمەوە کرۆنیکاش ئاو.

فرانك هەلسا خۆی قاوەیەکی بۆ من هێنا و ئاوێکیشی خستە بەردەم کرۆنیکا.

وتی: من ناتوانم ئەو کۆنتراکتە بەتاڵ بکەمەوە، چوونکە دەبێت کۆمپانیا بەتاڵی بکاتەوە.

بۆ شکاندنی فرانك لە بەرچاوی کرۆنیکا وتم ڕاست ئەکات؟

کرۆنیکا: بەلێ ڕاست دەکات.

ماکوان: چارە چییە، ڕێگا چارەم دەوێت.

فرانك: مانگی سێی ساڵی داهاتوو من هاوکاریتان دەکەم، لەوێ بە وەرزشەوانێك دەڵێم، یان بزانم چۆن کۆتایی پێ بهێنم.

ماکوان: تۆ ڕاستگۆ نیت، پێویستم بەتۆ نییە، چوونکە کێشەی تری بۆ دروست دەکەیت.

فرانك: پەیمان دەدەم کێشەکە چارەسەر بکەم.

ماکوان: ئەمە چۆن دەکرێت تێم بگەیەنە.

فرانك ویستی قسە بکات، وتم پەلە مەکە با ئەو هاوکارەم بانگ بکەم گوێی لێبێت، چوونکە ئەو ئیشانەم بۆ ڕێك دەخات. بانگی میلادم کرد هات وای زانی دەڵێم لە فرانك بە، وتی؛ کاك ماکوان دەستی بشکێنم؟

ماکوان: نا، تەنها گوێ بگرە.

فرانك: ئێوە لەدەست شکاندنا زۆر زیرەکن، دەستی چوار کەستان شکاندووە بەس نییە؟

خۆم تورە کرد وتم تۆ یاری بەگیانی خەڵك دەکەیت، چەند خەڵکی بێتاوانت کوشتووە؟ وا نەزانیت کە وێنە و ڤیدیۆی کارە بێماناکات دەست ناکەوێت، لای زۆر کەس هەیە دەست شکاندن باشترە لەوەی کە خەڵك دەرخواردی گورگ و پڵنگ بدەیت، فێری دەم درێژی مەبە و کیسەیەك هەوا بخە ناو دەمت بۆگەنی دێت.

فرانك: باشە من کاتی شەڕم نییە و نامەویت شەڕ بکەم.

ماکوان: کەی کاتی شەڕت هەبوو وەرە من بۆ شەڕ و لێدان هەمیشە کاتی بەتاڵم هەیە، ڕوونە؟

فرانك: واز لەو باسە بهێنە با تێت بگەیەنم چی دەکەین.

ماکوان: میلاد من تاقەتم نییە گوێ لەم (کیسە گووە) بگرم بزانە چی دەڵێت، کە تەواو بوو تۆ بۆم باس بکە، کرۆنیکا هەڵسە.

هاتینە دەرەوە، بە کوردی بە میلادم وت وەرەقە و قەڵەمی لێ وەربگرە ئەوەی دەیڵێت بینووسە، بە لەبیرت نەچێتەوە، من هاتمە دەرەوە بەیەکێك لە فەرمانبەرەکانیم وت بڕۆ بۆ قاوە بۆ هاوڕێکانی من بەرە، چوومە سەربۆنیتی سەیارەیەک دانیشتم، کۆرنیکاش لەبەردەممدا وەستابوو.

کرۆنیکا: مامۆستا ماکوان تۆ زۆر سەیریت، پێ دەچیت هونەرمەند بیت؟

ماکوان: بۆ وا دەڵێیت چی بووە؟

کرۆنیکا: زۆر مافیایت، یان جوانتر بڵێم زۆر بە جوانی دەوری مافیا دەبینیت، ئەوەندەی تر سەرسامت کردم، خوای گەورە لە منت نەسێنێت، نازانم چۆن پاداشتت بدەمەوە، نازانی ئێستا چەند هەست بە ئارامی دەکەم.

ماکوان: باشە لەکوردەواریدا دەڵێن؛ وەرە خۆت بۆ بۆرە پیاو بە بەکوشت دە، دەڵێن بە دەردی خوای مردووە. بە من دەڵێت مافیا لەکاتێکدا هەموو ئەوەی دەیکەم لەبەرخاتری تۆیە. پێویستە وابم ئەمانە ڕەحم بەکەس ناکەن، خۆت باشیان دەناسیت.

کرۆنیکا: وەی بەخوا مەبەستم خراپ نەبوو، مەبەستم ئەوە بوو نازانم چۆن بۆت باس بکەم واتا ئەوەی دەیکەیت لێت دێت.

ئاخر تۆ نازانی ئەم سەگە چەندە چاوقایمە، تۆ لەوانەیە هەستی پێ نەکەیت. من دەزانم چەندە شکۆیت شکاندووە من ئاگام لە قسە کردنییەتی چۆن زەلیلت کردووە. لەبەر ئەوە دەڵێم تۆ هەنەرمەندی. ئەم

ڕۆڵەی تۆ دەیبینیت ڕۆڵی ڕاستی ژیانی خۆت نییە، بەڵام کە دەبینم دەڵێی هەموو ژیانت (گانگستەر) بوویت، بەڕاستی من زۆرجار شەرمم لێ دەکردیت، ئێستا شەرمیشت لێ دەکەم و زۆریشت لێ دەترسم.

ماکوان: هەمووی لەبەرخاتری تۆیە و لەبەرخاتری سەرپۆشەکەی سەرتە، دەمەوێت شکۆی ئەو حیجابە ون نەبێت، بەڵام لەم سەگە زۆر دەترسم کە لە ژێرەوە شت بکات. لەبەر ئەوە دەبێت ئاگاداری خۆمان بین لە بەرچاوی نەبین و بەجێگا و مەکانمان نەزانێت.

کرۆنیکا: زۆر ڕاستە، بەڵام هەست دەکەم وانەیەکت داوەتێ هەرگیز لە بیری ناچێتەوە، دەستی هاوڕێکانیتان شکاندووە کە وەکو سەگ وابوون، بڕوا ناکەم بوێرن تەماشاتان بکەن.

لەم قسانەدا بووین مام فەرهاد هات بۆلام.

مام فەرهاد: شووشەی مێزەکەی نایلۆنی پێوەیە، ئەڵێم با هەردووکمان بچینە ژوورەوە تورەی بکەین، بەهەردووکمان بیکێشین بە مێزەکەیدا بیشکێنین و ئەنجا بڕۆین، بەڵام تۆ بەهێواشی پیای بکێشە با دەستت ئازاری نەگاتێ، بەلام من بە قایمی پیا دەکێشم، پێت چۆنە؟

ماکونا؛ تۆ چی دەڵێیت لە قسەت دەرناچم، بڕۆ بابڕۆین.

بەیەکەوە چووینە ژوورەوە، بە میلادم وت ئەوە چی دەکەن؟ تەواو نەبوون؟ ئەم مریشکە درۆت لەگەل دەکات یان بەڕاستێتی.

میلاد: ئەوەی دەیڵێت لە ڕۆتیناتی کارەکە دەینووسم، ئەگەر زانیمان درۆ دەکات دەستێکی دەشکێنم.

ماکوان: ئیشەکەتان تەواو بکەن.

بەکوردی بە مام فەرهادم وت وەرە دابنیشە خۆت ئامادە بکە بکێشین بە شووشەی مێزەکەیدا و بیشکێنین، هات دانیشت وتم ئێستا تورەی دەکەم تا ئێمەش تورە بین.

بە هێواش و بە پێکەنینەوە بە فرانکم وت درۆمان لەگەڵ نەکەیت، چوونکە تۆ درۆزنیت، خوای گەورە کردی کەوام پێ وت تورە بوو.

فرانك: من یارمەتیتان دەدەم کەچی ئێوە پێم ئەلێن درۆزن.

هەروای وت من و مام فەرهاد کێشامان بە مێزەکەیدا و ورد و خاشـان کرد، لەتاواندا حەپەسا.

# سەرەتای دەرکەوتنی کۆڵێکی قورس

هەمیشە خوای پەروەردگار هاوکاری ئەو کەسانەیە کە دوو کار بەیەکەوە ئەنجام دەدەن، ئەوەی پێداویستی ئەو کارەیە کۆی دەکاتەوە و چی لەتوانایدایە ئەنجامی ئەدات لەڕووی کاری دنیاییەوە، پاشان پشت بە خوای گەورە دەبەستێت و تەوەکولی بە پەروەردگاریەتی، ئەم دەرئەنجامە لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) بۆمان بەجێماوە، ئەگەر بەچاوی شیکارییانە تەماشای ڕووداوەکانی سیرەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەین هەوڵی یەکەمی هەرچی هێزی ماددییە کۆی کردۆتەوە، ئەوەی کەلە توانیادا بووە و پاشان تەوەکول بەخوای گەورە کارەکەی ئەنجام داوە. نمونە زۆرە هەر لە غەزای بەدرەوە تا دەگاتە غەزاکانی تر و هەموو ئەوەی تێیدا بەدی دەکرێت، خۆ ئەگەر شکست هاتبێت ئەوا بە دڵنیاییەوە یەکێك لەو دوو دەرئەنجامە نارێك و یان کەم و نوقسان بووە، وەکو نمونەی (ئوحود).

ئەم پێشەکییەم بۆ ئەوە بوو کە ئەوەی لەتوانامدا بوو لە هێز و کاری ماددی بەکارم هێنا لەبەرانبەر فرانك دا، تەوەکولم بە خوای خۆم هەبوو، کارەکەشم لە پێناوی پەروەردگاردا بوو بۆ ڕزگارکردنی خوشکێکی ئیماندار.

من و مام فەرهاد پلانمان دانابوو کە زیاتر ترس و بیم بخەینە دڵی فرانك و هاوکارەکانی هەردووکمان خۆمان تورەکرد و کێشامان بە مێزێکی شووشەدا کە بۆ چا و قاوە خواردنەوە لەبەردەمماندا دانرابوو. شکاندمان و فرانك حەپەسا و مونیر و نەبیل و سەمیر بەپەلە هاتنە لامان. وتم

ئاگاداری هاوکارەکانی فرانك بن، هێشتا قسەکەم تەواو نەکردبوو مونیر چوو هاواری کرد لە جێگای خۆتان نەجوڵێن.

ڕوومکردە فرانك و وتم: کەی تۆ دەبیت بە مرۆڤ و وەکو مرۆڤ بەڕێزەوە قسە دەکەیت؟

فرانك (بەهێواشی و نەرمی): ئێوە شەڕ دەگێڕن، من هاوکاریتان دەکەم.

ماکوان: هاوکاری بە ڕێز و ئیحترامەوە دەبێت، تۆ هاوکار نیت درۆ دەکەیت، جێگای متمانەمان نیت. دەبێت کارێك ئەنجام بدەیت بزانین کە تۆ ڕاستگۆیت.

فرانك: چیت دەوێت بیکەم؟ ئەوەی لە توانامدایە ئەنجامی ئەدەم، باشە؟

ماکوان: من دەمەوێت بەتەواوەتی کرۆنیکای خێزانم لە مێشك و کارەکانتا بسڕیتەوە، ئەوە ئیشی یەکەم و کۆتایی منە لەگەڵ تۆدا، ڕوونە؟

فرانك: هەموو زانیارییەکم داوە بەهاوکارەکانی، وەکو خۆشم کرۆنیکا پیرۆزت بێت و نەك لە مێشکمدا سڕیومەتەوە بەڵکو نامەوێت هەر ببینم.

ماکوان: ئەوە کارێکی باشە کەواتە بابڕۆین، تاقیشت دەکەمەوە بزانم ڕاستگۆ بوویت لەگەڵماندا.

فرانك: تکایە نامەوێت تۆش ببینم، کۆتایی هات بەهەموو شتێك.

ئەم قسانەی زۆر بە زەلیلی دەکرد.

ماکوان: ئەگەر کێشەکان کۆتایی بێت بە دڵنیاییەوە منیش حەزم بە شێوەت نییە و نامەوێت بتبینم، بەڵام سوێند دەخۆم ئەگەر شتێکی نەخوازراو ببینم

لەخۆت یان هاوكارەكانت ئەوەی بە خەیاڵتا نەهاتووە ئەنجامی ئەدەم. یاڵڵا جەماعەت با بڕۆین.

ئەو پلانەشمان دانابوو كە ئەگەر هاتوو تەلەفۆن بۆ پۆلیس بكەن، ئێمەش شتمان ئامادە كردبوو بۆ ئەوەی خۆمان دەرباز بكەین لە داوی ئەوانیش. باش بوو هیچ لەو بارەیەوە ڕووینەدا.

گەڕاینەوە و هەموو چووینەوە سەركاری خۆمان، بە كرۆنیكام وت كە كوێی پێ خۆشە بڕوات نیشتەجێ بێت و تەنها پلانی (سی) مابوو ئەنجامی بەین بۆ دڵنیایی كرۆنیكا، ئەویش بریتی بوو لەوەی كە كرۆنیكا جارێك خۆی نیشانی فرانك بدات، بزانێت چی ڕوودەدات.

ئەو كارەش بەس بوو كە تەنها من و میلاد و مام فەرهاد لەگەڵ كرۆنیكا دا لە شانۆیەكدا كاراكتەر بین.

دوای دوو هەفتە زانیمان كە فرانك دەچێتە كام قاوەخانە دادەنیشێت، یەكێك لەو ڕۆژانەی هەفتە بە تەنها كرۆنیكامان نارد كە لە قاوەخانەكە دابنیشێت و ئێمەش لە دەرەوە چاوەڕێی دەكەین و تەلەفۆنەكەی كراوە بێت لەگەڵمدا، ئەگەر خوانەخواستە شتێكی نەخوازراو ڕوویدا فریای بكەوین، بەڵام كە چووە ناو قاوەخانەكە بەتەنها قاوەیەكی داواكرد، پاش كەمێك فرانك و دوو هاوڕێی كە لەگەڵیدا بوون ڕۆیشتن. كرۆنیكا ئاگاداری كردمەوە لە ڕۆیشتنی ئەوان، بە كرۆنیكام وت دوای دە خولەكی تر تۆش هەڵسە بڕۆ، خۆشم چاودێری فرانك و هاوڕیكانیم دەكرد. وا هەستم كرد كەلە دەرەوە بۆسەی بۆ دابنێت، بەڵام شتی وا ڕووینەدا. كرۆنیكا لەویا بەتەنها پیاسەی دەكرد و تەماشی شتی دەكرد لە دوكانەكاندا، نزیكەی كاتژمێرێك لەویا سوڕایەوە پاشان من و مام فەرهاد و میلاد چووینە لای، هەستم كرد زۆر دڵخۆش و ئارام بوو.

ماکوان: تەواو خوشکی خۆم، ئیتر پێویستت بە ئێمە نەماو برۆ ئازادی تا کاتی ئەوە دێت کاکە میلاد کۆنتراکتی کارەکەی تریشت بەتاڵ دەکاتەوە بە پشتیوانی خوا.

کرۆنیکا: واتا ئیتر ناتان بینم و حەقتان نییە بەسەرمەوە؟

مام فەرهاد: کچی خۆم بۆ ناتبینین ئەگەر پێت خۆشە خۆت و دایکت وەرن من بەشێک خانووم هەیە، بەکرێ ئەتان دەمێ تا خۆتان پێتان خۆش بێت لەوێ بمێننەوە، دایکی بەڕێزت وەکو دایکم وایە تۆش دڵنیابە وەکو میلای کچم چاودێریت دەکەم، ئەگەر کاك ماکوانیش ڕازی بێت.

ماکوان: من نەك ڕازیم بەڵکو ئەگەر ئەوان ڕازی بن من زۆر مەمنونت دەبم، ئیتر ئەو دڵە ڕاوکێیەم نامێنێت.

کرۆنیکا: بەڕاستی من هەستم ئەکرد کە زۆر بێکەسم، بەڵام سوپاس بۆ خوا مادام ئێوەم هەن، چۆن ئەو پیاوەتیەت لەبیر دەکەم کەی دەتوانم بێینە ماڵەکەتان؟

مام فەرهاد: یەك هەفتەم بەرێ تا هەرچی کەموکورتی هەیە چاکی بکەم بۆتان، دوای ئەوە وەرنە ناوی.

ماکوان: بەڕاستی من زۆر خۆشحاڵ بووم بەم کارە خوای گەورە هەموو لایەك سەلامەت بکات.

بەمیلادم وت کرۆنیکا بگەڕێنەوە شوێنی خۆی، من و باوکت لە بازاڕ دەبین تا تۆ دەگەڕێیتەوە.

لەگەڵ مام فەرهاد بەیەکەوە چووین بۆ نانخواردن بۆلای مونیر، خواردن و کاتێکی خۆشمان بەسەر برد، هەندێك پرسیاری نوێژکردنی لێ پرسیم بۆم باسکرد، هەندێك باسی گەورەیی ئیسلامم بۆ کرد و ئەویش زۆر خۆشحاڵ بوو، میلاد گەڕایەوە باسی میلای بۆ کردم کە چەندە خۆشحاڵە و بەڕاستی ئەو چەند ڕۆژە هەموو خۆشحاڵ بوون.

بەردەوام بووم لە ژیانی ڕۆژانەی خۆم و چەند ڕۆژێکی مابوو بۆ بۆنەی لەدایك بوونی ئانای کچم، خێزانم تەلەفۆنی کرد وتی ئەمڕۆ دەچین بۆ بازاڕ دیاری بۆ ئانا دەکڕین بۆ ڕۆژی لەدایك بوونەکەی.

وتم باشە لەکار گەڕامەوە بەیەکەوە دەڕۆین، لە ڕێگا بووم هاوڕێیەکم بەناوی (گیولە) مامۆستای زانکۆیە لە بەشی زانستە سیاسییەکان، تەلەفۆنی بۆ کردم، ماکوان ئاگاداری ڕۆژنامەکانی ئەمڕۆیت؟

ماکوان: نا، چی بووە؟ چی ڕوویداوە؟ چی نووسراوە؟

گیولە: ئیتالیا حوکمی بەسەردا داویت.

ماکوان: چەندە حوکمەکەم؟

گیولە: نەنووسراوە، بەڵام وابزانم ٩ مانگە، لەگەل ئەو قسەکانم تەواو کرد، خێرا تەلەفۆنم کرد بۆ خێزانم وتم دەڵێن ئیتالیا حوکمی داوە بەسەرمدا ئاگاداریت؟

باران: ئاگادارم، بەڵام زۆر نادیارە، دەڵێن ٦-٩ مانگە.

ماکوان: واتا ڕوون نەکراوەتەوە چەندە؟

باران: تا ئێستا نا، زۆرت ماوە بگەیتەماڵەوە؟

ماکوان: زۆرم نەماوە خۆتان ئامادە بکەن دەرۆین بۆ بازاڕ، مادام وەعدم داوە بە ئانا دەبێت بڕۆین بۆ بازار، دوایی کە گەڕاینەوە زیاتر تەماشای ڕۆژنامە و هەواڵەکان دەکەین.

چووین بۆ بازاڕ و دیاریمان کڕی بۆ ئانا، بەڵام زۆر سترێس بووم نەمدەزانی چی ڕوو ئەدات، جارێکی کە تەلەفۆنم کردەوە بۆ گیولەی هاوڕێم، وتم هیچ زانیارپت دەستکەوت؟

گیولە: بەڵێ ئیتالیا سزای ٩ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپاندوویت.

ماکوان: لەکام ڕۆژنامە نووسراوە؟

گیولە: لە وێبسایتی ڕۆژنامەیVG

سوپاسی گیولەم کردو خوا حافیزیم لێ کرد، بە خێزانم وت ئەڵێت حوکمەکەم نۆ ساڵە، کەوای وت زۆر سترێس بووم بەڵام چارم نەبوو هیچ دەسەڵاتم نەبوو.

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە تەماشای هەموو دەزگا هەواڵیەکانی نەرویجم کرد هەموویان بڵاویان کردبووەوە کە ٩ ساڵ زیندانی دراوە بەسەر ماکوان کەریم لە وڵاتی ئیتاڵیا.

سەرچاوەی ڕووداوەکان لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە:

لە ساڵی ٢٠١١ زیاتر کارە ڕۆشنبیری و فیکري و بانگەوازم لەگەڵ مامۆستا کرێکار چڕ بوویەوە لەبواری دەزگای میدیایی و ماس میدیا و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا بەگشتی و تۆڕی پاڵتاك بەتایبەتی.

سایتێکمان دروست کرد، لەماڵی مامۆستا کرێکار بەیەکەوە باسی ئەم پێگە ئەلەکترۆنییەمان کرد کە دەیەوێت شتێك دروست بکات لە تۆرەکۆمەڵایەتییەکان بۆ پەروەردەکردنی کوردانی ئەوروپا، ئەویش بریتییە لە پەیمانگایەکی ئۆنلاین لە سێ قۆناغ. هەموو مەنهەج و کتێبەکانی بۆ باس کردم. ڕەوتی شاخ زیاتر بواری فیکری و عەقایدی لەخۆ دەگرێت، دوور دەبێت لەبواری سیاسی و کاری سیاسی، منیش هەموو ئامادەیی خۆم بۆ دەربڕی کە هاوکاری تەکنیکی و نووسین ئیدارەی دەکەم. دەستمان پێ کرد و مامۆستا لە ساڵی ٢٠١٢ دەستگیر کرا و من بەردەوام بووم لەگەڵیدا، هەر لەو ساڵەدا مامۆستا لە زیندان بوو کێشە دروست بوو لە نێوانی من و (خالید)ی برای مامۆستا.

مامۆستا نامەیەکی ناردە دەرەوە کە گوایە من لەکارکردن سڕکراوم و دەبێت ماوەی ٦ مانگ سزا بدرێم. کێشەکە لەوەدا نییە کە مامۆستا کرێکار وەکو برایەك یان مامۆستایەکی عەزیز تورە بێت لەمن، چوونکە بە دڵنیاییەوە ڕێزی دەگرم و قسەی ناشکێنم، بەڵام بەداخەوە ڕەوشەکە بەو شێوەیە بوو. ئەو ئێوارەیە من چووبووم بۆ زیندان بۆ سەردانی و بەیەکەوە بووین، قسەمان کرد و نێوانی من و ئەو زۆر ئاسایی بووو، بەڵام گرژییەکی زۆر لە نێوانی من و (خالید)ی برای ڕوویدا هەر لەوێدا کۆتایی هات.

بۆ ئێوارەکەی مانگی ڕەمەزان بوو بەربانگم کردەوە تەماشام کرد ئەو نامەیەی کە ئاماژەم پێدا لە پێگەی دووربین بڵاوکراوەتەوە کە گوایە من سڕ کراوم لەکار بۆماوەی ٦ مانگ دوورخراومەتەوە، کە بەداخەوە هەموو

ئەمەی ڕوویدا ویستی مامۆستا کرێکار نەبوو، بەڵکو ویستی خالید ڕەنجدەری برای بوو بۆ ئەو نامەیە.

لەبەر ئەوەی بەڵگە کەوتە دەستم کە مامۆستا و خالیدی برای دەیانەوێت بە نامە من بترسێنن و کوردستانم لێ قەدەغە بکرێت.

من هیچ گویم پێنەدا، وەڵامێکی کورتم داوە بەقەدەری نامەکەی جەنابی مامۆستا کرێکار.

لەو کاتەدا کە ئەو نامەیەی لەسەر قسەی خالید ڕەنجدەر هاتە دەرەوە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا وەکو (بەریتانیا، ئەڵمانیا، سوید، نەرویج، هۆڵەندا، ئیتاليا، سویسرا و بولگاريا) چاویان خستە سەر من و کاری مامۆستا کرێکار، لە دوای ئەم ڕووداوە کە نامەکە هاتە دەرەوە دەزگای هەواڵگری ئەوروپا بەگشتی هیچیان لەسەر من نەبوو، بەڵام گەڕانەوە بۆ ساڵەکانی ٢٠٠٩-٢٠١٢ فیلمی وایان دروست کرد کە نە من ئاگاداریم نە مامۆستاش، بەڵام خوای گەورە تۆڵە لە خەلکی بەغیل و ترسنۆك و خوێڕی و خۆویست بسەنێت کە ئەوان هۆکار بوون بە پلەی یەکەم، بۆ زیاتر وردەکاری و شیکاری ڕووداوەکان سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ کتێبی (مەملەکەتی زیندان) لەوێدا ورد و درشتی هەموو ڕووداوەکان باس دەکەم، پشتیوان بەخوا، ئەگەر تەمەن باقی بێت.

دەگەڕێمەوە ناو ڕووداوەکانی مەملەکەتی شەیتان، کە دڵنیا بوومەوە کە ٩ ساڵ حوکم دراوم، مامۆستا کرێکار ١٢ ساڵ حوکم دراوە، ئێوارەی ڕۆژی دووشەمە بوو تەلەفۆنم کرد بۆ جەنابیان.

من هەرگیز دڵم لە مامۆستا کرێکار نەیەشاوە، چوونکە دەمزانی کە منی خۆش دەوێت، هەموو جارێك دەیوت ئەگەر حیزبەکانی کوردستان

هەرچییان هەبێت من ماکوانم هەیە، هۆکاری ئەوەشی دەگێڕایەوە بۆ ئەوەی کە من حەزی کاری حیزبایەتی و سیاسیم نەبوو، زیاتر لە بواری مێژوو، فەلسەفە، فیکر و ئەدەب دا ئەسپی خۆم تاو دەدا، تەلەفۆنم بۆ کرد...

ماموٚستا: بەڵێ السلام علیکم

ماکوان: وعلیکم السلام، ماموٚستا دەنگوباست چۆنە؟

ماموٚستا بەپێکەنینەوە: کاك ماکوان دەیانەوێت لە ئیتالیا فێری پیتزای گوێ درێژمان بکەن (لە ئیتالیا باشترین گۆشت لای ئەوان، گۆشتی گوێدرێژە، ساڵانە بە ملیۆن تەن لە میسر و ئەفریقاوە هاوردەی وڵاتی ئیتالیا دەکەن).

ماکوان: بەڕاستی ماموٚستا نازانم چی بڵێم، جەنابت چی لێ تێدەگەیت؟

ماموٚستا: هەر زۆر قسەیەکی بێمانا و پڕ درۆ و فش و فیشاڵە، ئاخر خۆ من و جەنابت ئیتالیامان هەر نەبینیووە، هەست دەکەم یارییەکی سیاسییە و دژمان دەکرێت.

ماکوان: پێت وایە ڕادەستی ئیتالیامان بکەن؟

ماموٚستا: بڕوا ناکەم جارێ ئەوە زۆر دوورە، ئەگەر شتی واش بێت پێی دەچێت، دوای چەند خولەکێك لە قسەکردن ماڵئاواییم کرد و مەشغوڵ بووم بە نان خواردنەوە، هەمووی ٥-١٠ خولەکی نەبرد دوای ئەوەی تەلەفۆنەکەم لەگەڵ ماموٚستا داخستەوە خێزانم وتی ماموٚستا کرێکار دەستگیرکرا، مەشغوڵ بوو بەوەی کە سەیری هەواڵەکان و ڕووداوەکان بکات تا زانیاری زیاتر بەدەست بهێنێت بۆ من.

ماكوان: بە دڵنیاییەوە ئێستا دێن منیش دەستگیر دەكەن، بە دڵنیاییەوە دەمتوانی ڕابكەم، بەڵام بۆ كوێ، باشترین جێگا بۆ من نەرویج-ە، خۆ ئەگەر بگیرێم هاوڵاتی ئەو وڵاتەم. هەرچۆن بێت بەرگرییەك دەكات لە ڕەگەزنامەكەی، لەبەر ئەوە بەبیرما نەهات و بیرمان لێ نەدەكردەوە كە ڕابكەم، چوونكە لە نەرویج باشترین حەشارگە بوو بۆ من لە دەستی ئەو داواكردنەی ئیتالیا كە لە ڕێگای ئەنتەرپولەوە داوا كرابووم.

سەرم لێ تێك چووبوو نەمدەزانی چی بكەم، ناچار تەلەفۆنم كرد بۆ موخابەراتی نەرویجی، بۆ كەسیك كە كێشەكەی ئێمەی لەبەردەستدا بوو، لێم پرسی ئەگەر دەمگرن وەرن لە ماڵەوەم، تكا دەكەم با لەسەر كارەكەم و لەناو بازاڕدا دەستگیر نەكرێم.

فەرمانبەرەكە: نا، تۆ ناگیرێیت، تكایە با ژیانت ئاسایی بێت و چۆن ڕۆژانە چوویت بۆ سەركار هەروا بەردەوام بە، تۆ خاوەنی ڕەگەزنامەی نەرویجیت، نەرویج هاوڵاتی خۆی ڕادەستی هیچ وڵاتێك ناكات.

ماكوان: زۆر باشە، سوپاس بۆ زانیارییەكانت. هێوربوومەوە، بەڵام خەمی مامۆستا كرێكارم بوو، لەدوای ئەوەی پارێزەرەكەی لێدوانی دا و وتی ئەم پرۆسەیە زۆر دەخایەنێت، من زیاتر دڵنیا بوومەوە كە ئاستەمە مامۆستاش ڕادەستی ئیتالیا بكرێت. بەردەوام بووم لە كاروباری ڕۆژانەی خۆم و وەكو جاران بەردەوام بووم لە كارەكەی خۆم، خەڵكێكی زۆر لە دۆستان و هاوڕێیان تەلەفۆنیان كرد، بەڵام هەرچی مولحید و خوانەناس و هەرچی پەرچییە بوو ئاهەنگ و خۆشیان دەگێڕا لە خۆشی ئەوەی كەوا من ٩ ساڵ حوكم درابووم لە ئیتالیا، هەفتەیەك تێپەڕی و ئێوارەی شەممە بوو لایڤێكم كردەوە لە فەیسبوك وتم: مولحیدەكان خۆشحاڵن بەوەی كە ٩ ساڵ زیندانیم لە ئیتالیادا بەسەردا سەپێنراوە، بەڵام من لە خزمەتی

موسوڵماناندام و کام مولحیدی خاوەنی جورئەتە فەرموون وەرن بۆ گفتوگۆ و دیبەیت.

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار کام مولحید و خوانەناسەکان دەهاتن بۆ گفتوگۆ و دیبەیت بەسەر شۆڕییەوە دەگەڕانەوە و پاشان قسەکانیان دەبووە جێگای کۆمیدیای خەڵکی موسوڵمان.

وا پەیم برد لەدوای ئەو ڕووداوە زۆربەی خەڵکی لێم دوور دەکەونەوە و دەترسێنن، بەڵام ڕێك پێچەوانەکەی ڕاست دەرچوو، زیاتر لە جاران موسوڵمانان هاوکارم بوون، ستافەکەم ئەوەندە بەهێز بوون لە هەموو بوارەکانی کاری میدیا و ڕۆژنامەوانی بۆ بانگەواز و کاری فیکری و چاپی کتێب و دەزگای میدیای (بزاڤ) کە دەزگایەکی میدیایی بوو زیاد لە ٥٠-٦٠ ڕاپۆرتی فیکری و مێژووی و ناساندنی مولحیدەکانی دروست کرد کە بەشەکان بریتیبوون لە مۆنتاژ، نووسین، بڵاوکردنەوەی چالاکییەکان لەڕادەبەردەر بوون. لەگەڵ ئەوەی فشاری مولحیدەکان زۆر بوو لەسەرمان، نەك بە هۆکاری فیکری و توانای ئەقڵیان، نا، بەڵکو بەهۆکاری ئەوەی پارەیان ئەدا بە فەیسبوك و خەڵکی پرۆفشناڵ هاوکاری دەکردن بۆ سووتاندن و باندکردنی پەیج و ناوی فەیسبووکەکانمان، بەڵام سوپاس بۆ خوا هیچ کاریگەری ئەوتۆی دروست نەکرد لەسەرمان، بەڵکو بگرە بەهێز تر بووین. ئێوارەیەك بۆ نوێژی عەسر ڕووە و مزگەوت دەڕۆشتم لە ڕێگا وەرماشم لێ پەیدابوو.

وەرماش: سڵاو ماکوان، بەردەوام دڵت لێم عاجزە؟

ماکوان: ها، چیت دەوێت و چیت لە ژێر سەردایە، دوژمنی خوا؟

وەرماش: ئەو ٩ ساڵەی زیندانەکەتم زۆر پێ ناخۆش بوو. بەڕاستی نازانم چۆن هاوخەمت بم و هاوکاریت بکەم.

ماکوان: پێویستم بەهاوکاری تۆ نییە، هیچم ناوێت.

وەرماش: ئێ خۆ تۆ فرانکت زەلیل کردووە، چی ترت بۆ بکەم؟

ماکوان: وەکو وتم هیچم ناوێت.

وەرماش: ئەی ناتەوێت لەم کێشەی ئیتالیا ڕزگارت بێت؟

ماکوان: بۆ من هیچ کاریگەری نییە، من خاوەنی ڕەگەزنامەی نەرویجیم لەبەر ئەوە پێویست ناکات سەری خۆمی پێوە واڵ بکەم و پەیمانیشیان داوە پێم کە من ڕادەستی ئیتالیا ناکرێم، لەبەر ئەوە پێویستم بەهاوکاری نییە، لە بیری بکە.

وەرماش: ئاخر لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان قورسی بکەن لەسەرت با کۆتایی پێ بهێنین.

ماکوان: بڕوا ناکەم خۆ ئەگەر هەر قورسیان کرد لەوانەیە لە نەرویج سەرلەنوێ ئەم کێشەیە بۆ من بکەنەوە و منیش دەزانم لە ڕووی یاساوە هیچ یاسایی نییە و منیش باش دەتوانم بەرگری لەخۆم بکەم، وەکو وتم فشار بۆ خۆت مەهێنە بیری لێ مەکەرەوە چوونکە من بیری لێ ناکەمەوە.

وەرماش: باشە من دەڕۆم کاتێکی خۆش.

ماکوان: خۆشتر، خوا ئەکات تۆ دەڕۆیت.

لەبەرچاوم ون بوو، چووم بۆ مزگەوت، دوای دوو ڕۆژ حاجییان دەردەچوون بۆ حەج، چووم بۆ فڕۆکەخانە بۆ بەڕێکردنی کاوە، فاتمە خانم و کرۆنیکا، ئەوانم بەرێ کرد، دیسان سەرقاڵ بوومەوە بە ژیانەوە، بەڵام بەداخەوە بۆم نەبوو لە نەرویج دەربچم، چوونکە لەلایەن ئیتالیاوە داوا کرابووم، لەلایەن پۆلیسی ئەورۆپول لە هەرجێگایەك دەستگیر بکرامایە ڕادەستی ئیتالیا دەکرام.

منیش بە سروشتی خۆم حەزم بە گەڕان و سەفەرە، هەموویم لێ قەدەغە کرابوو ئەلبەت دەمتوانی بچمە وڵاتانی ئاسیا و ئەفەریقا، بەلام ئەوروپام لێ قەدەغە کرابوو ئەگەر بە فڕۆکە سەفەرم بکردایە، بەڵام گەشتی زەمینی سەفەرم دەکرد بۆ سوید و دانمارك ئاسایی بوو هیچ کێشەم نەبوو.

چەند جارێك کاوە و کرۆنیکا بەجیاواز تەلەفۆنیان بۆ کردم کە کتێبم بۆ بهێنن و پرسیاریان دەکرد دەربارەی حەج و دروشمەکانی، بەڵام هەستم دەکرد کە کرۆنیکا زۆر زووتر تێدەگات و شتەکان لەبەر دەکات، کاوە تەلەفۆنی بۆ کردم وتی دووجار کرۆنیکامان بردووە بۆ نەخۆشخانە زوو زوو دەبورێتەوە.

ماکوان: هیچ نییە بەو گەرمایە ڕانەهاتووە، خۆم پەیوەندیم پێوە کرد وتم چییە دەڵێن بەتەمای بمریت!؟

کرۆنیکا: نازانم دووجار سەرم گێژی خوارد ماڵی کاك کاوە ئاوابێت، بەخوا ئەو نەبوایە دەکرام بەژێر پێوە، خوای گەورە لێی ڕازی بێت هاوکاری دایکمە.

ماکوان: کاوە کوڕێکی زۆر باشە و دڵسۆزە.

من شتێکی ترم لە مێشکا بوو، وتم بەڵکو خوا بکات دڵیان بچێت بەیەکدا و داوای بکەم بۆ کاوە.

کرۆنیکا: ئەرێ بەخوا هەتا بڵێیت کوڕێکی بەڕێز و خواناسە و بەخوا لە ئاواتی برام زیاترم خۆش دەوێت.

بۆی باسکردم کەوا ئێستا لە مەککەن و دوای جەژن ئەچن بۆ مەدینە.

ماکوان: لە عەرەفات لە سەفا و مەروە لە حەوشی کەعبەدا دوعای خێر زۆرم بۆ بکە بەتایبەت لای دەرگای کەعبەوە لەوێدا ژێر عەرشی خوای گەورەیە، کۆرنیکا زۆر دوعام بۆ بکە باشە خوشکی خۆم؟

کرۆنیکا: باش.

ماکوان: باشەکەت سارد و سڕە، یاڵڵا با کاتت نەگرم بڕۆ خەریکی عیبادەت بە و بەینت لەگەڵ خوا چاك بکەرەوە، ئیتر لە عەرەفات وەکو ئەو ڕۆژەت لێ دێتەوە کەلە دایك بوویت، خوای گەورە پاکت دەکاتەوە لە هەرچی تاوانە، بەڵام بەو مەرجەی تۆبە بکەیت.

کرۆنیکا: بەخوا پێش خۆم و کەسوکارم دوعام بۆ تۆ کردووە.

ماکوان: مالت ئاوا بێت، خوای گەورە پاداشتت بداتەوە، داوایەکی تریشت لێ دەکەم بە قسەم بکە باشە؟

کرۆنیکا: تۆ هەرچی بڵێیت قسەت ناشکێنم.

ماکوان: تەلەفۆن بکە بۆ باوکت و ئاشتی بکەرەوە لەبەرخوا، چوونکە باوك زۆر گەورەیە، ئێستا پیر بووە لەوانەیە زۆر پێویستی بەو تەلەفۆنە بێت تۆ بۆی دەکەیت.

کرۆنیکا: هەر ئێستا تەلەفۆنی بۆ دەکەم کە لەگەڵ تۆ تەواو بووم.

ماکوان: دە خوات لەگەڵ تەلەفۆن بۆ باوکت بکە و بزانە ئەوەش هەر عیبادەتە.

لەدوای ئەوە تەلەفۆنەکەم داخستەوە یەکسەر مام فەرهاد تەلەفۆنی کرد وتی دەمەوێت بتبینم.

کاتمان دیاری کرد هات بۆ ناو بازاڕ لەوێ یەکتری ببینین، لە دڵی خۆمدا وتم بەخوا شتێك ڕوویداوە.

مام فەرهاد: سڵاوت لێ بێت بە سڵاوی ئیسلام (السلام علیکم).

ماکوان بەپێکەنینەوە: وعلیکم السلام دەنگو باست، میلاد و میلا و دایکیان چۆنن باشن شووکر؟

مام فەرهاد: وەڵڵا هەموو باشن هەواڵت دەپرسن، سڵاویان بۆت هەیە، ماکوان: دەنگو باسی میلای کچت، چاوی چۆنە؟

مام فەرهاد: بەخوا وەکو ئەوە وایە هیچ ڕووی نەیابێت، ئەو ڕۆژە بردمە لای دوکتۆرەکەی هەرچی سەری هێنا و برد لێی تێنەدەگەیشت چاوی چۆن چاك بۆتەوە، عەیبی نەماوە، تا لە کۆتاییدا وتم قورئان چاکی کردۆتەوە.

ماکوان: الحمدالله یاخوا هەر باشبیت، ئەی میلاد چۆنە لەگەڵ وەرزشەکەی؟

مام فەرهاد: خەمی میلادت نەبێت، ماشاءالله لاشەی ئەڵێی بەردە. خۆشم سەرسامم پێی. هیلاك نابێت لاشەی زۆرباشە سوپاس بۆ خوا. وەزنی خۆشی دابەزاندووە لێی مەترسە، ئەوەی لە مێشکتدایە ئەنجامی ئەدات بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

ماکوان: ئەی سوپاس بۆ خوا، ئەی خۆت چۆنی وەزعت چۆنە؟

مام فەرهاد: زۆر زۆر بێتاقەتم، زۆرم حەز ئەکرد بچم بۆ حەج لەگەڵ فاتە خان و چیمەنی کچي، ئەمڕۆ زۆر بێزار بووم وتم بابڕۆم بۆ لای خاڵە ماکوان.

بەخوا لای تۆ ئارامیم دەست دەکەوێت، بۆیە تەلەفۆنم بۆ کردیت خۆ لەکاتم نەگرتویت.

ماکوان: نەوەڵڵا برا هیچ کارم نییە، نیازم هەیە بڕۆم بۆ مزگەوت و نوێژی عەسر بکەم دوای ئەوە هیچ کارم نییە، پێت خۆشە دەچین بۆ ماسی گرتن یان دەچین بۆ سوید بۆ کەباب خواردن، ئیختیارت هەیە.

مام فەرهاد: ڕۆحەکەی خاڵە ماکوان، تۆ چی دەفەرموویت وا دەکەین.

بڕیارماندا بڕۆین بۆ مەرزی سوید بۆ کەباب خواردن، لەڕێگا قسەی خۆشم بۆ دەکرد و ئەویش قسەی خۆشی بۆ دەکردم، زۆری حەز لێبوو کە بچێت بۆ حەج.

بۆم باسکرد کە جارێك بایەزیدی بەسطامی دەیەوێت بڕوات بۆ حەج، بەڵام ئەو پارەیەی کە کۆی کردۆتەوە دەڕوات دەیدات بە ماڵێکی هەتیو، ناچێت بۆ حەجەکە، لە ڕاستیدا پارەکەش زۆرە کە دەیبەخشێت، دەچێت بۆ مزگەوت لەناو خەڵکیدا سەرزەنشتی دەکەن، هەموو دەڵێن ئێ هەموویت نەبەخشیایە بەشی سەفەرەکەت هەڵگرتایە، ئەویش بەهێواشی لە مزگەوتەکە دێتە دەرەوە دەڵێت سوپاس بۆ تۆ خوای پەروەردگار ئەو خەڵکە هەمووی لە من باشترە.

مام فەرهاد: سبحان الله لە ئیمانی ئەو پیاوە، تەنانەت سوپاسی خوا دەکات کە خەڵك لەو باشترە.

ماکوان: دەزانی ئەو کوڕە هەتیوەی کە پارەکەی پایە دوایی کێ دەرچوو؟

مام فەرهاد: نەبەخوا نازانم کێ دەرچووە؟

ماکوان: (نظام الملک) دەوڵەتی عەباسی کە دوایی هەموو خەلافەتی عەباسی ڕزگار کرد لە دەستی شیعەی عوبێدی و خاچ پەرستان و شیعەی حەشاشینەکان.

مام فەرهاد: بۆ شتێك هاتووم بۆلات نازانم چۆن بۆت باس بکەم.

ماکوان: چی بووە براکەم هیچت پێویستە؟

مام فەرهاد: خۆشی تۆم دەوێت، بەڵام نازانم بڵێم چێ خەجاڵەتی لای باران خانیش دەبم.

ماکوان: چی بووە قسە بکە، دڵم خەریکە ئەتەقێ.

مام فەرهاد: وەڵڵاهی دایکی چیمەن خان ڕایسپاردووم بۆ شتێك، نازانم چۆن باسی بکەم.

ماکوان: پارەیان پێویستە.

مام فەرهاد: نا، تۆیان پێوستە، دەیوت بە ماکوان بڵێ کرۆنیکای کچم بهێنێت.

ئەو ماکوانی زۆر خۆش دەوێت و ماکوانیش وەکو خوشکی خۆی تەماشای دەکات.

ماکوان: دەی وەڵامەکە دراوەتەوە، من وەکو خوشکی خۆم خۆشم دەویت، لێت ناشارمەوە ئەو ئافرەتە جوانە و ئێستا جوانترە لەبەر ئەوەی خواناسە، خەڵکی زۆر لەمن باشتر و خواناستری دەست دەکەوێت، مام فەرهاد من باران-م خۆش ئەوێت تا ئەو بەمن ڕازی بێت لەم حاڵەتەدا من ژنی تر ناهێنم، ئەگەر ڕازی نەبوو و ژیانی لەگەڵ من نەگونجا ئەوکات بیری لێ دەکەمەوە، بەڵام ئێستا من خاوەنی دوو منالْم ٩ ساڵ حوکم دراوم، ئاخر چۆن بیر لە ژن هێنان دەکەمەوە، ئەنجا باران قبوڵی ناکات ئەمە ئەوروپایە کوا لێرە ئەو ڕۆشنبیرییەی فرە ژنییە هەیە؟ وەڵلا بزانێت ژنم هێناوە ئەگەر کیسەی خەویشم باتێ باشە، لەبەر ئەوە نا کە دەترسم لەباران ژن ناهێنم، بەلکو دەترسم خانەوادەکەم تێك بچێت، ئەوەندە کەسێکی شەهوانی و چاو لەدەرەوە بوو بۆ ئافرەت نیم، هەر ئافرەتێکی جوانم بینی خێرا بڵێم ئەیهێنم، بەتایبەت لە ئەوروپا دروستکردنی خێزان ئەوەندە ئاسان نییە.

مام فەرهاد: ئەی ئافەرین، بڕوابکە جار لەدوای جار خۆشەویست تر دەبیت لەلام، با بەڕاستی شتێکی تریشت پێ بڵێم، ئەو دەیوت من ڕازیم ماکوان بمهێنێت و ئاشکرام نەکات.

ماکوان: دیارە ئەم جارە قسەی چیمەنم بۆ دەکەیت، وایە؟

مام فەرهاد: بەڵێ، وایە لای دایکی ئەو قسەیەی کرد وتی ئامادەم شووی پێ بکەم، بەنهێنی و ئاشکرام نەکات، نامەوێت شەوان بێتەوە بۆ لای من با هەر لەماڵی خۆی بێت.

ماکوان: قسەکەی هیچ نییە، سەرەتا وا دەڵێت، بەڵام کەبوو بە خێزانم دەزانم مێشکم کون دەکات، مام فەرهاد گیان خۆم دەردم کەم نییە، نامەوێت دەردی تر بۆ خۆم زیاد بکەم، بلێ ماکوان دەیوت تاماوم مەمنونی ئەو هەڵوێستە باشەم کە منیان بە شایستە زانیوە بۆ ئەوەی هاوسەرگیریم لەگەل بکات، دەستی فاتمە خانم ماچ دەکەم وەکو دایکم وایە، بەڵام تا ئەم ساتە وەختە لەگەڵ جەنابت قسە دەکەم بیرم لێ نەکردۆتەوە ژن بهێنم، هەر کات بیرم لێ کردەوە ئەو شووی نەکردبوو و بەتەمای ژن هێنان بووم ئەوە ئەو یەکەم کەس ئەبێت کە بچمە داوای، بەڵام ئەوەش نەک هەر دوورە هەست دەکەم ئەستەمە.

مام فەرهاد: گەورەیت دەگەیەنم بابێنەوە لە حەج لە خزمەتیاندا باسی هەمووی دەکەم.

## خۆ ئامادەکردن بۆ سیمینارێك لای جنۆکەکان

پەیامەکەم لەلایەن مام فەرهادەوە پێگەیشت، وەڵامەکەیم دایەوە کە من بەتەمای ژنهێنان نیم، بەڵام زۆر بەرز نرخاندم. ئەوە جێگای ڕێز و حورمەتە ئافرەتێك ئامادە بێت بۆ دروستکردنی خێزان لە ڕێگای پەیوەندی خێزانی و شەرعی بۆیە زۆر بەڕێزەوە بەمام فەرهادم وت کە گەڕانەوە لە حەجەکەیان ئاگاداریان بکەرەوە، بەڵکو جەنابت برا گەورەی من بەو کۆتایی پێبهێنە.

مام فەرهاد: دەمەوێت شتێکت پێ بڵێم ئەمەیان پەیوەندی بەخۆمەوە هەیە.

ماکوان (بەپێکەنینەوە): ناشێ تۆ نەتەوێت ژن بهێنیت؟

مام فەرهاد: کورە ژنی چی برا گیان، خوای گەورە گلارەم لێ نەسێنێت تازە کەی من لەڕێگای ژن هێنان ماوم.

ماکوان: خێر ئەمرکە.

مام فەرهاد: کە موسولمان بووم نازانم ئاشکرای بکەم چوونکە هیچکام لە خزم و کەسوکارم نازانن، ئاشکرای بکەم یان هەر نهێنی بێت؟

ماکوان: مام فەرهادی عەزیز کوا ئێستا خەڵکی لەو شتە دەپرسێتەوە، من پێم وایە ژیانی ئاسایی خۆت بکە و هەرباسی مەکە، خۆ گریمان زانیان کە موسوڵمان بوویت زۆر بە ئاسایی وەریبگرە، با ئەوان باسی بکەن تۆ وەکو

موسوڵمانێك لەگەڵ کەسوکاری خۆت بژی، ئەگەر پرسیان وەڵامدانەوەی زۆر ئاسانە.

مام فەرهاد: بڕوا بکە هەروا ئاسان نییە، ئاخر چی بڵێم؟

ماکوان: بڕوا بکە زۆر ئاسانە، سەرەتا تۆ لەناو کۆمەڵگەی یەرسانییەکاندا نیت، پاشان ئێرە ئەوروپایە. پێم بڵێ چەند یەرسانی نەك هەرباوەڕی بە ئایینی یەرسانی نییە، بگرە هەر مولحید و بێ دینیشە، مەگەر وانییە؟

مام فەرهاد: بەڕێوەڵڵا، زۆربەی ئەو یارسانییانەی کە من ئەیانناسم هەر باوەڕیشیان بە خوا نییە.

ماکوان: ئەی ڕەحمەتت لێبێت، خوای گەورە هیدایەتی یاویت و بەچاوی خۆت شیفای کچەکەت بینیووە، بۆچی بەڕاستگۆییەوە بۆیان باس ناکەیت کە پرسیاریان لێ کردیت بۆچی موسوڵمان بوویت و ئیسلامت هەڵبژاردووە؟

مام فەرهاد: فەرمایشتەکەت زۆر ڕاستە و حەقی خۆیەتی.

ماکوان: من ناڵێم بڕۆ خۆت بکە بەبانگخواز و جاڕی بۆ بدە، خۆ ئەگەر لەتواناتا هەبێت کارێکی باشە، من دەزانم تۆ کەسێکی بەڕێز و بێدەنگیت و خەریکی ژیانی تایبەتی خۆتیت، پێویست ناکات زۆر بیر لەو باسانە بکەیتەوە، دڵنیام خەڵك ئەوەنەی بە دوای سەروەرت و سامان و پارەوەن ئەوەندە بە دوای ئاینەوە نین.

مام فەرهاد: وەڵڵا ڕاستە برا وایە، خەڵک بەگشتی سەرقاڵی زندەگییە.

ماکوان: من باسێکت بۆ دەکەم بۆ ئەوەی تۆ بەو باسە بتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە قەبەیەی خەڵکی بدەیتەوە کە بۆ ئیسلامت هەڵبژاردووە.

مام فەرهاد: وەڵڵاهی مەمنونت دەبم، ئەوە گوێم بۆ گرتوویت.

ماکوان: بڕوا بکە لە ژیانی ئەم ماکوانەدا، نەباوکم، نەدایکم نە مام و پوور و کەسوکارم ڕۆژێك لە ڕۆژان بەمنیان نەوتووە نوێژ بکە. یان دینداری بکە و خواناس بە. لەڕاستیدا وتوویانە سیاسەت مەکە، ئامۆژگارییان کردووم کە کەسێکی باش بم و دەست پاك و داوێن پاك و چاکەخواز بم، نەك بۆ ئەوەی خوا لێم خۆش بێت، نا..

بەلکو لەبەر ئەوەی کوڕی پیاوێکی باش و ناودار بووم، باوکم پیاوێکی خۆشەویست بوو لەناو خەلکیدا. ئاوات و ئامانجی کەسوکار ئەوەبوو کە جێگای باوکم بگرمەوە و وەکو ئەو سەرڕاست و دەست پاك و هاوکاری خەڵك بم، ئەوەی باسی دەکەم ساڵی ۱۹۹۲-۱۹۹۹ ژیانم وەکو هەموو گەنجێك بردوەتە سەر، بەڵام لەکۆتایی ساڵەکانی ۲۰۰۰ دنیایەك پرسیارم بۆ دروست بوو، زۆرم دەخوێندەوە لە کتێبی فەلسەفی و فیکری و سیاسی، فیکری سیاسی و ئەدەب و شیعر و شانۆ و زۆرێك لەبوارەکانی تر...هتد.

مام فەرهاد: ئەی مێژووت دەخوێندەوە؟

ماکوان: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە مێژوو خولیای منداڵیم بوو، بەهەرحاڵ ڕۆژی وا هەبوو ۷-۸ کاتژمێرم بە خوێندنەوە بەسەر دەبرد، دەچووم بۆ کتێبخانەی گشتی ئۆسلۆ لەوێ دائەنیشتم بە پێنج سەعات بەس خەریکی خوێندنەوە بووم.

ئەوەی ڕۆشنبیر و سیاسی و دانشمنەد و خاوەن فیکر بوایە حەزم بە هاوڕێیەتی دەکرد، کۆمەڵێک هاوڕێی زۆرم هەبوو لەهەموو بوارەکاندا لەهەموو چین و توێژەکان هاوڕێم پەیدا کردبوو، لە مەسیحی، یەهودی، زەردەشتی، مارکسی، لە بێ دین، وجوودی، هونەرمەند، گۆرانی بێژ، نووسەر، ڕۆژنامە نووس و دوکتۆر...هتد.

ڕۆژ بەرۆژ مێشکم ئاڵۆز دەبوو، یەك دنیا پرسیار لە مێشکم دابوو.

دەموت داخۆ من بۆچی دروست بووم، کارم چییە؟ چیم پێ سپێردراوە؟ بۆچی هاتووم؟ بۆ کوێ دەچم؟ دوای ڕۆیشتنم لەکوێوە سەردەردەهێنم؟ مردن چییە؟ ڕۆح چییە؟ خوا چییە؟ پێغەمبەر چییە؟ یەك دنیا پرسیار چییە لە مێشکمدا بوو دەخولانەوە، خۆم بەدەوری خۆمدا دەخولامەوە. نە مارکس و لینین، نە جیڤارا و جان جاك ڕۆسۆ، نە ژان پۆل سارتەر، نە ئەسمۆن دیبۆفوار، نەکانت و دیکارت و ..هتد کەسیان نەیانتوانی تونیوێتی فیکر و برسێتی ئەقڵم تێر بکەن.

بۆ زانیاریت من هەرکەسێکی موسوڵمان بووم ئەوکاتەش، بەڵام موسوڵمانێکی کلاسیکی و ئاسایی بووم، وام دەزانی دین بۆ بونیاتنانی کەسایەتیە و بۆ ئەوەیە بڵێن کوڕی چاکە و خەڵکی متمانەم پێ بکەن و بڵێن ماشاءالله خاوەنی شەخسیتیە. من ئاوا لە دین تێگەیشتبووم.

وردە وردە بەدوای خۆمدا گەڕام تا خۆم دۆزییەوە، ئەو پرسیارانەی کە لام دروست بوو بوو، تەنها ئیسلام وەڵامی دایەوە، ئیسلام توانی من دروست بکات. وا نەزانیت وەکو ڕازی بوون من زۆر لەخۆم ڕازیم، نا- من ناڵێم کەسێکی باشم، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئیسلام باشی کردووم، ئیسلام گۆشی کردم.بڕوا بکە یەك کەس نەیتوانیوە ئەمرێکم بەسەردا بکات جێبەجێی بکەم، بەخوای گەورە کە دەیانوت ماکوان شەڕ مەکە. مەبەستم

کەسوکارەکەمە، من زیاتر شەرم دەکرد، دەیانوت لەسەرخۆبە، من زیاتر بەقسەی کەسم نەدەکرد. نەگبەت و وێڵ و سەرگەردان، ئەوەی گوێم پێ نەئەدا قسەی خەڵکی باش بوو.

بەڵام ئیسلام کارگەی دروستکردنی مرۆڤی چاکە، قەسەم بە خوا ئیسلام و کاریگەریی ئایین نەبێت لە جیهاندا دەزانی چ کارەساتێك ڕوونەدات، ئەگەر ترسی ئایین و خواناسی و خەڵکەکەی نەبێت تەماشای ئەم جیهانە بکە لە چ گومڕایی و جاهیلییەکدایە.

مام فەرهاد: بەخوا برا قسەکانت هەر زۆر ڕاستە، ڕەحمەتت لێبێت قسەم بۆ بکە.

ماکوان: تۆ تەماشای ئەم ئەوروپا پێشکەوتووە بکە کە ئێمە وامان دەزانی بەهەشتە، لەم بەهەشتەدا چی تێدایە. نێربازی، مناڵبازی، یاری کردن بە هەست و سۆزی خەڵك، نەمانی خەڵك، خۆشەویستی پارە و ژیان بۆ پارە و مردن لەتاو بێکەسی، نەمانی متمانە، بێ دینی و خوانەناسی، تەماشاکە سکمان تێرە جلوبەرگمان پۆشتەیە، بەڵام دەترسین، لە چی دەترسین نازانین؟.

مام فەرهاد: وەڵڵاهی من هەمیشە لە ترسدام، ئەو ترسە چییە نازانم. بەخوا دەڵێی قسەی دڵی من دەکەیت.

ماکوان: هەر من و تۆ نین، نەرویجی و ڕۆژئاوایی و ئەوانەی وەکو ڕۆژئاوایی بیردەکەنەوە هەموو وان. عەزیزەکەم مام فەرهاد چەند مامە پیرەی بەڕێز لەولاتی ئێمەدا بەیانی دەچێتە دەرەوە شقارتە دەفرۆشێت، یان تەزبیح دەفرۆشێت، یان دوو سەلك سابون بەدەستیەوەیەتی بۆ ئەوەی بیانفرۆشێت. دەگەڕێتەوە ماڵەوە لێی بپرسە وەزعت چۆنە دوای ئەوەی

٣٠٠٠ دیناری دەست كەوتووە؟ دەڵێت خوا نەیبڕێت، خوا ڕازقە. كڵاوی بۆ بەڕوو كردووە. بەڵام تەماشای ئێمە بكە مانگی ٣٠ وەرەقەمان دەست دەكەوێت. یەك مانگ كارمان نەمێنێت هەموو دەچین بۆ سۆسیال و دڵەراوكێمان تێدەكەوێت، دەزانی بۆ؟

مام فەرهاد: بەڕاستی وایە، بەڵام بۆ؟

ماكوان: وەڵامەكە ئاسانە، كڕینیماڵمان بە قەرزی بانكە، سەیارەمان هەروایە، خواردنمان نازانین حەڵاڵە یان حەرامە، جارێ گوێ بە حەڵاڵ و حەرام هەر نادەین. ئەوەیە هۆكاری ترس و دڵەڕاوكێكەمان. بێجگە ئەوەی ئەم سیستەمەی ڕۆژئاوا منداڵمان ئەبات، ژیانمان دەبات، هەست و سۆز و عاطیفە و دین و شەرەف و كەرامەتت دەبات، تەنها بۆ ئەوەی سكت تێر بێت و ڕازی بیت. ئەوەیە هۆكاری ترسەكە.

مام فەرهاد: زۆر وایە و فەرمایشتەكەت ڕاستە.

ماكوان: جا ئەم گەنگەشەیەم بۆیە كرد لەگەڵ بەڕێزت بۆ ئەوەی بزانین هیج بەرنامە و ئایین و سیستەمێك و هەموو زانستی دنیا و تەكنەلۆجیا و ژیار و شارستانییەت و كلتۆرێك ناتوانێت وەڵامی پرسیارەكانمان بداتەوە، تەنها و تەنها ئیسلام دەتوانێت وەڵاممان بداتەوە پێمان بڵێت بۆچی هاتوویت، بۆ كوێ دەچیت، كارت چییە، مردن چییە، دوای مردن چی ڕوودەدات و چی دەكەیت، خوا كێیە، دین چییە. هەموو وەلامەكان ئیسلامە و ئیسلام. ئەمەش باشترین وەڵامە بۆ ئەو كەسەی دەڵێت بۆ موسوڵمان بوویت، تۆش دنیایەك بەڵگەت پێیە.

مام فەرهاد: زۆر ڕاستە، ڕەحمەت لە كاك عبدالكریم كە تۆی هێناوەتە ئەم دنیایە، ئەڵبەت مەبەستم ئەوەیە كە ئەو هۆكار بووە.

ماکوان: خوا جەزات باتەوە مام فەرهاد گیان، دابەزە با بڕۆین کەبابەکەمان بخۆین.

لەگەڵ مام فەرهاد نانمان خوارد و بەدەم قسەی خۆشەوە گەڕاینەوە، ماوەیەکی پێچوو هەموو دۆستان و هاوڕییان و خوشکو براکانمان لە حەج گەڕانەوە، کاوە نازناوی حاجی کاوەی بۆ خۆی هەڵگرت، ڕۆژی سێ جار دەیگێڕایەوە کەلەوێ چی کردووە و چەندە خۆش بووە.

ئێوارەیەکی سەرەتای پاییز گەڵای دارەکان دەستیان کردبوو بە وەرین، ڕێگاو بان بە گەڵای دارەکان ڕازێنرابوونەوە، حەزقیلم لێ پەیدا بوو.

حەزقیل: بۆ کوێ دەچیت؟

ماکوان: لە نوێژی عەسر بووم، تۆ کوێت پێخۆشە بۆ ئەوێ دەچین.

حەزقیل: هاتووم بۆلات لەگەڵ سەسیل ومیا، شێخ بەرقان وتی بە ماکوان بڵێن با خۆی ئامادە بکات لەم هەفتەیەدا کۆڕەکەی بۆ دەگرین.

ماکوان: بەخۆشحاڵییەوە حەزە گیان، بەڵام باسی چی بکەم ئێوە داواتان هەیە لەسەرچی. لەژیانمادا کۆڕم بۆ جنۆکە نەگرتووە، باسی چی بکەم، هیچ ناونیشانێك لای ئێوە ئامادەیە، یان خۆم ئازادم.

لەم قسانەدا بووم سەسیل و میا سڵاویان کرد بە سڵاوی ئیسلام و وەڵامی ئەوانمان دایەوە و بەیەکەوە بەرەو کەناری دەریا ڕۆشتین.

حەزقیل: شێخ بەرقان وتی بە ماکوان بڵێن باسی ڕۆڵی ئێمە بکات لە ئیسلامدا.

ماکوان: جا وەڵڵاهی نازانم ڕۆڵی ئێوە چی بووە لە ئیسلامدا، هیچ سەرچاوەیەکم لانییە لەو بارەیەوە هیچم نەخوێندۆتەوە.

سەسیل: هەوڵ بدە بزانە کام کتێبە باسی جنۆکە دەکات لەوە زیاتر دەربهێنە.

ماکوان: ئاخر خۆ سەلەی برام ئێوە بەرجەستە نین تا کتێبتان لەسەر نووسرابێت.

میا: ئێ وەرە بۆ کتێبخانەی (لازین) لەوێ زانیاری زۆری لێیە.

ماکوان: جا ئەمە لەکوێ یە و من چۆن بگەمە ئەوێ؟

حەزقیل: ئەوە بیرۆکەیەکی باشە، بەڵام کتێبەکانی ئێمە وەکو کتێبی ئێوە نییە، وەرەقە و یەك لەدوای یەك هەڵیان بەینەوە هەست دەکەم قورس بێت.

سەسیل: دەتوانیت سوود وەربگریت لە هەندێك لە کتێبەکانی کتێبخانەی (لازین)بەڵام وەك حەزقیل وتی دەبێت بزانیت چۆن بتوانیت سوودیان لێ وەربگریت ئەو نووسراوانە.

ماکوان: چۆنن ئەو نووسراوانە، لەسەر پێستەیە یان چۆنە؟

حەزقیل: نا، لەسەر توێکڵی دار و لاسکی گەڵایە بەهێزی هەردو شاخە، بەڵام نووسراوەکان بە زمانی خۆمان نووسراون، زمانی ئێوەی مرۆڤ نییە، ئەو وشانە تۆ لێی تێناگەیت.

ماکوان: تەنها چارەسەر ئەوەیە کە ئێوە بۆم بخوێننەوە.

حەزقیل: ئاسانە، بەڵام چۆن بزانین تۆ چیت پێویستە و باسی چی دەکەیت تا بتوانین هەندێکت بۆ دەستەبەر بکەین.

ماکوان: من مێشکم نووسا بەو مانشێتەی شێخ بەرقان (ڕۆڵی جنۆکە لە ئیسلام)دا.

سەسیل: ئاخر خۆ ئەگەر سەرچاوەت دەست نەکەوێت ئەبێ بیگۆڕیت تۆ تەنها یەك هەفتە کاتت لە بەردەستدایە.

ماکوان: واتا ئێوە ڕۆژەکەتان دیاری کردووە کە کەیە؟

حەزقیل: بەڵێ، خەڵکێکی زۆر لە جنۆکەکان بانگ کراون لای ئێمە و لەم ماوەیەدا کە ئەوەندەی من و برایانم پەیمان پێ بردبێت، تۆ یەکەم کەسیت لە مرۆڤ کە تەنها کوڕ بۆ جنۆکە بگرێت و جنۆکە سازدەری کۆرەکە بێت و تەنها جنۆکەش بێنە کۆڕەکەوە.

ماکوان: من دەتوانم وەکو ئێستا هەمووتان ببینم؟

سەسیل: تەنها ئەوانە دەبینیت کە پێشتر ناسیوتن، لەوانەیە سوڵتان و هەندێك برای تریش ببینیت. ئەوانی تر هەموویان تۆ دەبینن، بەڵام تۆ ئەوان نابینیت.

حەزقیل: بەڵام دڵنیابە زۆرێك لە جنۆکە لەوێ ئامادە دەبن، یەکەم جارە مرۆڤ کاری وا بکات بۆ ئێمە، لەبەر ئەوە جێگای سەرنج دەبێت بۆیە شێخ بەرقان دەیوت بە ماکوان بڵێن با زانیاری باش کۆبکاتەوە، چوونکە لە هەموو چین و توێژەکانی جنۆکە ئامادە دەبن.

ماکوان: سەیرە، بەڵام هەر ئەو قسەیەی شێخ بەرقان زۆر گرنگە لە لام کە فەرمووی باسی ڕۆڵی جنۆکە بکەم لە ئیسلامدا.

حەزقیل: ئاخر بزانە خۆ ئەو نەیوتووە دەبێت هەر ئەو باسە بێت، تەنها وەکو نمونە خستیە بەردەستت.

ماکوان: دەزانم بەڵام سەرنجی زۆر ڕاکێشاوم، بەڕاستی دەبێت جنۆکە دەستی خێر و جێ پەنجەی لەم ئیسلامەدا دیار بێت، دەنا ئیسلام بۆ ئەوانیش نایەت، وە شێخ بەرقانیش لەخۆیەوە نمونەی وا ناخاتە بەردەستی من.

حەزقیل: هەرچیت ویست من و سەسیل و میا هاوکاریت دەکەین، هەوڵبدە لەم هەفتەیەدا شتێکی باش ئامادە بکەیت، بۆ زانیاریت دەبێت تا دوو ڕۆژی تر خۆت یەکلایی بکەیتەوە باسەکەت چییە، بۆ ئەوەی ئێمەش ڕایگەیەنین و بڵاوی بکەینەوە.

ماکوان: زۆر باشە، بابچمە بەردەم کتێبخانەکەی خۆم و لە ئۆفیسەکەم دابنیشم خوای گەورە بە دڵنیاییەوە ئاسانی دەکات بۆمان، زۆر خۆشحاڵتان کردم، ئێوەش چی سەرچاوەتان دەستکەوت لەو بوارەی شێخ بەرقان ئامادەی بکەن بۆم.

میا: دڵنیابە قورس دەبێت لەسەرت، هەوڵبدە بیگۆڕە باسی شتێکی ئیمانی گشتی بکە کە پەیوەندی هەبێت بەهەردوو مەخلوقەکەوە (الثقلین).

ماکوان: هەوڵی خۆم ئەیەم، دوای دوو ڕۆژی تر ئاگادارتان دەکەمەوە بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

ئەوان ڕۆیشتن و منیش مێشکم سەرقاڵ بوو بەدوای سەرچاوەی ئەوەی داخۆ جنۆکە چۆن خزمەتی ئیسلامی کردووە یاخود ڕۆڵی سەرەکی ئەوان چییە لە ئیسلامدا؟.

ئەو شەوە لەبەردەم کتێبخانەکەمدا پشکنینم دەکرد بەدوای ئەو بابەتەوە وێڵ بووم، هیچی وام دەست نەکەوت کە بەکەڵکی کۆڕو سیمینار بێت و ئەکادیمی بێت، بەسەر کتێبەکانەوە زۆر ماندوو بووم و خەوم لێکەوت بۆ بەیانی دیسان دەستم کردەوە بە پشکنین شەممە و یەکشەمە بوو هیچ کارم نەبوو کتێبەکانم بڵاوکردبووەوە جێگای دانیشتنی خۆم نەبوو لە ژوورەکە، هەرچی ورد دەبوومەوە لەسەرچاوەکان هەرباسی شەیتان و سیحر و خراپەکاری جنۆکەکان بوو.

لەم جەنجاڵی خۆمەدا هەموو گیانم پڕ ئێنێرژی بوو بۆ بەدەست خستنی سەرچاوە بۆ کۆڕەکەم، لەپڕ کاتژمێر ١٠ی بەیانی بوو پەیوەندیم پێوەکرا تەماشای ژمارەکەم کرد کرۆنیکا بوو، منیش هەڵم گرت وتم حاجی کرۆنیکای خوشکم (السلام علیکم) .

کرۆنیکا: وعلیکم السلام دەکرێت ئەمڕۆ بتبینم هەندێك کتێبم بۆ هێناویت لە حەج بابتدەمێ، دایکیشم دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات، تەلەفۆنەکەی دایە دەستی دایکی.

فاتمە خانم: باوکەکەم چۆنی ئەوە بۆ دەرناکەویت کوڕی خۆم، دەنگوباست چۆنە. ئاوی زەمزەمیشم بۆ هێناویت لەگەڵ بەرماڵێك و قورئانێك ئەیدەم بە چیمەن بتداتێ.

ماکوان: خوای گەورە تەمەن درێژ و لەش ساغت بکات و بیخاتە میزانی حەسەناتت.

تەلەفۆنەکەم داخستەوە لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کەوا دوای کاتژمێرێك بچم ببینم و شتەکانی لێ وەربگرم، بەڵام من بەردەوام بووم لە خوێندنەوە و گەڕان بەدوای سەرچاوەدا، ئەوەندە سەرقاڵ بووم، کاتژمێرەکە بەسەردا چوو لە بیرم چووەوە بچمە دەرەوە، بۆ جاری دووەم تەلەفۆنی کردەوە کرۆنیکا وتی لەکوێیت؟ چاوەڕێتم. ئەنجا بیرم کەوتەوە، پێم وت چاوەڕێم بکە دوای چەند خولەکێك دێم، ئیشی زۆرم بۆ هاتە پێش بۆیە دوا کەوتم، واهاتم لە کوێیت؟

کرۆنیکا: لەو قاوەخانەیەم کە یەکەم جار لێی دانیشتین و کاوە گوڵی دەفرۆشت.

ماکوان: واهاتم، ببوورە لە دواکەوتنم.

کە ڕۆشتم لەوێ دانیشتبوو چاوەڕێی دەکردم، بەڕێزەوە وتی چی دەخۆیتەوە؟

ماکوان: پیاو وا بە ئافرەت دەڵێت، بەڵام مادام دواکەوتم حەقی خۆتە، قاوەیەك و ئاوێکی غاز دەخۆمەوە.

کرۆنیکا: نانی بەیانیت خواردووە؟

ماکوان: نەوەڵڵا فریا نەکەوتم.

کرۆنیکا چوو قاوەیەك و ئاوێکی غاز و ساندویچێکی هێلکە و ڕۆبیانی بۆ هێنام لەگەل پارچەیەك کێکی ئەمەریکی بەناوی (کوکیس کرێم کێك)، سوپاسم کرد و دەستم کرد بە خواردن ئەویش تەماشای دەکردم.

ماکوان: بۆ وا تەماشام دەکەیت، با نانەکەم بخۆم.

کرۆنیکا: زۆر ماندو دیاری و سەرقاڵ ئەتبینم خۆ هیچ ڕووی نەداوە؟

ماکوان: نا، بەتەمام خۆم ئامادە بکەم کۆڕ و سیمینارێك بۆ جنۆکەکانی هاوڕێم بگرم.

کرۆنیکا: بەڕاستتە یان گاڵتەم پێ دەکەیت؟

ماکوان: نەبەخوا زۆر بەجدیمە، لە دوێنێ شەوەوە بەدوای کتێب و سەرچاوەدا دەگەڕێم هیچم دەست نەکەوتووە.

کرۆنیکا: کۆڕەکەت لەکوێ دەبێت؟

ماکوان: بەخوا نازانم جارێ لەکوێیە.

کرۆنیکا: لە فەیسبووك و تۆڕە کۆمەلایەتییەکانە؟

ماکوان: دەلێم کۆڕ بۆ جنۆکە دەگرم، فەیسبووك بۆ ئێمەی مرۆڤە.

کرۆنیکا: شێتم مەکە حەز دەکەم بەشدار بم لەکوێیە کۆڕەکە، حەز دەکەم بێم.

ماکوان: بۆ شێتت دەکەم، خۆشم نازانم لەکوێ ڕێکخراوە، چاوەڕێ دەکەم خۆیان بێن بەشووێنمدا و بمبەن بۆلای خۆیان.

کرۆنیکا: ئەی ئەتوانم منیش بێم؟

ماکوان: باوەڕناکەم، واز لەو بابەتە بهێنە با شێت نەبیت، ئەوە ئیشی تۆ نییە و خۆتی پێوە سەرقاڵ مەکە، ئادەی بزانم چیت بۆ هێناوم.

کرۆنیکا: جارێ ١٠٠ هەزار کرۆنی ترم بۆ هێناویت بۆ وەرزشی میلاد.

ماکوان: نامەوێت، هێشتا ٧٥ هەزار کرۆنمان پێ ماوە، چی لێ بکەم ئەو کوڕە زۆر بەئەدەب و ڕاستگۆیە، پارەشم داوە بە باوکی، ئەم مانگە وەریان نەگرت وتیان پێویستمان نییە.

کرۆنیکا: خۆشم پارەم دایە میلاد وەرینەگرت، وتی لەگەڵ کاك ماکوان قسە بکە، خۆ تۆشماڵت ئاوا بێت ئەوەندە مەشغوڵیت لەگەڵ ئێمە و مانان هەر قسە ناکەیت.

ماکوان: ئیتر ژیانە کرۆنیکای خوشکم، پیاو کە خاوەنی ژن و ماڵ و منداڵ و کار و نووسین بوو کۆڕی بۆ جنۆکە بیت، حەتمەن هەر سەرقاڵ دەبێت، ئادەی بزانم کتێبەکان چین؟

کرۆنیکا: ٤ کتێبم بۆ هێناویت، ئیتر نازانم بەدڵتە یان نا.

ماکوان: خۆ کڕاست بۆ نەکڕیوم تا بەدڵم بێت، کتێبە هەر بەدڵمە بە دڵنیاییەوە.

کرۆنیکا: ئەزانم ماڵت ئاوا بێت، مەبەستم ئەوەبوو کە گوایە لەگەڵ فیکری تۆدا بگونجێت یاخود نا.

ماکوان: ئێ ئێ باشە، کەواتە ئەتەوێت پێم بڵێیت کەسێکی مەنهەجیت، ها؟

کرۆنیکا: خۆت فێرت کردووم لە کتێبی گفتوگۆی قەڵەم، ئایدۆلۆژیا و باسەکانی ئایدۆلۆژیات کردووە زۆر پێی موعجیب بووم، ئەمەش کتێبەکانتە.

هەموو فەرمووده قودسییەکانم بۆ هێناویت.

ئەم کتێبە باسی نەقدی ئیسلامییە لە لاهوت بۆ فەلسەفەی عەرەبی.

(صفوة التفاسيرم) بۆ هێناویت کۆکراوەی تەفسیری ئیبن کەثیر و قورطبی و موفەسیرەکانی ترە.

فەرموودەکانی ترمذی لە صیفاتی رسول الله (صلى الله عليه وسلم).

ماکوان: ئەی خوای گەورە جەزای بەخێرت بداتەوە، ئەی کوا ئاوی زەمزەمەکەی دایکت و بەرماڵەکەی؟

کرۆنیکا: تەزبیحێك و قورئانێکیشی لەگەڵدایە، لەبیرت چوو وایە؟

ماکوان: وایە، کوا بێنە.

کرۆنیکا: فەرموو ئەوە هەموویەتی، ئەڵێی من لێم داگیر کردوویت و لێم دەسێنیتەوە.

ماکوان: ئەو دیارییانەی کەلە حەجەوە بۆم دێت زۆر عەزیزن.

کرۆنیکا: خەریك بوو عەبایەکی سەرشانت بۆ بهێنم زۆر جوان بوو، بەڵام وتم لەوانەیە حەزی لێنەکات.

ماکوان: وەڵڵا بە عەکسەوە زۆرم حەز لێیەتی، بۆ نەتهێنا یان ڕەزیل بوویت و وتت گرانە.

کرۆنیکا: توخوا وا لەمن گەیشتوویت؟

ماکوان: نەبەخوا، دەزانم خوشکێکی بەڕەحم و هەموو شتێکی باشت بۆ من دەوێت، ئەوە هەر بۆ خۆشی وا دەڵێم.

کرۆنیکا: تۆ لەنێوانی شەیتان و فریشتە یاری بە من دەکەیت.[

ماکوان: چی؟

کرۆنیکا: بەڵێ، هەموو جارێك خەنجەرێکم لێ دەدەیت و بەبریندارى بەجێم دەهێڵیت، لەخوا ناترسیت؟

ماکوان: ئەوە ئەڵێی چی تێناگەم؟

کرۆنیکا: تۆ تێناگەیت، یان خۆتم لێ هەڵە دەکەیت.

ماکوان: چیت دەوێت؟

کرۆنیکا: تۆم دەوێت!

ماکوان: بۆ من مەدالیام یان کەرەستە و شتومەکم حاجی گیان، منت بۆ چییە؟ ئەترسم بە دەڕنەفیز و پلایسم تێکەیشتبیت.

کرۆنیکا: توخوا ماکوان گاڵتە مەکە، وەڵڵاهی سیحرت لە دڵم کردووە لەناوی دەرناچیت.

ماکوان: من چۆن سیحر لە دڵت دەکەم پەنا بەخوا، بۆت بەتاڵ بکەمەوە ئەو سیحرە بە ڕوقیەی شەرعی.

کرۆنیکا: نامەوێت، ئەو سیحرە بابمێنێت، ئەگەر سیحر وابێت زۆر پێی ڕازیم.

ماکوان: خۆت ناتەوێت بەتاڵی بکەیتەوە من چی بکەم.

کرۆنیکا: لەخوا بترسە ئەزانی من داوات لێ دەکەم بەحەڵاڵی ببمە خێزانت، بۆ هەموو جارێك ڕەفزی دەکەیتەوە. مام فەرهاد وتی ماکوان وتوویەتی سوپاسی دەکەم من ناتوانم ژن بهێنم و خۆ ژنم هەیە و ماڵی تر دروست ناکەم.

ماکوان: بەڵێ ڕاست دەکات، من ناتوانم ماڵی تر دروست بکەم چوونکە کۆڵم زۆر قورسە، نامەوێت قورستری بکەم. واتا کۆڵی بەرپرسیارێتیم قورسە.

کرۆنیکا: ئەی لە ئیسلام ڕێگا نەدراوە پیاو چوار ژنی هەبێت؟

ماکوان: بەڵێ، ڕێگا دراوە بەڵام خۆ فەرز نییە، ئەتوانیت هەر ژنیشت نەبێت.

کرۆنیکا: باشە من نامەوێت تۆ بێیتە لای من، بەس هەر دەمەوێت مارەم بکەیت و بڵێم ژنی ماکوانم.

ماکوان: ئاخر جا چۆن شتی وا دەکەم، باشە من پرسیارێکت لێ بکەم. ئەم هەموو خەڵکەی تر هەیە بەدوای ژندا دەگەڕێت هەزارەها لەمن باشتر و قۆزتر و پیاوتر هەن، دەوڵەمەند و مەمنونی تۆن و ژنیشیان نییە، ئەی بۆ شوو بەوان ناکەیت؟

کرۆنیکا: ماکوان، خۆ کێشە لە پیاوا نییە، من بێجگە لە تۆ کەسی تر ناچێتە دڵم، خۆ من پێش تۆ ئەزموونم زۆرە لەگەڵ پیاواندا، ئەزانم بەچاوی سووك تەماشام دەکەیت؟

ماکوان: وانییە، من بەچاوی سووك تەماشای هیچ مەخلوقێکی خوای پەروەردگار ناکەم، لەکاتێکدا تۆ خوشکی ئیمانداری منیت.

کرۆنیکا: ساڵی ۲۰۰۳ یەکەم داواکارم هات ڕازی بووم، بەڵام کە تەماشام کرد لەپیاو نەدەچوو، کەسایەتییەکی زۆر مناڵانەی هەبوو. نازانم منیش حەزم بە کەسێکە زۆر پیاوانە ڕەفتار بکات، دوای شەش مانگ کۆتاییم بەهەموو شتێك هێنا لەگەڵی، بەباوکمم وت من شتی وام ناوێت.

پاشان سالی ۲۰۰۵ کوڕێکی تر هاتە داوام بێجگە من چوار ئافرەتی تری هەڵخڵەتاندبوو، لەویش پەشیمان بوومەوە، هەرچی داوای لێبوردنی کرد وتم تەواو.

ماکوان: جارێ ئەم دووانە خەڵکی کوێ بوون؟

کرۆنیکا: هەردووکیان کورد بوون.

ماکوان: دەی خوا موەفەقت بکات، باسی سێیەم و چوارەمم بۆ بکە.

کرۆنیکا: کوڕێکی تر هاتە داوام ساڵی ۲۰۰٦ بەڵام نەخۆشی نەفسی هەبوو، هەفتەیەك دەچوو بۆ کلیسا و هەفتەیەکێش دەچوو بۆ مزگەوت و چەند جارێك چووینە دەرەوە بەیەکەوە لەبازاڕ کوردەکانی تر پێیان رادەبوارد زۆر بێ شەخسێت بوو، ئەویش ڕێکنەکەوت.

ماکوان: دوای ئەو؟

کرۆنیکا: کۆتاییان بەرپرسێکی بێ شەرەف بوو خوا ڕەحمی پێ کردم زوو ڕزگارم بوو لەدەستی، بەهەردوو دیوەکەیدا کاری دەکرد.

ماکوان: بەهەردوو دیوەکەیدا کاری دەکرد واتای چی؟ بەخوا من ئەو موسطەلحانە نازانم.

کرۆنیکا: واتا لەگەل پیاویش ڕایدەبوارد، پیاویش لەگەلی ڕایدەبوارد و منیش ژنی بووم.

ماکوان: مەسئول بوو؟، خەڵکی ئەو کوردستانەی لای خۆمان بوو؟

کرۆنیکا: بەڵێ، خەڵکیش زۆر ڕێزی لێ دەگرن.

ماکوان: دەی خوا موەفەقی نەکات و لەناوی بەرێت، دوای ئەمانە؟

کرۆنیکا: تەواو سیوام لەپیاوی کورد هاتەوە، فرانکم ناسی و تۆ چیرۆکەکەم دەزانی، ئەڵێی چی ئێستا؟

ماکوان: وەڵڵا هیچ ناڵێم، هەر ئەوەندەم دەسەڵاتە بڵێم خوا مەحفوزت بکات و سەرت با لە سوجدەدا بێت کە خوای گەورە هیدایەتی داویت.

کرۆنیکا: من کە تۆم زۆر خۆش دەوێت، سیفەتی یەکەمت ئەوەیە بۆ هەموو حاڵەتێك شیکارییەکی دەڕوونی دەکەیت و باش قسەی لەسەر دەکەیت، ویستم بڵێم هەست دەکەیت بەوەی کە گونجانم لەگەڵ هیچ کام لەم پیاوانەدا نەبووە لەگەڵ تۆدا زۆر گونجاوم.

ماکوان: کورە دوایش لەمن جیادەبیتەوە و دەڵێیت ماکوان جنۆکەی هەبوو.

کرۆنیکا: بەخوا تا ماوم لەژێر سایە و فەرمانتا دەبم، بەلام دڵم مەشکێنە.

ماکوان: من ئەفسەری سەربازی نیم تا سەربازم هەبێت، من لەو جۆرە پیاوانە نیم کە ئافرەت لە ژێر فەرمانی مندا بێت، خۆ تەلەفزیۆن و غەسالەم نەکڕیوە، پاشان کرۆنیکا جەنابت باش دەزانیت لە ئەوروپا کوا

ڕۆشنبیری فرەژنی هەیە، سوێند بەخوا تۆ بهێنم خێزانم دەرگام لێ ناکاتەوە، ئاخر ناکرێت لەبەرخاتری تۆ ماڵ و منداڵەکەم تێك بدەم، خێزانم هەرگیز ڕازی نابێت بەشکم بکات لەگەڵ کەسی تردا، وەکو وتم هەزارەها کوڕی تر هەیە لە من باشتر و ئاقڵ تر و پیاوتر و پارەدارتر، بڕۆ شوو بەوان بکە، وا نەزانیت کەسێکی کەمیت، سوێند بەخوا هەزارەها تەمەنای ئەوە دەکات کە تۆ خێزانی بیت.

کرۆنیکا: کێشەکە لەوەدایە من ئەوە باش دەزانم، بەڵام ئەوەی من دەمەوێت بەردەست نییە، هەمیشەیش لەبەرچاومدایە.

زۆر دڵڕەقیت، بۆ زانیاریت من دەڕۆم بەلام هیوا بڕاویش نیم خۆ لەو دنیاش بێت هەر شووت پێ دەکەم، بەخوا سکاڵات لێدەکەم لای خوای پەروەردگار.

## یەکەم سیمیناری ماکوان بۆ جنۆکەکان

گفتوگۆمان لەگەڵ کرۆنیکا بڕاندەوە لەسەر ئەوەی کە ناتوانم بەهیچ شێوەیەك لەگەڵیدا هاوسەرگیری بکەم، لەکۆتاییدا کرۆنیکا توڕە بوو و بەجێی هێشتم و وتی سکاڵات لێ دەکەم لای خوای پەروەردگار، بەهێواشی و دەنگێکی نزم وتی خۆ لەم دنیایەش هاوسەرگیریت لەگەل نەکەم لەو دنیا هەر دەیکەم، هیوا بڕاو نیم.

دوای چەند ڕۆژێك حەزقیل گەڕایەوە بۆلام، وتی خۆت ئامادە بکە ئێوارەی هەینی کۆڕەکەت بۆ ساز دەکرێت، ئامادەباشی بۆ کراوە، هەوڵ بدە هیچ شتێکی نەخوازراو نەیەتە پێش، تا کارەکەمان لێ تێك بدات.

ماکوان: بێخەم بە من ئامادەم.

حەزقیل: ناونیشانی کۆڕەکەم بدەرێ، یان هەر ئەوەی شێخ بەرقان بێت؟

ماکوان: پێم وابێت هەر ئەوەی شێخ باشترە، بەڵام تۆزێك ئەدەبیی تری دەکەین (کاریگەری جنۆکە لە ئیسلامدا و ئاوێتە بوونیان بە ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

حەزقیل: زۆرباشە، ئێستا ئەچم هەواڵیان ئەدەمێ.

ماکوان: کاتەکەی چەند بێت باشە، چوونکە کۆڕ و سیمینار بۆ مرۆڤەکان یەك کاتژمێر یان دوو کاتژمێر زۆر باشە، ئیتر لە دوای ئەوە خەڵك ماندوو دەبێت، بەڵام نازانم بۆ ئێوەی جنۆکە چۆنە؟

حەزقیل: بەئارەزووی خۆت زۆت قسە بکە، لای ئێمە کات زۆر گرنگ نییە، ئەوەی لە پێناوی ئیسلامدا و عیبادەت بێت کاتی بۆ دابین ناکەین، بەڵکو هەموو ژیانی خۆمانی بۆ دیاری دەکەین.

ماکوان: ماشاءالله حەزەی برام خوا موەفەقتان بکات، کە دڵخۆشم بەو قسانەت.

حەزقیل: ئەی چۆن ئێمەی جنۆکە یەك، ئێوەی مرۆڤ هیچ.

بەقسەیەکی پێکەنیم وتم من هەموو جنۆکەکان دەبینم کە ئامادە دەبن؟

حەزقیل: نا براکەم، مەگەر ئەوانەی حەز بکەن تەعاروفت لەگەڵ بکەن، بەڵام ئەوانەی کە هاوڕێ و برای خۆتن دەیان بینیت.

ماکوان: بە بڕوای تۆ چەند جنۆکە ئامادە دەبێت؟

حەزقیل: بە هەزارەها، نازانم ناتوانم بڵێم چەندە، بەڵام دڵنیابە لەسەروو ٢٠ هەزار جنۆکە گێت لێ دەگرن.

ماکوان: یەکجار زۆرە، چین و توێژەکانی جنۆکە کێن و چین؟

حەزقیل: لەهەموو جۆرێکە بەلام زیاتر ئەوانەن کە سەربازی سوڵتانن.

ماکوان: حەزقیل ئەم سوڵتانە کێیە، زۆر باسی دەکەن تۆزێکم بۆ باس بکە.

حەزقیل: کەسێکی زۆر دادپەروەرە، ئیسلامی زۆر خۆش دەوێت، زۆر ئازا و چاونەترسە، هاورێیەیتی زۆر هەیە لەگەڵ مرۆڤەکان، بەلام من نازانم شێخ بەرقان بۆی باس کردم بەتایبەت لەگەڵ زانا و سەرکردە ئیسلامییەکان کەلە گۆرەپانی جیهاددان.

ماکوان: ئەی زانستی و ئاستی خوێندەواری چۆنە؟

حەزقیل: زۆر بەرزە، زۆە وریایە و زوو لەشت تێدەگات و خۆ بەکەم زانە و مندالی زۆر خۆش دەوێت، هەموو موسڵمانێکی جنۆکە و مرۆڤی خۆش دەوێت، بەرگریکاری سەرسەختی ئیسلامە، بۆ ئیسلام دەژی و بۆ ئیسلام دەمرێت.

ماکوان: وەڵڵا وا باسی دەکەیت موشتاقت کردم بۆ ناسین و بینینی.

حەزقیل: شێخ بەرقان و کازۆڵ باسی تۆیان بۆ کردووە، (سبحان الله) ئەویش وتی موشتاقتان کردم بۆ ئەوی ماکوان بناسم.

ماکوان: خۆشحاڵ دەبم بە پشتیوانی خوای پەروەردگار ڕۆژی دیاریکراو ئامادە دەبم.

حەزقیل: بە پشتیوانی خوای پەروەردگار کازۆڵ و میا دێن بە شووێنتا لەگەڵ ئەواندا دێیت.

ماکوان: زۆرباشە ان شاء الله.

خوا حافیزیم لەحەزقیل کرد و زیاتر سەرقاڵ بووم بە خوێندەوە و لێکۆڵینەوە لەو باسەی کە ناونیشانەکەیم نارد بۆ برایانی جنۆکە و لە هەوڵی بەدەست هێنانی زانیاری بووم، دەمویست بۆ باسەکەم لەوە باش تێبگەم کە قسەکردن بۆ جنۆکە زۆر جیاوازە لەوەی قسە بۆ مرۆڤ بکەم، چوونکە مرۆڤ کارەکانی بەرچاوە و لە فیکر و سیاسەت و شارستانی..هتد بەڵام جنۆکە نادیارن شارستانییەتیان نییە فیکریان وەکو مرۆڤ واڵا و بەرجەستە نابێت، ئایدیایەکانیان بۆ خۆیانە و شاراوەیە.

بەهەرحاڵ خۆم ئامادە کرد، بەڵام بە داخەوە سەرچاوەیەکی ئەوتۆم دەست نەدەکەوت، زۆرجار بیر لەوە ناکەینەوە کە ئەرکی جنۆکەکان لەسەر ئێمەیە لە ڕووی زانستی شەرعی و گەیاندنی دینی خوای گەورە!.

لەڕاستیدا ئێمەی مرۆڤی موسوڵمان زۆر کەمتەرخەمین بەرانبەر برا جنۆکەکانمان، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

{وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ} هەست دەکەم هەموو مرۆڤە موسوڵمانەکان لەوە تێگەیشتوون کە واتای چییە؟

بەڵام لەوە تێنەگەیشتوون کە مرۆڤ بۆتە خەلیفە و ئەرکی گەیاندنی ئەم ئایینە، لەوانەیە وا هەست بکەین کە ئەرگی گەیاندنی ئایینەکە تەنها بۆ مرۆڤەکانە، لەڕاستیدا ئەوەی کە فەرزە و واجبە لەسەر مرۆڤەکان ئەوەیە کە بانگەواز بۆ دینی خوای گەورە بکەن، بەڵام بۆ جنۆکەکان ئێمە ڕانەسپێردراوین بە واجب و فەرز، بەڵکو ڕاسپێردراوین کە واجبە لەسەرمان بزانین ئەوانیش بوونیان هەیە. کە مادام بوونیان هەیە لە ڕووی شەرعییەوە ئەجر و پاداشت وەردەگرین، کە گرنگییان پێ بدەین لەباسەکانماندا و لە کۆڕ و کۆبونەوەکانماندا، چوونکە برا جنۆکە موسوڵمانەکانمان هەمیشە لەگەڵماندان لەباس و خواست و کۆڕی زانیاری و فیکر و زیکرماندا.

ئەوەندەي باسی جنۆکە شەیتانەکان دەکەین وامان لیهاتووە بێ ئەوەی بەخۆمان بزانین جنۆکە موسوڵمانەکانیشمان ناشیرین کردووە، جا بۆیە پێویستە ڕۆڵ و کاری ئەوانیش لەم ئیسلامەدا باس بکەین و هەست بەئازار و نارەحەتییەکانیان بکەین، تا بتوانین لێك نزیکبوونەوەیەکی ئیمانی و خواناسی لە نێوانی مرۆڤ و جنۆکەدا دروست ببێت، هەروەك چۆن

لەنێوان زۆرێك لە زانایاندا دروست بووە. بەنمونەی شێخ و لئیسلام ئیبنو تەیمیە، ئیمامی غەزالی، ئیبن حەجەری عەسقەلانی...هتد.

تەنانەت جنۆکەکان ئەوەندە سەرسام بوون بە شەیخولئیسلام لە شێوەی ئەودا لەناو خەڵك دا دەردەکەوتن، لەکاتێکدا ئەو لە زیندانی قەڵا بوو لە دیمەشق، زۆرێك لە کتێبەکان یاداشتیان کردووە.

سات بە سات چاوەڕوانی هاتنی ڕۆژی هەینی بووم، خۆم ئامادە دەکرد، ڕۆژی هەینی کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ بەرەو مزگەوت بۆ نویژی نیوەڕۆ کەوتمە ڕێ، نوێژم کرد کازۆڵم بینی لەناو خەلکەکەدا ئاماژەی بۆ کردم کە بڕۆمە دەرەوە لە دەرگای مزگەوتەکە دەرچووم کازۆڵ وتی بڕۆ بۆ دارستانەکە و من و میاش لەوێ ئەتبینین.

ڕووە و دارستانەکە ڕۆشتم تا گەیشتمە ئەو جێگایەی کە یەکەم جار کازۆڵ بردمی بۆلای حەزقیل و برایانی تر، کازۆڵ دەرکەوت.

کازۆڵ: ئامادەیت بڕۆین؟

ماکوان: هەر زۆر ئامادەم، نە مۆبایل، نەکلیل نە پارەی وردە هیچ جۆرە مێتاڵێکم پێ نییە، تەنها قایشەکەم مێتاڵی پێوەیە.

کازۆڵ: کێشە نییە، ئەوە کارەبای زۆر دروست ناکات.

ماکوان: چوونکە جارەکەی تر پێت وتم ماددەی ئاسن و فافۆن و زیووم پێ نەبێت کاتێك لەگەل ئێوە دێم بۆ لای ئێوە، لەبەر ئەوەی کارەبا پێچەوانە دەکاتەوە، قورسایی دەخاتە سەرشانی ئێوە.

کازۆڵ: وایە، ئەگەر بیرت بێت کەسێك بەناوی نیکۆلا تێسلا لەبەر دۆزینەوەی ئەو کارەبایە کوشتیان، چوونکە دەیویست لە (ناتور) واتا سروشت بەخۆڕایی کارەبا بەدەست بهێنێت.

ماکوان: ڕاستە لە هوتێلەکەدا کوشتیان کە تێیدا دەژیا، هەموو بیردۆز و نهێنییەکانی دوای کوژرانی دزرا. تا ئێستاش نەزانراوە کە کێ کوشتویەتی.

کازۆڵ: چۆن نەزانراوە، زانراوە ئەوی کە کوشتی دوو خانەوادەی دەوڵەمەندی بەناوبانگی ئەمەریکی بوون خێزانی (ترامپ و فۆرد) کوشتیان، مامی دۆناڵد ترامپ و هێنری فۆرد دەستیان هەبوو لە کوشتنیدا.

ماکوان: جا ئەو دوو خێزانە بۆ؟

کازۆڵ: لەبەر ئەوەی نەیاندەویست وزە بەخۆڕایی لە سروشت وەربگیرێت، دەیانوویست نەوت،، بەنزین، گاز، سەیارە، کارگەی فڕۆکە، کارگەی کەشتییە گەورەکان، هەموو بوارە سەربازییەکان پارەی زۆرتریان دەست بکەوێت و بنەماڵەی ئالسعودیش هاوکار بوون لەو پلانەدا.

ماکوان: بەڵێ، جەنابت دەزانیت ئەو مرۆڤە شەیتانانەی ئێمە لە ئیبلیسی لای ئێوە بەهێزترن، خوای گەورە لە سوڕەتی ئیبراهیم ئایەتی ٤٦دا باسیان دەکات و دەفەرمووێت:

وَقَدْ مَكَرُواْ مَكْرَهُمْ وَعِندَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ﴿٤٦﴾

واتە: بێگومان (خوانەناسان) پیلان و تەڵەکەی خۆیانیان گێڕا، فێڵ و فڕی زۆریان کرد، بەڵام هەموو پیلان و فێڵیان لای خوا ئاشکراو دیارە (بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە) هەرچەندە پیلان و فێڵیان کێوەکانیش لە بن بهێنێت.

کازۆڵ: بەدڵنیاییەوە وایە، بابڕۆین چوونکە لەوێ خەڵکێکی زۆر چاوەڕوانن.

ماکوان: بفەرموو من ئامادەم.

بەچواردەورمدا خولی خوارد و هەناسەی قوڵم هەڵکێشا و چاوم نا بەیەکدا چەند خولەکێك کازۆڵ وتی چاوت بکەرەوە و داوای لێکردم هەمان کردار بکەمەوە چاوم نایەوە بەیەکدا و دوو هەناسەی قوڵم هەڵکێشا، کاتێك چاوم کردەوە شێخ بەرقان لەبەردەممدا بوو سڵاوم لێ کرد و زۆر خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بە ئامادە بوونم داوای کرد کازۆڵ و میا جەنابی سوڵتان ئاگادار بکەنەوە کە ماکوان هاتووە.

شێخ بەرقان: خۆت باش ئامادە کردووە؟

ماکوان: بە پشتیوانی خوای گەورە شێخ گیان ئامادەم دوعای خێرت لە بیر نەچێت بۆم.

شێخ بەرقان: خوای گەورە سینەت ساف بکات و زمانت پاراو بکات و ئیخلاست پاك بکاتەوە و ئیمانت بەهێز بکات و کارەکانت هەموو بۆ خاتری (واحد الاحد) بێت.

ماکوان: ئامین، شێخ کۆڕەکە چۆن دەبێت؟

شێخ بەرقان: کۆڕەکە میا و سەسیل ئامادەیان کردووە، سەسیل پێشەکییەك باس دەکات و پاشان دوای ئەوە سوڵتان قسەی خۆی دەکات، دوای سولتان نزیکترین جنۆکە لە تۆ بانگ دەکرێت و بایۆگرافی تۆ پێشکەش دەکات و ئینجا تۆ ڕاستەوخۆ دەست پێ دەکەیت و دوای ئەوە لەکۆتایی، هەر جنۆکەیەك پرسیاری هەبێت وەڵام ئەدەیتەوە، ئەگەر نەتوانی وەڵام

بەیتەوە بڵێ هەوڵ ئەیەم وەڵامی پرسیارەکەت بۆ دەستەبەر بکەم، پاشان ئاگادارت دەکەمەوە لە ڕێگای هاوڕێ جنۆکەکانمەوە، باشە؟

ماکوان: زۆرباشە، خوای گەورە کارەکانمان بۆ ئاسان بکات.، ئامین.

شێخ بەرقان: با بڕۆین بۆ دیوانی سوڵتان چاوەڕێیە، هەواڵمان بۆ هات دەڵێت چاوەڕێتانە.

ماکوان: بفەرموو لە خزمەتاندام.

لەگەڵ شێخ بەرقان کەوتینەرێ چووینە ناو باڵەخانە و قەڵایەکی جوانی پڕ ڕەنگ و سورەییا، پڕ لە چل چراو بۆنی خۆش و بێ دەنگ و پڕ ئارامی، هەروەها سامناك. تەنها گوێم لەدەنگی پێکانی خۆم بوو تەقەی دەهات.

لەگەڵ شێخ بەرقان لەبەردەم دەرگایەکی زۆر گەورە خۆمان بینییەوە، نەخشی سەر دەرگاکە وەکو قەڵغانی دەستی پاڵەوانەکان بەڕەنگی ئاڵتونی لەسەر دەرگاکە کێشرابوو، دەرگاکە لە جوانترین جۆری داری ساج بوو، ڕەنگی ڕەش بوو وەکو دەرگای سەنتەرە گشتییەکان بۆمان کرایەوە و چووینە ناو دیوان و ساڵۆنێکی گەورە، هۆڵێکی پڕ لە پایە نەخشێنراو سەقف و دیواری ناو هۆڵەکە هەموو نەخشی ڕەنگاو ڕەنگ و زەخرەفە و گوڵ و ئایەتەکانی قورئان بوو، لەنێوان هەر پایەیەکدا چل چرایەکی پڕ کریستاڵی بەشەوق داگیرسابوو، دیواری هۆڵەکە ڕەنگی جەرگیی و پایەکان ئاڵتونی بوون، فەرشی ژێر پێمان وەکو ئیسفنج نەرم بوو، کاشی و بەردی زەوییەکە ڕەساسی و مەڕمەڕ بوو، جێگای وا جوان و نایابم نەبینیبوو، کەرەستەکانی لە مێز و کورسی هەمووی شاهانە بوو. بەبێ دەنگ لەگەڵ شێخ بەرقان هەنگاوم دەنا تەماشای جوانی هۆڵەکەم دەکرد، سەرسام بوو بووم، بەڵکو جوانی ئەو تەلارە توشی شۆکی کردبووم.

لەپڕ دەنگی پێکەنینێك هاتە گوێم و وتی جەنابی بەرقان میوانەکەت لەدنیای خۆی دەرچووە، بێدەنگی قەرەباڵغی بۆ دروست کردووە.

تەماشای شێخ بەرقانم کرد بەڕێزەوە وەستاوە و زەردەخەنە دەیگرێت، منیش کەس ناناسم، لەپڕ سوڵتان دەرکەوت.

پیاوێکی سوور و سپی، سوورییەکەی نزیك بوو لە ڕەنگی زەرد واتا لە نێوان سوور و زەرد دا بوو، سپیایی ڕیشی کەم بوو، چاوی وەکو چاوی پڵنگ و کڵاوێکی ڕەش کە بە بنقێمی پیرۆزەی و جۆرە موروویەك نەخشێنرابوو لەسەریدا بوو، دەست و بازووی زۆر بەهێز و باڵای یەکجار بەرز بوو، دەنگێکی پیاوانەی زۆر ئارامی هەبوو، زەردەخەنە لەسەر لێوی یاری دەکرد و وتی حاجی ماکوان بەخێر بێیت بۆ وڵات و مەملەکەتی خۆت.

ماکوان: خوای پەروەردگار سەربەرزت بکات جەنابی سوڵتان، پایەدار و سەربەرز و سەربڵند بیت قوربان.

سوڵتان: ئەمڕۆ هەموومان میوانی تۆین، چیت بۆ ئامادە کردووین؟

ماکوان: لەماڵی خاوەن کەرەمەکاندا هەمیشە من داواکار بووم ئەوە منم میوانم و لەخزمەتی جەنابت و شێخ دام، داوای دوعای خێر دەکەم.

بەڵکو بە زانیاری و کەرەم و بەخشندەیی خۆتان ئێمە دەوڵەمەند بکەن و تینوێتیمان بشکێنن، بەندە خزمەتکاری خواناس و زانا و موجاهیدانم لە پێناوی خوای پەروەردگاردا.

سوڵتان؛ یاخوا بەخێر بێیت، مەملەکەتت ئاوەدان کردەوە، چاوەڕوانم بزانم لەباخەکەتدا چ باقە گوڵێکت بۆ هێناوین، دەستی کرد بە گیرفانیدا و دەریهێنا دەستی تەڕ بوو، پرژاندی لە من و شێخ بەرقان، بۆنی زۆر خۆش

بوو، تا ئێستا هیچ پارفیم و عەتر و گوڵاوێکم بۆن نەکردووە ئەوەندە بۆنی خۆش بێت.

ماکوان: جەنابی سوڵتان لەخزمەتاندام، پاش کەمێکی تر لەباخی ئیسلام گوڵم بۆ هێناون، ماکوان خۆی لەو باخە ئاواتە خوازە ببێتە باخەوان، تا بتوانێت زیاتر خزمەت بکات.

سوڵتان: زەردەخەنە لەسەر لێوی نەئەبڕا، بەڵام زۆر بە ویقار و سامناکیش بوو، تەماشای شێخ بەرقانی کرد و وتی ڕاستت فەرموو، خۆیەتی خوای گەورە هەموو لایەك بە ئاشتەوایی بهێڵێتەوە.

هەرچەندە لەو قسانە هێچ تێنەگەیشتم، سوڵتان وتی با بڕۆین.

لەگەڵ جەنابی سوڵتان بەڕێ کەوتم و نەمدەویست پێشی بکەوم، ئەویش دەیویست لەگەڵمدا هەنگاو بنێت، تەماشای ڕیشی کردم و وتی ڕیشت نووری تێکەوتووە، دڵخۆشی کە سپی تێکەوتووە یان حەزت دەکرد ڕەش بوایە؟

ماکوان: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: (کاتێك کە ڕیشی موسوڵمان سپی دەبێت نوورە) هەروەها دەفەرمووێت: (ڕیش سپی کە سەر دەکاتە سوجدە خوای گەورە شەرم لە ڕیشی سپی دەکات) چۆن دڵخۆشنیم کە سپی تێکەوتووە، خوای گەورە لێمان قبوڵ بکات، لەناو ئەم دینەدا ڕیشم سپی کردووە، بە ڕیش سپێتی نەهاتوومەتە ناوی، سوپاسی خوای گەورەی لەسەر دەکەم، سەرم بە سپێتی ڕیشم بەرزە.

سوڵتان: خوای پەروەردگار سەرت بەرز بکات، خۆشەویستی حاجی ماکوانی برامان، لەم قسانەدا بووین چووینە بەلەکۆنێکی گەورە

لەباڵەخانەکەدا، ئەوەی جنۆکە بوو کە ناسیبووم لەموسوڵمانەکان لەوێ ئامادەبوون. حەزقیل، سەسیل، ڕاقی، شێخ بەرقان، کازۆڵ، سوڵتان، میا و حەنان لەوێ بوون. لە بەلەکۆنەکەدا مابنەوە لە شێوەی جریوەی ئەستێرەی شەوان و ڕەنگی بریقەی کریستاڵ ئەو ناوچەیەی داگیر کردبوو، دەشتاییەکی بەرفراوان و سەوزاییەکی زۆر جوان و لاکانی بە شاخ و کۆتایی دەشتەکەش قەراخ دەریابوو.

سەسیل: ماکوان ئەو جریوە و ڕەنگانە دەبینی هەموو جنۆکەن، بەهەزارەها ئامادەن. ئێستا من دەست پێ دەکەم، دوای من سوڵتان دێت و پاشان حەزقیل دێت ئەو ئەتناسێنێت، خۆت باش ئامادە بکە.

ماکوان: تەوەکول بەخوا من ئامادەم، کاری خۆتان بکەن.

سەسیل: بە بسم الله دەستی پێکرد و پاشان بەخێرهاتنی ئامادەبووانی کرد و سوپاسی سوڵتانی کرد کە هەمیشە لەخزمەت دین و زانست و جیهاد دایە. داوای کرد هەموو دوعای خێری بۆ بکەن و خوای گەورە زیاتر هێز و توانای پێ ببەخشێت بۆ بەرپاکردنی دادپەروەری و بانگەواز و جیهاد. ئێستاش جەنابی سوڵتان پەیامی دەگەیەنێتە ئێوەی بەڕێز.

سوڵتان: بسم الله درووود و سەلام بۆ سەرگیانی پێغەمبەری ئازیزمان (صلی الله علیه وسلم) ئامادەبووانی بەڕێز کوڕ و کچە بەڕێزەکانم، دایك و باوك و خوشک و براکانم، بەناوی هەمووتانەوە بەخێرهاتنی حاجی ماکوانی خۆشەویست دەکەم، کە ئەمە جاری چوارەمە کە مرۆڤ کوڕ بۆ جنۆکە دەگێڕیت لەم جێگایەوە، پێشتر زۆر ڕوویداوە منیش لە سوڵتانەکانی باوکمەوە ئەم کارەم پەرە پێداوە و تا قیامەت بە پشتیوانی خوا لەناو نەوەکانماندا دەمێنێت. ئەوەی شایەنی ئەم جێگایە بوو لەمرۆڤەکان بانگی

دەكەین، تا پەیوەندی نێوانمان بەردەوام بێت لەسەر ئیمان و خواناسی و جیهاد و كۆشش لەپێناوی ئەم ئیسلامەدا.

زۆر حەزمان دەكرد حاجی ماكوان لە كۆنگرەی ساڵانەی جنۆكەكان بەشدار بوایە، بەڵام ئەوكات لەلایەن وەزیرەوە (كازۆڵ) ئاگادار كرایەوە كە كێشەی بۆ دروست بوو، نەیتوانی لەو كاتەدا ئامادە بێت.

بۆیە لەسەرداوای جەنابی شێخ بەرقان و موشتاق بوونی خۆمان بۆ ئەم مرۆڤە خواناسە، كە ناسراوی هەموومانە و ناوی حاجی ماكوانە خۆشحاڵ بووم بەهاتنی بۆ مەمەلەكەتەكەمان و گوێبیست دەبین چیمان پێشكەش دەكات.

دوای تەواوبوونی جەنابی سوڵتان، سەسیل گەڕایەوە بۆ بەردەم بەلەكۆنەكە و وتی ئەو مرۆڤانەی كە پەیوەندی لەگەڵ جنۆكە موسوڵمانەكان دروست دەكەن دوو شێوەن، شێوەی یەكەم لە ڕێگای گەیاندنی زانست و زانیاری و خواناسی و جیهاد، شێوەی دووەم جنە شەیتانەكان لە ڕێگای سیحر و جادوو بانگكردنی بۆ كاری خراپە، پاشان كردارەكە پێچەوانە دەبێتەوە و مرۆڤەكە جنۆكەكان موسوڵمان دەكات و كاریگەری باشیان لەسەر دروست دەكات. بۆ زانیاری هەموو لایەك عەبدولڕەحمان حەزقیل و خۆشم كە دوو كەسی خراپەكار و لە تەرەفی شەیتان بووین، جەنابی حاجی ماكوان كردینییە تەرەفی خوای پەروەردگار، جا نزیكترین جنۆكە لە ئێمە حەزقیلە بۆیە داوا دەكەم لەجەنابی حەزقیل ئەو بایۆگرافی حاجی ماكوان كەریممان پێشكەش بكات.

حەزقیل: بسم الله دروود و سڵاو بۆ سەر گیانی پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیه وسلم) ئەم ئێوارەیە كەسێك خانەخوێیە كە تەنها ناوەكەی بۆ خۆی پێشەكییە، ئەویش ماكوان كەریمی برا و ئازیزمە.

ماکوان ئەو مرۆڤە چاوکراوە و ئازایەیە کە لە شەپۆلی ڕەشەبای شەیتان و سیحر و خراپەکاریدا توانی کەشتی ژیانی ئێمە ئاڕاستەکەی بگۆڕێت و بەو هەموو هێز و توانایەوە توانی پێچەوانەی ئاڕاستەی کەشتی خۆی و ئێمەش بگەیەنێتە کەناری دەریای ئارامی و دوور لە شەپۆلی ترسناکی خراپەکاری.

ماکوان ئەو مرۆڤە بوو توانی فێرمان بکات کە دژی مرۆڤ نەبین، بەڵکو خۆشەویست و براو پشت و پەنایان بین، ئەگەرچی بەهۆکاری ئێمە زۆر نارەحەتی و ئازاری چەشتووە، بەڵام ئەجر و پاداشتی (نحسبه كذلك ولا نزكي على الله أحداً) زۆر گەورەی هەیە، ماکوان ئەو مرۆڤەیە لەکاتی شەڕدا شەڕانییە لە خۆشەویستی دا ئاسمانە، لە تووڕەییدا شەپۆلی دەریایە، لە زانیاریدا زەریایەکی بێ کەنارە. لە بەخشندەیی دا تا کۆتاییەکەی دەبەخشێت، لە هاوڕێیەتیدا خاوەن وەفایە، لە حەقدا ملی تاڵە موویەکە، لە زوڵمدا دەنگی بەرزە، ئەم ئێوارەیە چەندە خۆشحاڵم بەوەی حاجی ماکوان لێرەیەم ئەوەندە دڵگرانم لە کۆتاییەکەی کەلە جنسی ئێمە نییە و بەجێمان دەهێڵێت، بەڵام ژیان و دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار وایە. هەموو خاوەنی یاسا و ڕێسای خۆیەتی، کۆتایی قسەی خۆم بەوە دەهێنم چاوەڕێی باسی نوێم لە حاجی ماکوان تا بزانین ئەم ئێوارەیە چی فێر دەبین و چیمان فێر دەکات.

ماکوان: سڵاوتان لێبێت بە سڵاوی ئیسلام (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) صەلاواتی زۆر بۆ سەر گیانی پێغەمبەر موحەممەد و هەموو پێغەمبەرانی برای، ڕەحمەت و بەزەیی گەورە بڕژێت بەسەر هەموو چاکەکاران و چاکەخوازانیی مرۆڤ و جن لەم زەویەدا.

برایان و خوشکانی جنۆکەم

ئەوەی عەبدولڕەحمان حەزقیلی برام فەرمووی لە ڕاستیدا کە لە چاوی خۆیەوە و لە کرداری بەڕێزانێکی وەکو سوڵتان و شێخ بەرقان و کەسانی تری ئێوەوە تەماشای منی کردووە، دەنا من نەك لەئاستی ئەوەدا نیم، بەڵکو خۆم زۆر لەوە بە کەمتر دەزانم، ئێستا ئەو شەرەفەتان بەمن بەخشیوە لێرەدا قسە بۆ ئێوەی بەڕێز و موحتەرەم بکەم.

بەڕێزان لایەنگرانی ئیسلام و خوای پەروەردگار، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەکدا باسی ئاوێتە بوون و تێکەڵاوی ئێوەی جنۆکە دەکات کە چۆن لە مرۆڤەکان باشترن و زیاتر ئیمان جوڵاوترن بۆ قورئان و ئایینی پەروەردگار لە کاتێکدا ئێمەی مرۆڤ ڕاسپێردراوین بە گەیاندنی ئایینەکە و خەلیفە بین لە سەر ئەم زەوییەدا.

ئیمامی ترمذی لە هاوەڵی پێغەمبەری خواوە ڕەزامەندی خوای لێبێت دەڵێت؛ لەگەڵ جەنابی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆشتم بۆ خوێندنی قورئان و سورەتی ڕەحمانمان دەخوێند، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی ڕەحمان لەسەرتاوە تا کۆتایی هەموو بێدەنگ بووین.

پاشان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەم سورەتەم بۆ جنۆکەکان خوێندەوە، زۆر لە ئیوە باشتر و چاکتر وەڵامیان دامەوە، هەرکات دەگەیشتمە سەر ئەو ئایەتەی خوای موتەعاڵ دەفەرموێت: (فَبِأَيِّ آلاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) چ نیعمەتێکی خوای پەروەردگار بەدرۆ دەخەنەوە؟

ئەوانێش دەیانوت هێج نیعمەتێکی خوای پەورەدگار بە درۆ ناخەینەوە، بەڵکو سوپاسی خوای گەورە دەکەین بۆ نیعمەتەکانی (لأ بشيء شء من نعمك ربنا نكذب فلك الحمد).

دەقی فەرموودەکە:

عن جابر (رضى الله عنه) قال: خرجَ رسولُ اللّه صلّى اللّهُ علَيه وسلّمَ على أصحابِه، فقرأ عليهم سورةَ الرّحمنِ من أوّلِها إلى آخرِها فسَكَتوا فقالَ: لقد قرأتُها على الجنِّ ليلةَ الجنِّ فَكانوا أحسَنَ مردوودًا منكم، كنتُ كلَّما أتيتُ على قولِه فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ قالوا: لا بشَيءٍ من نِعَمِكَ ربَّنا نُكَذِّبُ فلَكَ الحمدُ.صحيح الترمذي

ئەوە پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) ئاوا دانتان پێدا دەنێت و وەسف و پێناسەتان دەکات، بەوەی کە ئاوێتەبوونتان لە هاوەڵانیش زیاتر بووە.

پاشان هەر ئێوە بوون لەوپەڕی ناڕەحەتی و ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چەشتی لە شاری طائیف هەر ئێوە بوون دڵیتان دایەوە بەوەی کە چوونە خزمەتی و خۆتان پێ ناساند و بوونە هۆی ئەوەی کە خورافیات و ئەوەی کە لەناو جاهیلیەتی عەرەب و جاهیلیەتی نوێدا هەیە بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە، ئەو چەند جنۆکەیەی کە خوای گەورە لە قورئاندا باسیان دەکات، هۆکاری لابردنی خورافات و ڕوونکردنەوەی ئەوەیان دا کە جنۆکەکان هیچ توانای غەیب و هەواڵە نهێنییەکانیان نییە.

هەربۆیە خوای گەورە سوڕەتێکی بەناوەوە ناو ناون، جنۆکە لە زمانی خۆیانەوە خوای گەورە بۆمان باس دەکات کە چۆن لەوپەڕی ناڕەحەتی (رسول) دا هاتن کە بە (نفر) ناویان هاتووە لە زمانی عەرەبیشدا وشەی نەفەر لە سێ کەسەوە بۆ شەش کەسە.

هاتن و لەنزیك دۆڵی (قرن ثعالب)دا گوێیان لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو کە مرۆڤێك لەو دۆڵەدا بە دەنگی شتێك دەخوێنێت کە لە قسە و گوفتاری مرۆڤ ناچێت، بەتایبەت لەو سەردەمەدا لەناو عەرەب و جنۆکەی ئەو ناوچەیەدا وشە و کاری زمانەوانی لەو پەڕی توانا و هێزدا بوو، تەنانەت شاعیرە گەورەکانی عەرەب لە جنۆکەکان وشەیان وەردەگرت، زۆرجار لە ڕێگای کاهین و ساحیرەکانەوە ئەویش بەواتای ئەوە نا کە جنۆکەکان شارەزاتر بووبن لە عەرەب لە زمانەکەیان و هۆنراوەیان نا، بەڵکو بەوەی زانیاریی و ناونیشان و ناوی جێگاکانیان وەردەگرت و عەرەبیش لە شیعرەکانیاندا بەکاریان دەهێنا.

بەڵام ئەو چەند جنۆکەیە لە دۆڵەکەدا گوێیان لە پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم) هەموو هەست و سۆزیکیان جوڵا و نەیانتوانی خۆیان ئاشکرا نەکەن بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕاستەوخۆ زانیان ئەم وتانە قسەی مرۆڤ نییە کاریگەری لەسەریان دروست کرد هەر ئەوان بوون، واتا مەبەستم ئەو چەند جنۆکەیە بوون کە چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا و بیروباوەری مرۆڤیان ڕاست کردەوە کە پەنا بەخوا لەناو عەرەب و فارس و بتپەرستەکاندا باو بوو کە خوای، پەروەردگار پەنا بەخوا ژنی لە جنۆکەکان هێناوە و لە جنسی خوا و جنۆکە مەلائیکەت دروست بووە.

هەر بۆیە سەرسام بوون بە گوێ گرتن لە پغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کاتێك کە قورئانی دەخوێند داخۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە دەنگێکی مەحزون و دەربەدەر کراو قورئانی خوێندووە.

ئەمانیش چۆن کاریگەری قورئانەکە ڕایکێشاون خۆیان بۆ نەگیراوە لەئاستی وشەکاندا.

ئاخر برایان و خوشكانی جنۆكەم لە ڕۆژی قیامەت كە مسولمانان دەچنە بەهەشت سێ كەس قورئان دەخوێنن حەزرەتی داود باوكی حەزرەتی سولەیمان (جنۆكە موسوڵمانەكان حەزرەتی سولەیمانیان زۆر خۆش دەوێت، لەبەر ئەوەی تەنها كاری بە شەیتان و عیفریتە و كافرە نالەبارەكان دەكرد).

حەزرەتی داود یەكەم جار سوڕەتی ئەلنەمل دەخوێنێت هەموو دەزانن دەنگی پێغەمبەر داود بەمۆسیقا ناوزەد كراوە بە شمشاڵ ناوبراوە ئەوەندە دەنگی خۆشە پاشان دوای پێغەمبەر داود حەزرەتی رسول الله قورئان دەخوێنێت، ئەویش سوڕەتی (محمد) دەخوێنێت كە دەنگی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆشترە لە دەنگی ئالی داود، لە پاشان خوای پەروەردگار خۆی زاتی پاك و بەرزی قورئان دەخوێنێت و سوڕەتی ئەلرەحمان دەخوێنێت، داخۆ دەنگی خوای پەروەردگار چەند خۆش بێت، تەماشای ئەو نیعمەتە بكەن خوای گەورە پێمان دەبەخشێت.

حەزقیل هاتە تەنیشتم وتی كۆڕەكە ڕابگرە.

ماكوان: بۆ؟

# کۆتایی کۆڕ و ئاشناییم لەگەڵ سوڵتان

لەگەرمەی قسە کردندا بووم حەزقیل ئاگاداری کردمەوە کەوا کۆڕەکە ڕابگرم، چوونکە سوڵتان و زۆرێك لەو جنانەی ئەوێ نائارامن و گریاون.

بە حەزقیلم وت باشە، داوای لێبوردنم کرد و وتم پشوویەکی کەم دەدەین و دەگەڕێینەوە لاتان.

من هێشتا لەسەرەتای باسەکەمدا بووم، هێشتا هیچم باس نەکردبوو، بەلامەوە سەیر بوو کەوایان پێ وتم، بۆیە چوومە لای شێخ بەرقان و پرسیم چی ڕوویداوە؟

شێخ بەرقان: هیچ ڕووی نەداوە بەڵام ئەو فەرموودەیەی کە خوای گەورە لە سوڕەتی ئەلڕەحمان دەخوێنێتەوە زۆر کاریگەری لە سەر سوڵتان هەبووە نارەحەت بووە، ئێمەش بەباشمان زانی کۆڕەکە ڕابگرین تا پشوویەك دەدات.

ماکوان: ئەی ناکرێت بگری و خوای گەورە ئەجر و پاداشتی بۆ بنووسێت؟

شێخ بەرقان: ئاخر ڕاستە ئێوە توانای گریانتان هەیە و خوای گەورە فرمێسکی پێ بەخشیوون، بەڵام لەچاوی مرۆڤەکانەوە تەماشای ئێمە مەکە، جنۆکە کە بێتاقەت دەبیت دەبێت بفڕێت یان لەناو دەریادا خۆی نغرۆ بکات بۆ ماوەیەک. پێویستیان بە جۆرێك وزە هەیە کە ئەو شێوە سیستەمە لەناو ئێوەدا نییە.

ماكوان: جا وەڵڵا شێخ دەبێت من قسە نەكەم دەنا هەمووتان دەفڕن، ئەگەر بچمە ناو باسەكەم بە قووڵی.

شێخ بەرقان: هەوڵبدە تۆ ئارام بە، توانای قسەكردن و دەربڕینت زۆر باشە، بەڵام هەوڵبدە زیاتر لەسەرخۆ تر قسە بكەیت بۆ ئەوەی موتەرجیمەكان فریا بكەون تەرجومەی بكەن.

ماكوان: بۆ لەمن تێناگەن؟

شێخ بەرقان: ئەی خۆ تۆ لەكوردستان نیت تا هەمووی بە كوردی قسە بكەن، چەندین زمان لەناو جنۆكەكان هەیە، تۆ لە مەملەكەتی سوڵتانی، كوردی، عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی، فڕەنسی، ئیسپانی و ئەڵمانی و...هتد لێرە بوونیان هەیە، حەزقیل زیاد لە ٢٠ موتەرجمی بەتوانای بۆ ئەو زمانانە ئامادەكردووە.

ماكوان: وەڵڵاهی من ئەمانەم نەزانیوە، دەبوو پێشتر ئاگادارتان بكردمایەتەوە.

شێخ بەرقان: كەمێكی تر دەست پێ بكەرەوە، بابەتەكەت بەهێزە دیارە! هەوڵبدە باسی ژیانی جنۆكەكان بكەیت، بەتایبەت لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

ماكوان: باشە، من هێشتا دەستم پێ نەكردبوو ئێوە هەموو فڕین!.

بە پێكەنینەوە شێخ بەرقان: لای ئێمە ئاوایە بە ئاسایی وەریبگرە.

دەست پێكردنەوەی كۆڕەكە...

سڵاوتان لێبێت بە سڵاوی ئیسلام (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته)

لە گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە شاری طائف، کە رسول الله بەدڵشکاوی و مەلولی گەڕایەوە، شەوی بەسەردا هات لە تەنیشت دارخورمایەك لەو دۆڵەدا کە ناسراوە بە (قرن ثعالب) نوێژی خوێند و ٧ کەس لە جنۆکەکانی (نصيبين) گوێیان لە دەنگی پێغەمبەری نازدار بوو کە قورئانی دەخوێند.

ڕۆیشتن هەواڵەکەیان دایەوە بە خزم و کەسوکاریان، وتیان گوێمان لە خوێندنی دەنگێکی عەجیب و سەرسوڕهێنەر بوو، بەناوی قورئان (ئەڵبەت دوای ئەوەی کە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر و زانیان ئەو وشانە کەلامی خوای پەرورەدگارە و ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر و پێی دەوترێت قورئان).

هەر ئەوانیش بوون کە ئاشکرایان کرد بۆ مرۆڤەکان کە ئەوەی گوێیان لێی بوو ڕێنوێنی کردنە بۆ ئەوەی مرۆڤ بگەیەنیتە پلەی پێگەیشتن و بڕیار ئەدەیت لەمەودوا بەهیچ شێوەیەك هاوبەش و شەریك بۆ خوای پەروەدگار بڕیار نەدەین.

واپێ دەچیت کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سوڕەتی (هود) یاخود (یونس) ی خوێندبێت، ئەوانیش جنۆکەی نیشتەجێی ناوچەکانی (نصيبين) بوون. ئەو ناوچەیە زۆربەی مەسیحی بووە، هەرچەندە نصيبين دوورە لەناوچەی نیوەدوورگەی عەرەبییەوە، بەڵام قەدەری خوای گەورەیە کە بۆچی هاتوون و کاریان چی بووە ئەو جنۆکانە، تا ئێستا هیچ سەرچاوەیەك دەست من نەکەوتووە لەبارەیەوە، تەنها قەدەری خوای گەورەیە کە ئەو شەوە گوێیان لە پێغەمبەر بووە. کە سڵشکا و مەلول کە بوغرایی و لووتبەرزیی عەشیرەتی (سەقیف) لە شاری طائف ئەو نازدارەیان بەرد باران کرد مرۆڤەکان، بەڕێزترین مەخلوق بەرد باران

دەكەن، بەڵام خوای گەورە دڵی خۆشەویستمان دەداتەوە بە برا جنۆكەكانمان دێنە لای پرسیاری لێ دەكەن لەوەی گوێیان لێبوو لەو وشانە ماناو مەبەست و واتای چییە، چۆن هاتووە ئەو كەسە ئەمە چۆن دەزانێت، خۆی چییە و كێیە؟ ئەم هەموو پرسیارە بەدەر نییە لە (نەوامیسی خوای پەروەردگار واتا یاساكانی كەون).

بۆ ئەوەیە كەلە دواییدا ئەو ڕووداوە خوای گەورە بە كۆمەڵێك وشەی كەم بەڵام پڕ ئاسمانێك مانا لە سورەتێكدا بەناوی جنۆكە بۆمان باس دەكات كە لە یەكتاپەرستییەوە دەست پێ دەكات، بەجۆری ژیان و هەڵسوكەوت و ئاداب و تەنانەت جیاوازی ڕا و بۆچوونیان و جیاوازی لە طەریقەت و بیروباوەڕیان.

هەرچەندە كۆمەڵێك لە زانایان دەفەرموون؛ گوێیان لە پێغەمبەری خوا دەبێت كە قورئان دەخوێنیت دەگەڕێنەوە بۆ یەمەن، چوونكە نصیبین لە وڵاتی یەمەنیش هەیە و خەڵكەكەی جوولەكە بوون، نصیبین لای موسڵ یاخود نەینەوا هەن كە مەسیحین، لەهەردوو حاڵەتەكەدا جنۆكەكان ئاوێتە بوون لەگەڵ قورئان و بانگەوازی ئیسلامیان بڵاوكردۆتەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناوی ئێوەی بە هاوڕێ نەبردووە وەكو هاوەڵەكانی، بەلكو ئیبن و مەسعود دەڵێت: شەوێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە نێوانماندا خەوتبوو كە هەڵساین لەخەو دیار نەمابوو، كاتێك كە گەڕایەوە فەرمووی جنۆكەكان بانگیان كردم چووم بۆلایان و قورئانم بۆ خوێندن، پاشان جێگای دانیشتن و ژوانەكەی نیشانی هاوەڵان دا كە هێشتا پشكۆی ئاگرەكە مابوو ونەببووە ژیلەمۆ.

پاشان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی بسم الله لە خواردن بكەن و ئێسقان بۆ برا جنۆكەكانتانە، خۆتانی پێ پاك مەكەنەوە

و خواردنی ئەوانە، هەڵبەت فەرمودەکە زۆرترە و باسەکە لە ئین مەسعودەوە دەگێردرێتەوە، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئێوەی کردۆتە برا و پشت و پەنا بۆ ئێمەی مرۆڤ و هەروەها ئێمەش براین بۆ ئێوە هاوکاری و پشتیوانتانین لە ڕاستیدا ئەمە نێوانی ئێمە و ئێوەی جنۆکەیە.

بەڵام بەداخەوە لە جاهیلیەتی نوێدا و هەروەها لە کۆنیشدا واکراوە لە ئێوەی جنۆکەی خواناس و ئیماندار کە هەموو بەچاوی شەیتان و خراپەکاری زۆرێك لە خورافیات و خورافەکاری تەنانەت هەندێك لە مرۆڤەکان هەر بڕوای بە بوونتان نییە.

ئەوەی لێرەدا خاڵی گەوهەرییە و باسی بکەم ئەوەیە کە جنۆکەکان خۆیان ئاماژە بەوە دەکەن کە توانای زانینی هیچ زانیارییەکی غەیبی و نهێنییە ئاسمانییەکانیان نییە.

خۆیان دەڵێن قورئان عەجیبە واتا هەر شتێك سەرسوڕهێنەر بوو واتا ئاسایی دەرچووە سەرچاوەی نوورە، وەکو خۆتان وزە و ئەنێرژین بۆ ئێوە و بۆ ئێمەی مرۆڤ، وشەی ڕوشد کە بەکارهاتووە لەسەر زمانی جنۆکەکان مانای زۆر بەرفراوانی هەیە.

ئیعتراف کردنتان بە تاك و تەنهایی خوای پەروەردگار، دوورکەوتنەوەیە لە خورافات و شیرك و کاری چەواشەکاری جادووبازەکان، بۆ یەکەم جار وشەی (والجد) بەکاردەهێنن جنۆکەکان، کە واتای عەزەمەتی (العظمة) خوای پەروەردگارە، دوور لەهەموو چەواشەکاری و هەڵخڵەتاندنێك کە یەکانگیرە لەگەڵ مەقامی خوای پەروەردگار پاك و بێ گەردییە لە زیکر و تەسبیحاتی خوای موتەعال.

هەر خۆتان جنۆکەکان ئیعتیراف بەوە دەکەن کە زەمەنی جاد و کاهین و سیحربازی بەسەرچوو لەدوای هاتنی پەیامی ئیسلام، پێشتر کاریان دەکرد لەگەڵ عەراف و کاهین و ساحیرەکاندا، بەڵام ئێستا سەرچاوەی زانیارییان کە ئاسمان بوو لە ڕێگای فریشتەکانەوە بە گوێگرتن بە دزییەوە ئەو ڕێگایەش داخرا، چوونکە ئاسمان پاسەوانییەتی زۆر قورس چاودێرییەکی بەهێزی کەوتۆتە سەر بۆ هیچ جۆرێک ئەوانەی کە بانگەشەی زانیاری و غەیبیان دەکرد دەرگاکانیان داخرا. ئیتر دینی ڕوشد و حەقیقەت هاتووە، پێویستە هەموو شوونێی بکەون ئەمەی باسم کرد هەموو لە سوڕەتی جنۆکە لە ئایەتی یەکەم تا کۆتایی بەرجەستە دەبێت و دەستم کرد بە خوێندنەوەی سوڕەتی (الجن) و پاشان تەفسیرێکی خێرا.

ئەوە جەوهەری ناوەرۆکەکە بوو.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

واتە: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾

واتە: ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: وەحی و نیگام پێ ڕاگەیەنراوە کە دەستەیەك لە پەرییان گوێیان بۆ (خوێندنەوەی قورئان، وە لە قورئانێکی سەرسوڕهێنەر گرتووە کە تەواو بووە وتوویانە: ئێمە گوێمان لە قوڕئانێکی (کاریگەر گرت).

يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴿٢﴾

واتە: هیدایەت دەدات بۆ ڕێبازی ژیری و تێگەیشتن، ئێمەش باوەڕمان پێ کرد و هەرگیز کەس ناکەینە شەریك و هاوەڵ بۆ پەروەردگارمان.

وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾

بەڕاستی پەروەردگاری پایە بڵندمان مەزن و گەورەیە، بێگومان ئەو زاتە نە هاوسەری هەیەو نە، نەوەش.

وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا ﴿٤﴾

بێدین و یاخییەکەمان (ئیبلیس) شتی زۆر ناڕەواو نابەجێی بۆ خوا هەڵبەستووە (دەیەوێت هەمووان گومڕا بکات).

وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾

ئێمە گومانمان وابوو کە دەستەی ئادەمیزاد و پەری درۆ بۆ خوا بە ڕەوا نابینن!!

وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾

کاتێ کە پیاوانێك لە دەستەی ئادەمیزاد پەنایان دەبرد بە پیاوانێك لە دەستەی پەرییەکان (پەرییەکان ئەمەیان بەهەل زانی و) ئەوەندەی تر ماندوویان کردن (بە خورافات و شتی بێ سەرو بەر).

وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾

ئەوانیش گومانیان وەك گومانی ئێوە وابوو کە: ئیتر خوا هیچ فرستادەیەکی تر نانێرێت.

وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾

ئێمە بەرەو ئاسمان کشاین و هەست و هۆشمان خستە کار، (سەرنجمان دا) کە پڕە لە پاسەوانی بە توانا و بێ شوومار، نەیزەکیش (بە هەموو لایەکدا دەکشا، دیاربوو کە ڕووداوێکی گەورە ڕووی دابوو).

وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾

ئێمە جاران لە هەندێک شووێنٰ خۆمان حەشار دە دا بۆ گوێگرتن و دەنگوباس بیستن، بەڵام ئێستا ئەوەی بیەوێت گوێ بگرێت یەکسەر نەیزەکێکی بۆ ئامادەیە و بۆی دەهاوێژێت و (لەناوی دەبات).

وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾

جا ئێمە نازانین ئایا نەخشەیەکی شەڕ و وێرانکاری کێشراوە بۆ دانیشتوانی سەر زەوی، یاخود پەروەردگاریان دەیەوێت ڕێنمونی و هیدایەتیان بدات (بۆ دینداریی و سەرفڕازی).

بێگومان ئێمە کەسانی چاک و (دیندارمان) تیا هەیە، هەروەها کەسانی تریش کە بەو شێوەیە نین، (ئێمە جاران) ڕێگەو ڕیباز و بەرنامەی هەمەجۆرمان گرتبوە بەر (بەڵام ئێستا بەرنامەی ئیسلام ڕوون و دیارە).

وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعجِزَ اللَّهَ فِي الْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَه هَرَبًا ﴿١٢﴾

ئێمە دڵنیا بووین کە هەرگیز لە ژێر دەسەڵاتی خوا دەرناچین لە زەویدا، هەروەها بە هەڵاتن و خۆ دزینەوەش (لە ئاسمانەکاندا) لێی ون نابین (چوونکە ئەو زاتە ئاگاداری گەردیلە و لە گەردیلەش بچوکترە).

وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى آمَنَّا بِهِ فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾

ئەوسا ئیتر ئێمە کە گوێمان لە بانگەوازی هیدایەت بوو، یەکسەر باوەڕمان پێکرد، جا ئەوەی ئیمان بێنێت بە پەروەردگاری، ئیتر ناترسێت لەوەی کردەوە چاکەکانی بێ نرخ تەماشا بکرێت، لە گوناهەکانیشی چاوپۆشی نەکرێت.

وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا ﴿١٤﴾

هەروەها لەناو ئێمەدا کەسانی موسوڵمان و خواناس هەیە، کەسانی بێ دین و خوانەناس و سەرکەشیش، جا ئەوەی موسوڵمان دەبێت دیارە کە ڕێبازی سەرفرازی دۆزیوەتەوە.

وَأَمَّا الْقَاسِطُونَ فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾

بەڵام خوانەناس و سەرکەشەکان (بەسەریانەوە ناچێت) بەڵکو دەبنە سووتەمەنی دۆزەخ (لێرەدا گوفتاری پەرییە ئیماندارەکان تەواو دەبێت).

وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاء غَدَقًا ﴿١٦﴾

جا ئەگەر (ئەو خەڵکە) ڕێگەی ئیسلامەتی و دینداری بگرنە بەر ئێمە بارانی پڕ بەرەکەتیان بەسەردا دەبارێنین.

لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾

تا بەوەش تاقییان بكەینەوە و (بەتەواویی دەركەوێت كێ بەندەی ڕاستەقینەیە و كێش بە دنیا هەڵدەخەڵەتێت) جا ئەوەی لە یاد و بەرنامەی پەروەردگاری لابدات، تووشی سزاو ئازارێكی بەردەوام و ناسۆری دەكات.

وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾

(بیرتان نەچیت كە): بەڕاستی مزگەوتەكان تایبەتی خوای گەورەن (دەبێ هەر ئەوی تیا بپەرسترێت و ناوی تر نەكرێتە شەریك بۆی) ناوی كەس نەكرێتە هاوتای ئەو زاتە.

وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾

جا كاتێك كە بەندەی خوا (محمد صلى الله عليه وسلم) بانگەوازی بۆ شووێنكەوتنی بەرنامەی خوا كرد (ئەو خەڵكە بە دەستەی ئادەمیزاد و پەرییەوە) خەریك بوو لەناوی بەرن و (نووری خوا بكوژێننەوە).

قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَدًا ﴿٢٠﴾

(پێیان) بڵێ: (من هەر بەردەوام دەبم) هەر بانگەواز دەكەم بۆ لای پەروەردگارم، كەسیش ناكەمە هاوەڵ و شەریكی.

قُلْ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾

هەروەها (پێیان) بڵێ: من هیچ جۆرە زەرەر و زیانێكم بەدەست نییە، هەروەها هیدایەتیش بەدەست من نییە (ئەگەر خۆتان بیرنەكەنەوە، بەزۆر قەناعەت دروست نابێت).

قُلْ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾

وە بڵێ: (ئەگەر خوا بیەوێت تووشی زیانێکم بکات) کەس ناتوانێت پەنام بدات، وە هەرگیز کەس نابێتە پشتیوان و یاریدەدەرم.

إِلَّا بَلَاغًا مِّنَ اللَّهِ وَرِسَالَاتِهِ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ﴿٢٣﴾

(بەڵکو من تەنها) گەیاندنی پەیام و بەرنامەی خوام لەسەرە، جا ئەوەی لە خوا و پێغەمبەرەکەی یاخی ببێت ئەوە با دڵنیا بێت کە دۆزەخی بۆ ئامادە کراوە لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەدا بۆ هەمیشە و هەتاهەتایی.

حَتَّى إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾

(ئەو موشریکانە) کاتێ کە هەڕەشەکان یەخەیان پێ دەگرێت ئەو کاتە ئیتر دەزانن، کێ پشتیوانی لاوازە و ژمارەی کەمە، (ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ژمارەی ئیمانداران و فریشتەکان و سەربازە بێ شوومارەکانی خوای گەورەدا).

قُلْ إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَدًا ﴿٢٥﴾

هەروەها (پێیان) بڵێ کە: من نازانم ئایا هەڕەشەکانی خوا نزیکە یاخود دوای ماوەیەك پەروەردگارم پێشی دەهێنێت.

عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا ﴿٢٦﴾

ئەو زاتەی زانای نهێنی و شاراوەکانە، کەس لە نهێنی و شاراوەکانی نازانێ.

إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا ﴿٢٧﴾

مەگەر بۆ فرستادەیەك، کە خوا خۆی ڕازی بێ (بەوەی هەندێ نهێنی بزانێت)، ئەو کاتە فریشتە دەکاتە پاسەوانی لە بەروپشتەوە (تا پەری و شەیتانەکان بتوانن زەفەری پێ بەرن)..

لِيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا ﴿٢٨﴾

تا خوا چاك بزانێت و ئاگاداربێت لەوەی کە بە ڕێکوپێکی پەیام و ڕێنموونی پەروەردگاریان گەیاندووە، هەرچەندە خوا بە هەموو ئەو شتانەش ئاگادارە کە کردوویانە و پێی هەستاون، وە هەموو شتێك لای ئەو زاتە سەرژمێر کراوە هیچ شتێکی لێ ون نابێت.

پاشان لە کۆڕەکە تەواو بووم داوام کرد ئەگەر پرسیارێك هەیە من لە خزمەتاندا دەبم.

حەزقیل: سێ پرسیار هاتووە پرسیاری یەکەم دەڵێت بۆ مرۆڤەکان بەگشتی لە جنۆکە دەترسن؟

ماکوان: بە دوو هۆکار..

هۆکاری یەکەم: لە ڕاستیدا خوانەناس و کافرەکانتان ئازاری مرۆڤەکان ئەدەن. ئەگەرچی دەسەڵات و توانا و وزەیان نییە، بەڵام خوودی مرۆڤەکان ئەو دەسەڵاتە دەبەخشنە جنۆکە شەیتانەکان.

هۆکاری دووەم: لەبەر ئەوەی نابینرێن و خەڵکی هەر هەواڵی ئێوەی بیستووە، ئەمەش هۆکاری ئەو ئەو ترسەیە و زۆرجار مرۆڤەکان لە خۆیانەوە فەنتازیا دروست دەکەن.

حەزقیل: پرسیاری دووەم بۆچی هەندێک لە ئێوەی مرۆڤ کار لەگەڵ شەیتانەکان دەکەن بۆ ئەوەی دژایەتی خودی مرۆڤ بکەن؟

ماکوان: مرۆڤ بەسروشتی دروستکراوێکی لاوازە، بۆ ئەوەی لاوازییەکانی پڕ بکاتەوە، پەنا بۆ لاوازتر دەبات لەخۆی، شەیتانەکان ڕقی ئەوەیان لەدڵدایە کە نەبوونەتە جێنشین لەسەر ئەم زەویەدا. بەهەڵخەڵەتاندن ئەو پەیوەندییە دروست دەکەن.

بۆ نمونە کاتێك (ئیبلیس) باوکە ئادەمی ئیمەی هەڵخڵەتاند پێی وت لەو دارە بخۆ، ئەبیتە فریشتە و بە خلودی (نەمریی) دەمینیتەوە، لاوازییەکە لێرەدایە، باوکە ئادەم لەبیری چووەوە کە ئەو لە فریشتە بەڕێزترە و هەموو فریشتەکان سوجدەی ڕێزیان بۆ بردووە، وە ئەو هەربە خلودی دەمێنێتەوە خوای گەورە نایخاتەوە عەدەم، کەچی باوکە ئادەم هەڵخڵەتا و بەقسەی شەیتانی کرد و دایکە حەواش چاوی لێکرد.

کەواتە مرۆڤ سۆزی زیاترە لە ئەقڵی شەیتانیش کار لەسەر ئەقڵ ناکات، بەڵکو کار لەسەر سۆز و عاطیفەی مرۆڤ دەکات، زۆرجار خەڵکی بەتایبەت ئافرەتان پەنا بۆ سیحر و جادوو دەبەن بۆ بە دەستهێنانی شتێک، بەڵام نازانن بەسەدەها شتی تر لەدەست دەدەن.

حەزقیل: پرسیاری سێیەم: ماکوان هەستی چۆنە کە لەناو ئێمەی جنۆکەدایە؟

ماکوان: زۆر خۆشحاڵم و زۆر سوودم وەرگرتووە لە ئێوەی جنۆکە و هیوام وایە ئێوەش سوودتان وەرگرتبێت لە من، زیاتر نزیکبوونەوەی من لە ئێوە بەو هۆکارەیە کە بتوانم ئەوەی دەستم دەکەوێت لە جیهانی ئێوەی جنۆکە بیگوازمەوە بۆ جیهانی مرۆڤەکان.

حەزقیل: بەناوی خۆمانەوە سوپاسی ماکوان کەریم دەکەین، کۆڕەکە لێرەدا کۆتایی هات بفەرموون.

ماکوان: بەرنامە چییە حەزەی برام چی دەکەیت؟

حەزقیل: سوڵتان چاوەڕوانی تۆیە، لە دیوانی (دیوەخانی) ئەو نان دەخۆین بڕۆ بۆلای چاوەڕوانی تۆیە لەگەڵ شێخ بەرقان.

ماکوان: باشە خێرا پێم بڵێ کۆڕەکە چۆن بوو؟

حەزقیل: زۆرباش بوو، دوایی لەولا قسە دەکەین بڕۆ چاوەڕێتن، با دوا نەکەویت.

ماکوان: باشە، حەزەی برام.

چووم سڵاوم کرد لە سوڵتان و شێخ بەرقان و خۆشحاڵییان دەربڕی کە کۆڕەکەیان زۆر بەدڵ بووە، سوڵتان ئاماژەی کرد بۆچەند شتی گرنگ کە ساڵی داهاتوو لە کۆنگرەی جنۆکەکان باسی بکەم.

سوڵتان: پێویستە باسی ئەو جەنگانە بکەیت کە جنۆکەکان لەگەڵ موسوڵمانەکان پشت و پەنابوون جەنگیان کردووە بەهاوبەشی دژی کافر و بێباوەڕە مرۆڤ و شەیتانەکان.

ماکوان: جەنابی سوڵتان لەڕووی زانستییەوە لەناو ئێمەی مرۆڤ دا ئەگەر بەڵگەیەك یان دەقێکی قورئان و فەرموودەی لەسەر نەبێت من ناتوانم باسی بکەم، چوونکە دنیای ئێوە نادیارە ئەگەر بێت و ئەو شتانەی کەمن دەیزانم باسی بکەم، خەڵکی تر سوودی لێوەردەگرن بۆ کاری خراپە و

چەواشەکاری، دەکرێت لەڕێگای بەڵگەی شەرعی هەندێکیان باس بکەم، بەڵام هەندێکی تریان لەگەڵ خۆم دەبەم بۆ گۆڕ و نابێت کەس بزانێت.

سوڵتان: بەڕاستی نازانم چیت پێ بڵێم، خۆشحاڵت کردم لەو بیروبۆچوون عەقیدەت، بڕوا بکە زۆرجار پیاوچاکانمان کردۆتە هاوڕێی خۆمان تێکەوتووە و ئەوەندە داوای شتی لێکردووین، بەڵام ئەوەی منی سەرسام کردووە تۆ داوا لە ئێمە ناکەیت، بەڵکو هەر پێمان دەبەخشیت.

شێخ بەرقان: ئاخر جەنابی سوڵتان هەر ئەوە وای کردووە کە ماکوانمان خۆش بوێت و زیاتر هاوڕێیەتی بکەین، تاکەکەسێکە نەلە ئێمە و نەلە جنۆکە شەیتانەکان داواکاری نییە.

ئەوەی لێرە بۆ من وەکو ماکوان ڕوونبوویەوە ئەوەبوو کە ئەگەر داوا لە جنۆکە موسوڵمانەکان بکرێت دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەیان لێت و و داواکاری لە جنۆکەی شەیتان دەبێتە هۆکاری کوفر و سیحر.

ماکوان: سوپاسی هەستی ئێوە دەکەم، پاشان دەبێت ئەوە بزانن کە هاوڕێیەتی مەنفەعەت نییە، هاوڕێیەتی مانای تێکەڵ بوونە لە خۆشی و ناخۆشی دا.

شەکوا و سکاڵام لەلای هیچ کەس نەکردووە، بۆیە سکاڵام هەر لای پەروەردگارە، ئەوەی سکاڵا بەرێتە لای غەیری پەروەردگار زەلیل دەبێت.

عەرەب دەڵێت: (الشكوى لغير الله مذلة) هەمیشە داوام لە خوای گەورەیە.

سوڵتان: حاجی ماکوان بەڵام دەبێت بزانیت مەنهەجی ڕاست و دروست مەنهەجی میحنەتە، خۆتی بۆ ئامادە بکە. چوونکە بەدڵنیاییەوە تووشی ناڕەحەتی زۆر دەبیت، خۆتی لەسەر ڕابهێنە.

ماکوان: جەنابی سوڵتان لەبەرچاومە کە تووشی فیتنەی زۆر دەبم، دەشزانم هەموو فیتنەکان نیعمەتن.

شێخ بەرقان: ئەی ئافەرین وشەی فیتنە خەڵك بە خراپ لێی تێگەیشتووە، وشەی فیتنە واتا پاککردنەوەی خەوش و خاڵ و پیسی، ئاڵتون دەسووتێنن تا ئاڵتونە سافەکە دەردەچێت.

ماکوان: ئاخر یاشێخ ئافاتەکە ناوی فیتنەیە، کە دەبێت تەحەمولی بکەیت تاکو ئاڵتوونەکە دەردەچێت.

سوڵتان: بەپشتیوانی خوای پەروەردگار بەرگەی دەگرین و ڕێگای زۆرێك لە خواناسانی ئێمە و ئێوەش بوو، تەماشای ئیمام احمد بکە یان ئیبن تەیمیە..هتد. فەرموو با نانەکەمان بخۆین.

پێش نان خواردن کازۆلی بانگ کرد وتی کوا دیارییەکەی ماکوان؟

کازۆڵ چوو هێنای لەناو سندوقێکی زیوی دابوو دایە دەستی و ئەویش پێشکەشی منی کرد.

ماکوان: خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە، بەڵام نەمکردەوە بزانم چییە و چی تێدایە لە مێزەکە لە تەنیشت خۆمەوە دامنا و ئەوان سەرقاڵ بوون بە قسەکردنەوە، حەزقیل دوور بوو لێمەوە، من لە نێوانی سوڵتان و شێخ بەرقان دانیشتبووم خەریك بوو دڵم ئەتەقی بۆ ئەوەی بزانم ناو ئەو سندوقە چی تێدایە و یەك دووجار دەستم بۆ برد بیکەمەوە، بۆم نەکرایەوە

لە جێگای خۆی دامناوە، هەروەها بە ئاسایی چپاندم بەگوێی شێخ بەرقان وتم ئەم سندوقە چییە؟

شێخ بەرقان: ئەوە دیاری جەنابی سوڵتانە خۆی پێت دەڵێت، چی تێدایە.

ماکوان: زۆرباشە، جا من لە دنیادا ڕقم لەم جددیات و ئەتێکێتانەیە، چاوەڕێین بزانین جەنابی سوڵتان دیارییەکەی چییە.

دەست کرا بە نان خواردن، خواردنێکی زۆری ئاوییان هێنا کە پێیان دەوت میوەی دەریا، خواردنێکی زۆر بەتام و خۆش بوو، جۆرە سرکەیەکمان پێوە دەخوارد لە سرکەی لیمۆ دەچوو، شەربەتی ترێ و مێووژ و شەربەتی لیمۆ و هەناریشیان دانابوو، جۆرەها سەوزەی لێبوو جۆریك گەڵا دانرابوو پرسیم چییە وتیان ئەوە گژوگیای ناو دەریایە، تامم کرد سوێر بوو، بەڵام گەڵاکەی زۆر گەورە بوو بۆم قوت نەدەدەرا.

شێخ بەرقان: ئەو گیای دەریاییە زۆر باشە بۆ جگەر، بۆ ڕیخۆڵە و بۆلابردنی ورگی زل و چەوری. لە سەروو هەموویەوە بۆ پیاو و ژن زۆر باشە بۆ سەرجێی و هەزار و یەك دەرد چارەسەر دەکات.

ماکوان: دەست خۆش سوڵتان گیان.

زوو زوو سوڵتان دەیوت حاج ماکوان کوڕەکەتم بەدڵ بوو، کەمێکی پێچوو سوڵتان وتی ئەو کتێبە کە لەناو ئەو سندوقەدایە، پێشکەشە بە تۆ، لەگەلیدا کازۆڵ هاوکاریت دەکات بۆ تەرجومە کردنی بۆ زمانی ئێوەی مرۆڤ، تاکە مرۆڤێکی کە ئەم نهێنییەت پی بەخشرابێت، سندوقەکە لە نێوانی هەردووکماندا بوو هەڵی گرت و دایە دەست کازۆڵ و وتی تۆ

بەرپرسیاری لەم کتێبە تا حاجی ماکوان بەتەواوەتی فێر دەکەیت و هەمووی دەنووسیتەوە بە زمانی دایک.

کازۆڵ: بێخەمبە تا هەمووی لەبەرنەکات وازی لێناهێنم.

ماکوان: جەنابی سوڵتان دووبارە و سەد بارە سوپاس بۆ ئەم دیارییەت بەدڵنیاییەوە دەزانم بە نرخە، دەشزانم دەزانیت کە من کتێبم خۆش دەوێت و خۆشەویستی تەواوم بۆ کتێب هەیە، بەڵام نەمزانی ئەم کتێبەی جەنابت باسی چی دەکات؟

سوڵتان: لەڕاستیدا ئەم کتێبە باووباپیرانمان نووسیویانە، پڕیەتی لەکاری حەکیمباشی، تۆش سوودی لێ وەربگرە بۆ خۆت و خەڵکی موسوڵمان، بەڵکو خوای پەروەردگار ئەجرو پاداشتت لەسەر بداتەوە.

ماکوان: ئەمە شتێکی نایابە خوا جەزای خێرتان بداتەوە.

سوڵتان: وەکو عەرزم کردی لەگەڵیشیدا حەکیمباشی دەنێرم کە کازۆڵ بۆت شەرح بکات، ئەویش جۆری گوڵ و گیا و گەڵا و ئاو و خۆراکت پێ بناسێنێت و لەڕووی مەیدانییەوە پیادەی بکەیت.

ماکوان: خوای گەورە پاداشتی خێرتان بداتەوە، جەنابی سوڵتان هەرگیز ئەو دیارییە بەنرخەت لەبیرناکەم و ئەم خوان و میوانداریەی بەڕێزیشت لەبیرناکەم.

سوڵتان: ئاساییە منیش دێم بۆماڵت و نانی تریش پێکەوە دەخۆین.

ماکوان: لەخزمەتام جەنابی سوڵتان، گەورەم دەکەیت بێیتە ماڵم.

کازۆڵ: ماکوان پێویستە بڕۆین کات بۆ تۆ درەنگە پێویستە بگەڕێیتەوە.

ماکوان: زۆر باشە بفەرموون، من ماڵئاوایتان لێ دەکەم و خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەك بێت. لە دیوان هاتمە دەرەوە بەڕێزەوە ماڵئاوایم لێ کراو بەرەو نەرویج لەگەڵ کازۆڵ گەڕامەوە.

هاتمەوە ئەو جێگایەی کە لێوەی دەرچووم لە دارستانەکەدا، ماڵئاواییم لە کازۆڵ کرد و وتم کتێبەکەت بیر نەچێت.

کازۆڵ: بێخەم بە، ئەوە فەرمانی سوڵتانە لە بیرمان ناچیتەوە بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

گەڕامەوە بەرەو ماڵەوە، تەماشای مۆبایلەکەم کرد میلاد زیاد لە دە جار پەیوەندی پێوە کردبووم، خێرا پەیوەندیم پێوە کردەوە و وتم میلاد باشی خێر چی بووە؟ وا دە جار تەلەفۆنت کردووە، ببوورە لە دەرەوە بووم تەلەفۆنەکەم لەماڵ بەجێهێشتبوو.

میلاد: کاك ماکوان، فرانك تەلەفۆنی بۆ کردم دەیوت یارییەکە ناکرێت.

ماکوان: بۆ؟ ئەم هەتیوە وا بزانم چاك ئیزعاجمان دەکات.

میلاد: نا کاك ماکوان، لە سوودی ئێمەیە، چوونکە بەبۆنەی ئەم نەخۆشییەوە (کۆڤید) ناکرێت، وتی بە ماکوان بڵێ دەتوانێت کۆنتراکتەکەی کرۆنیکا هەڵبووەشێنێتەوە بە هۆکاری نەکردنی یارییەکە.

ماکوان: دەی مادام وایە سوپاس بۆ خوا، وەڵلا ئەوە شتێکی دڵخۆشکەرە، ئیتر لەو خەمەش ڕزگارم بوو، زۆر باشە تۆ لەگەڵی بە و کۆنتراکتەکەی پێ هەڵبووەشێنەوە، ئەی حاجی فاتم و کرۆنیکا باشن؟

میلاد: وەڵڵا باشن، بەڵام ئەو شتێکی تری وت زۆرم لا سەیر بوو بۆیە تەلەفۆنم بۆ کردیت.

ماکوان: چییە میلاد گیان خێرە؟

میلاد: دەیوت ماکوان خۆی هەڵبژاردووە بێت بۆ کیك بۆکسین، ڕاست دەکات؟

ماکوان: نەوەڵڵا درۆ دەکات شتی وا نییە، جا لەگەڵ ڕێزم بۆ تۆ من چۆن بەم تەمەنەوە کاری وا دەکەم کە لە توانا و هێزمدا نەبێت.

میلاد: باشە کاك ماکوان تۆ جنسیەی فینلەندیت هەیە یان نەرویجی؟

ماکوان: من جنسییەی نەرویجیم هەیە.

میلاد: وەڵڵاهی ئەو فرانکە دەیوت ماکوان کەریم جنسیەی فینلەندی هەیە و یەکەمی کیك بۆکسینە لە وڵاتی فینلەندا.

ماکوان: ئەوە من نیم، ئەو بێ ئەقڵە لێی تێك چووە، کوڕێکی کوردی خەڵکی کرماشانی لای ئێوەیە، ئەویش زۆر بەهێزە، ڕاستە لە فینلەندا دەژی، بڕۆ گوگڵ ناوەکەی لێبدە ئەیبینیت، هەر تۆزێکیش لە من ئەچیت.

میلاد: وەڵڵاهی کاك ماکوان تووشی شۆکی کردم، وتم بڵێیت کاك ماکوان بڕوات و بە من نەڵێت، جاخۆ شێت دەبووم کەسێك بۆکسێکت لێ بدات.

ماکوان: قوربانی تۆبم میلاد گیان باشتێکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە، ساڵی ٢٠١٧ چووم بۆ وڵاتی فینلەندا بانگێشت کرابووم بۆ مەولودی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لەگەڕانەوەمدا لە فڕۆکەخانەی هێلسنکی لە

فینلەندا زۆر ڕێزم لێگیرا، وتم تۆ بڵێیت لەبەر مەولودی پێغەمبەر بێت، دوایی بۆم دەرکەوت کە پاسپۆرتەکەم نووسراوە ماکوان کەریم وایانزانی بوو ئەو ماکوانەم، ئیتر ڕێزیان گرتم و لە ڤی ئای پی یەوە بردمیانە ناو فڕۆکەکە، تا دوایی زانیان کە ئەو نیم هەر حسابیشیان بۆ نەکردم!.

میلاد: باشە کاک ماکوان گیان باوکم سڵاوی هەیە بۆت.

ماکوان: حورمەتی زۆرم بۆ باوك و دایکی بەڕێزت، ئەی میلا خانی خوشکت چۆنە؟

میلاد: دوعای خێرت بۆ دەکات، هەمیشە دایکم گلەییت لێ دەکات دەڵێت بۆ نایەت بۆ ماڵمان؟

ماکوان: دایکت خوشکی گەورەی منە، لەم نزیکانە بە خزمەتی دەگەم.

ماڵئاوایم کرد لە میلاد، ماندوو بووم خەوم لێکەوت، بۆ بەیانی چووم بۆ ماسی گرتن، لە ڕێگا وەرماشم لێ پەیدا بوو.

وەرماش: چییە لەوەتەی سوڵتانت ناسیوە سڵاو لە ئێمە ناکەیت؟

ماکوان: جاسوسییش دەکەیت بەسەرمەوە تەڕەماش؟

وەرماش: من ئاگاداری ورد و درشتی تۆ و ئەوانیشم.

ماکوان: جا کام کێوە بەرزە بیگرە.

وەرماش: خۆت دەبینیتەوە چ کارێکت بەسەر دەهێنم.

ماکوان: ئەوەی لە دەستت دێت بیکە منەتت بە پێڵاوەکانم.

لەپڕ نەما و ون بوو، ئەوەندەم زانی کازۆڵ پەیدا بوو، ئەوەچی بوو ئەو سەخیفە ڕۆشت.

کازۆڵ: بەڵێ ڕاوم نا بەڵێ ڕاوم نا، ئیهمالی بکە و هیچ قسەی لەگەڵ مەکە.

ماکوان: جاسوسی هەیە لەناوتانا زانیویەتی من لای ئێوە بووم.

کازۆڵ: دەزانم بەڵام خوای گەورە پاداشتی تۆ بداتەوە، کاریگەریت لەسەر جاسوسەکەی دانابوو، هات بۆ لامان و ئیستا دژی خۆی بەکاری دەهێنینەوە، بەڵام نێوانی خۆمان بیت.

ماکوان: سوپاس بۆ خوا وەڵڵاهی خۆشحاڵت کردم، بەڵام من لە ئێوەی جنۆکە تێناگەم ماوەیەك ئێوە لەو ڕاتان دەکرد ئێستا ئێوە ئەو ڕاودەنێن، ئەم (تۆم وجێری)یە چییە تێناگەم.

کازۆڵ: ئاگات لەخۆت بێت جارێکی تر بۆت باس دەکەم خوات لەگەڵ.

ماکوان: خوات لەگەڵ هاوڕێ کازۆڵ.

هەستم دەکرد کە شتێك لە ئارادا هەیە بەلام نەمدەزانی چییە، نە جنۆکەی شەیتان قسەی دەکرد، نە جنۆکەکانی هاوڕێم.

وەکو کورد دەڵێت دڵم خەبەری دابوو کە ناڕەحەتییەکی گەورە و لەڕادەبەدەر بەسەر مندا دێت، چییە نەمدەزانی بۆم لێك نەدەدرایەوە ڕۆژ بەڕۆژ ترسەکە لەدڵمدا زیادی دەکرد، زۆرجار خەیاڵم دەچوو بۆ ئەوەی کە مولحیدەکان لەپیلانی کوشتن و هەوڵدان بن بۆ لەناوبردنم، یان ترسی ئەوەم هەبوو نەرویج لەسەر کێشەی ئیتالیا داوام لەسەر تۆمار بکات و لە وڵاتی نەرویج دادگایی بکرێم یان دەموت بڵێی لە نەرویج دادگایی بکرێم،

یان دەموت لەسەر ئیتالیا لێرە زیندانی دەکرێم، هەموو جارێك پرسم بە چەند پارێزەرێك دەکردەوە دەیانوت ئەوە ئەستەمە نەرویج هاولاتی خۆی ڕادەستی وڵاتێکی تر بکات، هەروەها ئەستەمە کە لەم وڵاتەدا هیچت لەسەر نییە بانگێشتی دادگا بکرێیت لەسەر کێشەی ئیتالیا.

بەهەرحاڵ خۆم بۆ کۆنەدەکرایەوە، نەمدەزانی خۆم چۆن ڕێکبخەم، بەڵام دڵم دەیوت کارەساتێك بەڕێگاوەیە، چییە نازانم؟

ڕۆژان دەهات و دەچوو لەگەڵ کات و زەمەندا دەجوڵام و ڕۆژانە سەرقاڵ بووم بە کار و کەسابەتی خۆم، چالاکی ئایینیم بەردەوام بوو، نووسینم بەردەوام بوو. ڕۆژێك بڕیارمدا بڕۆم لە ولاتی نەرویج و ئەوروپا بەگشتی نەمێنم، دوایی لە دڵی خۆمدا وتم ڕاکردنە، ڕاکردنیش نیشانەی ترسنۆکییە، بەڵام دڵم حەزی دەکرد هەموو ئەوروپا بەجێ بهێڵم.

ڕۆژێك لەگەڵ جەنابی مامۆستا عەلی باپیر قسەم کرد، وتم ڕاکردن جائیزە لەم ئەوروپایە، لەکاتێکدا هیچ شتێکی ترسناکم لەسەر نییە لەم وڵاتە، بەڵام لە خۆمەوە دەترسم.

مامۆستا عەلی باپیر فەرمووی: کاك ماکوان ڕاکردن لە سوننەتی پێغەمبەرانە، خۆ ئەگەر بشترسێن عەیب نییە، حەزرەتی موسا ڕای کرد لە دەستی فیرعەون. بەڵام باوەڕ ناکەم نەرویج ڕادەستت بکات، سەر لەخۆت تێك مەیە.

هەڵبەت زۆر دڵسۆز و باوکانە قسەی بۆم کرد، چوونکە خوێندنەوەی هەموو لایەکمان هەروابوو، نەرویج لە یاساکانیدا چەسپاوە کە هاوڵاتی خۆی ڕادەستی هیچ وڵاتێك ناکات.

لەگەڵ جەنابیان تەواو بووم، کرۆنیکا تەلەفۆنی بۆ کردم وتی: کاك ماکوان کارم پێتە ئەمەوێت بتبینم.

ماکون: لە خزمەتام بەڵام توخوا ئەگەر بۆ باسی زەواج و قەوانەکەی خۆتە بانەیەم، زۆر سەرقاڵم و مێشکم زۆر ئاڵۆزە.

کرۆنیکا: نا، نا قسەڕەق بۆ ئەوە نییە، زەرووره بتبینم.

# کرۆنیکا و هاوڕێکانی

کرۆنیکا تەلەفۆنی بۆ کردم بۆ ئەوەی ببینێت، منیش وامزانی باسی ئەوە دەکەیت هاوسەرگیری بکەین یا نەیەم، من لەخۆم بێزارم خۆم کۆڵ و بار بووم بەسەر خۆمەوە، لەوە دەترسام جارێکی تر باسی ئەوە بکات کە بەیەکەوە هاوسەرگیری بکەین، ئەویش دووپاتی کردەوە کە وازی لەو باسە هێناوە و جارێکی تر لەگەڵ مندا ئەو باسە ناکاتەوە، بەڵام خۆی و هاوڕێیەکی نەرویجی بەناوی (ئیمیلی) دەیانەوێت من ببینن.

ژوانێکمان ڕێکخست و بریارماندا یەك ببینین، من لەکاتی خۆیدا ڕۆشتم و هەردووکیانم لە کتێبخانەی گشتی شار بینی، چووینە کافتێریای کتێبخانەکە و دوای سڵاو و ئەحواڵپرسی کرۆنیکا دەستی کرد بە قسەکردن بە نەرویجی.

کرۆنیکا: ئیمیلی هاوڕێی منە و خوشکێکی هەیە ناوی (هەیدی)یە باوك و دایکیان زۆر هاوکاری منیان کردووە، کێشەیەکی زۆریان بۆ دروست بووە بە هۆکاری خوشکەکەی.

ماکوان: کێشەی چییە؟

کرۆنیکا: جنۆکە چۆتە لاشەی.

ماکوان: چۆن دەزانیت؟

کرۆنیکا: خۆیان وا دەڵێن.

ماکوان: ئێمیلی دەتوانیت خۆت بۆم باس بکەیت؟

کرۆنیکا بە کوردی وەڵامی دایەوە، وتی یەعنی بڕوا بە قسەی من ناکەیت؟

ماکوان: نا، بەڵکو دەمەوێت باشتر تێبگەم، ئەو خوشکێتی و باشتر دەیناسیت، هەر ئەویش بۆتۆی باس کردووە. جا بێزەحمەت و بەئەرك نەبێت دەمت دابخە! و با ئێمیلی بۆم باس بکات، بفەرموو ئێمیلی.

ئێمیلی: هەیدی خوشکم تەمەنی ٢٧ ساڵە لە زانکۆ دەخوێنێت، ماوەی ساڵێك بەر لە ئێستا تووشی حاڵەتی نەفسی بوو، وازی لە زانکۆ هێنا و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە هەر لای دایکم و باوکم دەژیا، ئەوە ماوەی شەش مانگە باری دەروونی زۆر خراپ بووە، چەند جار ویستوویەتی خۆی بکوژێت.

ماکوان: ئەی بردووتانە بۆلای دوکتۆری دەروونی؟

ئێمیلی: بەڵی، زۆر دوکتۆرمان پێ کردووە تەنانەت دووجار بردومانەتە ژاپۆن و جارێکیش بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لێرەش دوو پرۆفیسۆر لێکۆڵینەوە لەسەر باری دەروونی و حاڵەتەکەی دەکەن.

ماکوان: بڕواتان بە خوا و ئایین و شت هەیە، یان بپرسم دینداری دەکەن؟

ئیمیلی: من بڕوام بە هیچ نییە، دەتوانم بڵێم ئەگنۆستیکم، دایکم و باوکم بڕوادارن بەڵام پابەند نین بە دینەوە.

ماکوان: ئەی خوشکەکەت؟

ئیمیلی بڕوای بە خوا هەبوو، بەڵام بڕوای بە ئایین نییە، لەکۆتاییداساڵی ڕابردوو چووە کلێسا و ئێستا چەند پرێستێک هاوکاری دەکەن، بڕوای بە خاچ هەیە.

ماکوان: داوا لەمن چییە، من چیم پێدەکرێت؟

ئێمیلی: لە فەیسبوك لەگەڵ کرۆنیکا قسەمان دەکرد، باسی وەزعی خوشکەکەم بۆ کرد، ئەویش باسی بەڕێزتانی کرد و وتی لەو بوارانەدا توانای هەیە، جا ئەگەر هاوکاریمان بکەیت زۆر سوپاست دەکەین.

ماکوان: بێجگە لە تۆ و کرۆنیکا کێی تر دەزانێت کە تۆ ئەو داوایە لەمن دەکەیت؟

ئێمیلی: ئەگەر ڕاستگۆ بم لەگەڵت من سەربەخۆ هاتووم بەکەسم نەوتووە.

ماکوان: زۆر باشە من هاوکاریت دەکەم، بەڵام بەو مەرجەی (دایکت و باوکت و هەیدی و پرێست و پرۆفیسۆر و دوکتۆرەکان)ی ئاگادار بکەیتەوە.

ئێمیلی: باشە هەوڵ ئەیەم بە هەموویان بڵێم.

ماکوان: کاری من ئەوەیە ئەگەر جنۆکەی تێدابوو هاوکاریتان بکەم، بەڵام ئەگەر کێشەی دەروونی بێت من هیچی لێ نازانم و دەبێت ببرێتەوە بۆ لای پزیشکی تایبەت.

ئێمیلی: ئەی ئێمە چۆن بزانین کە ڕۆحی پیس لە لاشەیەتی؟

ماکوان: زۆر ئاسانە، ئەگەر هیچ کام لەوانەی باست کرد نە پزیشك، نە پرێست نەتوانن چارەسەری بکەن، بەڵکو بەرەو مردن دەڕوات.

ئێمیلی: ئەگەر قسەت لەگەڵ دایك و باوکم و ئەو کەسانەی تر کرد داوای چی دەکەیت و چەندت دەوێت؟

ماکوان: داوای هێچ ناکەم و پارەشـم ناوێت، بەڵکو پارەی خۆم سەرف دەکەم و دێم بۆلاتان.

ئێمیلی: بەڕاستە یان گاڵتە دەکەیت؟

ماکوان: نا، بەڕاستمە و هیچ گاڵتە و گەپ لەم بوارەدا ناکرێت، من دەڕۆم کەی ئەوان ڕازی بوون خۆشحاڵ بوون، من هاوکاریتان دەکەم.

ماڵتان ئاوا...

کرۆنیکا: دەڕۆیت؟

ماکوان: ئەی چ بکەم، با زوو بڕۆم بۆ ئەوەی ئێوە پارەی قاوەکان بدەن!.

کرۆنیکا: دایکم سڵاوی لی دەکردیت، ئەیوت بۆ دیار نییە؟

ماکوان: دەستی ماچ دەکەم و پێی بڵێ لەمەجالێکدا دێمە خزمەتی.

کرۆنیکا: باسی تۆشم کرد بۆ باوکم، ئەویش سڵاوی هەبوو بۆت زۆر دوعای بۆ کردی.

ماکوان: دەستی ئەویش ماچ دەکەم و خوا مەحفوزی بکات، با بڕۆم تا باسی پوور و کەسوکارەکەی تریشت نەکردووە.

کرۆنیکا و ئێمیلی وتیان زۆر سوپاس کاتمان گرتی و کاتێکی خۆش.

ماکوان: کاتێکی خۆش ئێمیلی و السلام علیکم کرۆنیکا.

کرۆنیکا: وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته.

ماڵئاوایم کردو دوای چەند ڕۆژێك لەسەر کار بووم ئێمیلی تەلەفۆنی کرد، داوای کرد کە باوکم دەیەوێت بتبینێت.

ماکوان: ئەوە ناونیشانی ماڵەکەمانە با بفەرموێت.

ئیمیلی: هەیدی خوشکم بهێنێت؟

ماکوان: نا، تەنها باوکت، ئەگەر پرێستەکانێش بین زۆر باشە، خۆ ئەگەر ئەوانەی باست کرد کە پرۆفیسۆرن ئەوانیش بێن ئەوا باشتر و چاکتر.

ئێمیلی: بە باوکم دەلێم، کاتێکی خۆش.

ماکوان: خۆشتر.

ئێوارە لەگەڵ خێزانم لە دەرەوە بووین کە هاتینەوە سەیارەیەکی جاکوار لە بەردەم ماڵی ئێمە پارك کرا بوو، بە خێزانم وت سەیری ئەو جاکوارە بکە چەند جوانە، هیوایەتم ئەم جۆرە جاکوارەیە، زۆری حەز لێ دەکەم.

خێزانم وتی خوا بتداتێ، کاتێك کە دابەزین تەلەفۆنێکم بۆ هات لەو کاتەشدا ئاگام لێبوو پیاوێکی مەعقولی نەرویجی دابەزی. تەلەفۆنەکەم وەلام دایەوە وتی من ناوم (یەنس)ە و باوکی ئێمیلی-م، هاتووم بۆلات لە بەردەرگام، ئەتوانم بێمە لات؟

چووم بۆ لایان و بەگەرمی بەخێر هاتنم کردن و پێشووازیم لێ کردن کە بێنە ماڵەوە، دوو کەسی تری لەگەڵ بوو چوو پێی وتن کەوا ئەوانیش لەسەریارەکە دابەزین، ئەوانیش هاتن خۆیان ناساند یەکێکیان وتی من (تور)ە و پرێستم پرۆفیسۆرەکەش ناوی (ئێدمۆند) بوو.

یەنس: بەڕێز ماکوان ماوەی ساڵ و نیوێکە کچێکم تووشی حاڵەتێکی زۆر سەیر بووە، هەموو لاشەی ڕەق دەبێت و هاوار دەکات، زۆر جار هەوڵ دەدات پیسیی بخوات، زۆر جێگای بەزییە هاتووم بۆ ئەوەی هاوکاریمان بکەیت.

ماکوان: کچە بەڕێزەکەت ئێمیلی هەندێکی بۆ باسکردم، ئەوان بە منیان وت کە جنۆکەی تیایە نازانم وایە؟

یەنس: من نازانم جەنابی پرێستیش هەروا دەڵێت.

ئاگام لە سەری پرێست بوو کە بە ئاماژەی سەری، قسەکانی ئەوی پشت ڕاست کردەوە.

ماکوان: ئەگەر بکرێت پێم خۆشە گوێم لە جەنابی پرێست بێت، بزانم لەو بارەیەوە چی دەلێت.

تور: بەڵێ، بە دڵنیاییەوە ڕۆحی پیس چووەتە لاشەیەوە، چەند جار هەوڵمان داوە بۆ چارەسەرکردنی بەڵام هەروا ئاسان نییە.

ماکوان: ئەگەر بکرێت پێم خۆشە گوێم لە جەنابی پرۆفیسۆر ئیدمۆنیش بێت ئەو چی ئەڵێت و چیان دەست کەوتووە تا ئێستا؟

ئێدمۆند: لەڕاستیدا بۆ من جێگای تێڕامانە، من کەسێکی زانستیم بەڵام کە گوێم لە جەنابی پرێست بوو، باسی ڕۆحی پیسی دەکرد بەڕێزیشتان باسی جنۆکە دەکەن، من دەمەوێت ئەو کارانەی ئێوەش دەیکەن شتێکی دەربارە بزانم لەو جۆرە حاڵەتانە زۆر دێتە لامان، تاکە چارەسەری لای ئێمە دەرمانی خەوە و هیچ کام لەو نەخۆشانە چارەسەر نەبووە یان دەمرن بەوەی کە خۆیان دەکوژن یانیش هەروا دەمێننەوە بەو ئازار و ناڕەحەتییەوە.

ماکوان: زانست چی دەڵێت لەو بارەیەوە؟

ئێدمۆند: بە ڕاستی هیچ.

ماکوان: زانست زۆر داماوە، چەندین ساڵی تری ماوە تا تۆزێك پێی بگات.

ئیدمۆند: دەستی کرد بە پێکەنین، وتی ئێمە کار لەسەر شتی بەرجەستە دەکەین، ئەوە کاری زانستە.

ماکوان: ڕاستە زانست موجەڕەدە و لەسەر ماددە کار دەکات، ئایا ئەو کارەبایەی لەدڵەوە دەڕوات بۆ مێشك و پاشان پێچەوانە دەبێتەوە ئایا هیچ هەڵەیەك هەیە لەو تەزووە کارەباییەی هەیدی.

ئێدمۆند: نەخێر، خۆم پشکنینی وردم بۆ کردووە وەکو هەموو مرۆڤێکی ئاسایی ئاساییە.

ماکوان: کەی دەتوانم نەخۆشەکە ببینم.

یەنس: پێش ئەوەی بێمە ئێرە زۆر ناڕەحەت بوو، بەڕێزت خاوەن بڕیاریت کەی پێت خۆشە، ئێمە ئامادەین.

ماکوان: لێرەوە چەند دوورن؟

یەنس ٣٠ خولەك.

ماکوان: با بڕۆین..

هەموو هەڵساین بەرەو ماڵی هەیدی کەوتینە ڕێ لە جێگایەك بوون نزیک شاری (هاڵدن)، بەڵام ڤێلایەکی خۆش کە پڕ بوو لە درەخت و تەوێلەی ئەسپ، خاوەنی ئەسپ بوون، بێجگە ئەسپەکان چەند سەگ و پشیلە و مانگا و مەڕ و مریشکیش لەوێدا بوون.

کە چووینە ماڵەکە پڕ بوو لە تابلۆ و پەیکەر و جۆرەها توحەفییات، گیتار و پیانۆ و چەند ئالەتێکی مۆسیقای تر، دیاربوو کە ماڵێکی دەوڵەمەند بوون.

دایکی هەیدی و ئێمیلی هاتن بەخێرهاتنیان کردین، کاتژمێر ٤:٢٠ دەقیقە بوو، هەیدی هاتە دەرەوە تەماشایەکی منی کرد زۆر ئاسایی بوو. بە باوکیم وت بیگرە خێرا ئێستا پەلاماری من دەدات.

زۆری پێنەچوو بەرەو ڕووم هات وەکو گورگ دەمی داچەقاند و بەچنگ ویستی پەلامارم بات، کراسێکی کورتی لەبەرابوو لەسەر ڕانی بوو جلەکانی ژێرەوەی هەموو دیار بوو.

داوام کرد شتێکی تێوە بئاڵێنن، لە تەنیشتمەوە پرێست تور دانیشتبوو خاچەکەی ملی بەرز کردەوە و دەستی کرد بە خوێندنی ئینجیل.

داوام کرد کە خاچەکە بشارێتەوە و واز لە خوێندنی ئینجیلەکەی بهێنێت.

دەست بەجێ بەقسەی کردم و داوام کرد ئەگەر ژوورێکیان هەبێت خاڵی بێت لەو وێنە و هەیکەل و شتەی تیانەبێت، بچینە ئەوێ، هەموو ژوورەکانیان پڕ بوو لە وێنە و تابلۆ، ناچار ژوورێکم هەڵبژارد و بردمانە ئەوێ، پرۆفیسۆر ئێدمۆند زۆر بە سەرنجەوە تەماشای دەکرد و جێگایەکی سادەیان بۆ داخست و هێوور بوویەوە و منیش دەستنوێژم گرت داوام لە دایك و باوکی هەیدی کرد کە بیگرن و ئاگاداری بن بەڵکو بتوانم قسە لەگەڵ جنۆکەکان بکەم.

سەرگەرمی دەستنوێژ گرتن بووم، ئەوەندەیم زانی دەرگای حەمامەکەی شکاند و بۆم هاتە ناو حەمامەکە، منیش دەموچاو و باڵەکانم تەڕ بوون، خەریکی شۆردنی قاچەکانم بووم، کە ئاوەکەی بینی کشاوە دواوە، منیش هیچ گوێم پێنەدا و بەردەوام بووم لەدەستنوێژ گرتن و بە دایك و باوکیم وت بیبەنەوە ژوورەکە و لەوی چاوەڕێ بن تا من دێم.

بە دایک و باوکیم وت تکاتان لێ دەکەم جوان بیگرن، چوونکە ڕەحمان پێ ناکات، تەنانەت ئەگەر چەقۆ و شتی تیژ لە چێشتخانەکەتان هەیە بیشاردنەوە تا نەچێت پەلاماری ئەوانە بدات. هەرکە وام وت ئێمیلی ڕایکرد هەمووی شاردەوە.

داوام لە ئێدمۆند و تور کرد قاچی بگرن، هاوکاری دایك و باوکی بکەن کە نەتوانێت هەڵبسێتەوە.

وەکو دوژمن تەماشای دەکردم، دەیویست قەپم لی بگرێت، بەڵام باش گرتبوویان نەیدەتوانی بجوڵێت، هەرچی دەکرد پەلامارم بدات نەیدەتوانی، منیش پەرداخێك ئاوم لەگەڵ خۆم هێنا و دەستم کرد بە خوێندنی سوڕەتی بەقەرە و زوو زوو ئاوەکەم لێ دەپرژاند، هێواش بوویەوە کە زانیان هێور بووەتەوە دەستیان سووك کردبوو، ئەویش بە فرسەتی زانی و وەکو پڵنگ

دەرپەڕی و ڕای کرد لە دەستمان و پەلاماری کەسی نەدا، بەڵکو ڕای کرد بۆ تەویلەی ئەسپەکان و هەمووومان بە دوایدا ڕامان کرد. ئەوەندە خێرا بوو فریای نەکەوتین تەنانەت نەمان زانی چۆتە کوێ خۆی شاردۆتەوە.

کە تەماشامان کرد وا خەریکە پیسایی ئەسپەکان دەخوات، بەدوای جاڵجاڵۆکەوەیە کە بیخوات و لەگەلیشیدا دەگری، زۆر بەزەیم پیا دەهاتەوە، دایك و باوکی و خوشکەکەی دەگریان،گرتمان و هێنامانەوە بردیانە حەمامەکە و شۆردیان و هاتە دەرەوە، هەرچەند دەمودانیان بۆ شۆردبوو، پرۆفیسۆر ئێدمۆندیش پەرداخیک ئاوو خوێی دایە تا هەرچی خواردبوو هەلی هێنایەوە.

بۆ جارێکی تر دەستم کردەوە بە خوێندنەوەی سوڕەتی بەقەرە، ئەیقیژاند ئاوم کرد بە دەموچاویدا وتم قسەم بۆ بکە، تۆ کێیت و بۆ واز لەم کچە ناهێنیت.

بە دەنگێکی سامناك و وەکو پیرێژنێکی بەسالاچوو وتی ئەی تۆ بۆ واز لە ئێمە ناهێنیت، وتم داوات لێ دەکەم بەو پەیمانەی کە لە نێوانی جنۆکە و حەزرەتی سولەیماندا هەیە وەرە دەرەوە لە لاشەی ئەو کچە دەنا زۆر خراپت بەسەر دەهێنم.

هەروام وت ئازار لە پشتم هەستا، دوان لە سەگەکانیان پەلاماریان دام لە تاو ئازاری خۆم وازم لە قسەکان هێنا و کەوتمە شەڕ لەگەڵ ئەو دوو سەگەدا، هەرچۆن بوو دووریان خستنەوە و هەموویان شڵەژابوون.

پرۆفیسۆر ئیدمۆند: لەوانەیە وا هەستی کردبێت سەگەکان کە ئەم کەسە نامۆیە بەم ماڵە، بۆیە پەلاماری بەڕێز ماکوانیان داوە، دەیویست تەفسیری زانستی بۆ بکات.

بە پێکەنینەوە کاتێك کە ئێدمۆند خەریکی برینەکەی پشتم بوو پاکی دەکردەوە پێم وت دڵنیام کە ئەو حاڵەتە ئاسایی نییە.

داوام کرد کە سەگ و پشیلەکان دوور بخەنەوە و دەرگای ژوورەکە دابخەن تا شتێکم بۆ دەردەکەوێت.

پرێست تور: بەڕێز ماکوان خاچەکەت بدەمێ؟

ماکوان: نا، پێویستم نییە، خۆ ئەگەر هەر بیشاریتەوە زیاتر خزمەت بە من دەکات.

ئاگام لێبوو زۆری پێ ناخۆش بوو، بەڵام ئەوە حەقیقەتە.

بۆ جاری سێیەم دەستم کردەوە بە خوێندنی سورەتی بەقەرە، جنۆکەکەم هێنایە قسە، هەڵبەت بە نەرویجی قسەمان دەکرد. بە جنۆکەکەم وت تکات لێ دەکەم وەرە واز لەو کچە بهێنە، وەرە من کۆنترۆڵ بکە.

جنۆکەکە: من ناتوانم تۆ کۆنترۆڵ بکەم، تۆ پارێزراویت.

ماکوان: چەندی ترت لەگەڵە با ئەوانێش قسە بکەن؟

پێنج دەنگی جیاواز قسەیان لەگەڵ دەکردم، بەچەند زمانێک داوام لێ کرد با بەعەرەبی یان کوردی یاخود نەرویجی قسە بکەن، یەکێك لە دەنگەکان بە عەرەبی قسەی کرد، وتی چیت دەوێت لێمان، هەیدی خۆی ڕازی بووە بەوەی کە ئێمە کۆنترۆلی بکەین.

ماکوان: درۆ دەکەیت، وازی لێ بهێنن دەنا بە کەلامی الله (سبحانه تعالى) ئەتانسووتێنم، یاخود بە جنۆکەکانی هاوڕێم دەڵێم بێن و ئەسیرتان بکەن،

ئەوان زۆر بەتوانان تا سێ دەژمێرم بە ناوی خوا دەست پێ دەکەم.. ١، ٢، ٣ کە گەیشتمە سێ جەنابی پرێست دەستی لە قاچی هەیدی هەڵگرت و پەلاماری دام، خەریک بوو بم خنکێنێت.

بەپەلە لە خۆم کردەوە هەرچی لە دەورمان بوون تووشی شۆك بووبوون، تا لەو نەجاتم بوو هەیدی هەڵسایەوە و پەلاماری یام بە چنگی شان و قوڕگی بریندار کردم، هەربەڕاستی خەریك بوو بمکوژێت، خوای پەروەردگار ڕەحمی پێ کردم، دانەیەکم کێشا بە سەری و لووتیا، ئینجا دەستی شل بوو خەریك بوو هێزم لێ ببڕێت.

ناچار بووم داوای لێ بوردنم کرد وتم ئیشم بۆ ناکرێت، پێویستم بە هاوکاری هەیە بۆ ئەوەی پارێزراو بم، مەگەر بیخەنە کاتێکی تر بەلام مەهێڵن پرێست هیچی بۆ بخوێنێت، پرێست خۆی گیرۆدەیە پێویستی بە چارەسەرە.

پرێست تور: ببوورە نازانم بۆ وام کرد، لە کۆنترۆلی خۆم دەرچووم.

ماکوان: ئاساییە، پێویستە تۆش چارەسەر بکەم، تۆ و هەیدی جیاوازییەکی ئەوتۆتان نییە، تۆش نەخۆشی وەکو خۆت دەڵێیت ڕۆحی پیس لە لاشەتدایە.

یەنس: ئەی وازمان لێ دەهێنێت و ناگەڕێیتەوە جارێکی تر بۆ لامان تا کارەکەت تەواو بکەیت؟

ماکوان: هێشتا هیچم نەکردووە، چوونکە دەترسم کەسێکمان لەناو بچین، ئێوە توانای کۆنترۆڵ کردنی کچەکەی خۆتان و سەگەکانتان نییە، دوای سەگەکان پریست پەلاماری دام، بۆیە پێویستە کەسی خۆم لەگەڵ بێت.

یەنس: ئێستا دەگەڕێیتەوە بۆ فرێسدریکساتد؟

ماکوان: بەڵێ، تەلەفۆن دەکەم بین بە شووێنمدا یان بە پاس و قیتار دەگەڕێمەوە.

ئیدمۆند: من ئەتگەڕێنمەوە، پەلە مەکە بەیەکەوە دەڕۆین.

ماکوان: پێویست ناکات، خۆم دەڕۆم.

یەنس: من دەتگەیەنم، منیش دێم لەگەڵتان.

ماکوان: نا، تۆ ئاگات لە منداڵەکانت بێت و پرێست دوور بخەرەوە بابڕوات، چوونکە ئەویش ترسناکە.

با ئێدمۆند بمگەیەنێتە وێستگەی پاس خۆم دەڕۆم.

بە پێنج خولەك گەیاندمییە تەرمیناڵی پاسەکان و گەڕامەوە بۆ شاری فرێدریکستاد کە خۆم لێی نیشتەجێم.

گەڕامەوە ماڵەوە، خێزانم وتی ئەوە چییە شەڕت کردووە.

ماکوان: کورە نەوەڵڵا، شەڕی چی. هەموو باسەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی بەخوا ئەم جنۆکانە قوڕ ئەکەن بەسەرمانا، لە جنۆکە کوردەکان نەجاتمان نەبوو نەرویجی هاتە سەر.

هەرحاڵ دووشێکم گرت و نویژی مەغریب و عیشام کۆکردەوە، زۆر ماندو وبووم خەوم لێکەوت، بەیانی لەدوای گەڕانەوەم لەکار چووم بۆماڵی مام فەرهاد، لە حەوشەکەیان لەسەر پلیکانەکانیان دانێشتم مام فەرهاد و گلارە خانم ومیلا هاتن بۆلام وتیان با بچینە ژوورەوە.

وتم ئێرە خۆشە، فاتمە خانی دایکی کرۆنیکام بانگ کرد، کرێچی ماڵی مام فەرهاد بوون، کرۆنیکاش هات و هەموو لەدەوری من کۆبوونەوە، منیش باسەکەم بۆ مام فەرهاد و کرۆنیکا گێڕایەوە کە چیم بەسەر هاتووە.

کرۆنیکا: وەی دەستیان بشکێت بۆ وایان لێ کردوویت.

ماکوان: ئەی تۆ نەتوت هاوکارییان بکە، ڕەفیقی تۆ بوون.

کرۆنیکا: جامن چوزانم ئاوا شێت و وێرانن.

ماکوان: زۆر داما و و گوناحن، بەڵکو مام فەرهاد و میلاد لەگەڵم بێن، نامەوێت کاوە و بەختیار ببەم ئەترسم کاتێك کە پەلامارم ئەیەن ئەوانێش دەست بووەشێنن.

مام فەرهاد: وەڵلا چی بەمن بکرێت لە خزمەتام، میلاد لەماڵ نییە ئێستا تەلەفۆنی بۆ دەکەم بگەڕێتەوە.

ماکوان: نا، وازی لێبهێنە خۆ ئێستا ناچین ئەگەر خۆیان پەیوەندییان کردەوە و هاتن ئەوا تۆ و میلادیش لەگەڵم وەرن.

کرۆنیکا: توخوا با منیش بێم بزانم چی دەکەن.

ماکوان: من پیاوم پێویستە، کرۆنیکا تۆ بۆ کوێ دێیت.

کرۆنیکا: بڕوا بکە لەوەتەی تۆم ناسیووە، منیش بووم بە پیاو!.

مام فەرهاد پێ دەکەنی، هەندیك قسەی خۆشم لەگەڵ فاتمە خانی دایکی کرۆنیکا کرد و ماڵئاوایم لێکردن.

لەڕێگا حەزقیل خۆی کرد بەناو سەیارەکەمدا، نیوە ڕۆح بووم وتم ئەرێ ئحمێك، سەلامێك، کەلامێك ڤڕەیەك ترسام.

حەزقیل: سەلام عەلەیکم، کاتم نەبوو بۆ ئەوەهاتم پێت بڵێم سوڵتان سڵاوی هەبوو بۆت و ئەیوت ئەگەر بتوانێت لەکاتی دەرکردنی ئەو شەیتانانەدا ئاگرێکی بچووك لە نزیکی خۆی بکاتەوە، هەمیشە با ئاوی لابێت پێیدا بپرژێنێت، جامێك ئاو لەگەڵ قوڕاو تێکەڵ بکات بۆ ئەوەی نەمرێت با یەکێك لە کەسوکارەکەی ئەو قوڕاوەی تێهەڵسوێت، بەڵام نابێت ماکوان دەستی بەری بکەویت.

ماکوان: علینا وعلیکم السلام، ئەی هەروەکو جاران ئەو سوڕەتانە بخوێنم کە پێشتر خوێندومە؟

حەزقیل: بەڵێ هەر ئەوانە و هیچ زیاد و کەمی مەکە، من زۆر پەلەمە دەبێت بڕۆم، بەڵام ئەو جێگایەی بۆی ڕۆشتی زۆر ترسناك و خەتەر بوو خوای گەورە ڕەحمی پێ کردیت دەنا شەیتانەکان وێرانیان دەکردی.

ماکوان: ئەی چی بکەم بچم یان نەچم، مەمترسێنە حەزە.

حەزقیل: برۆ کۆنترۆڵمان کردووە.

ماکوان: هەربژی حەزە کۆنترۆڵی برام، جزاك الله خیرا.

حەزقیل ماڵئاوای کرد و منیش زۆر لە جاران دڵم خۆشتر بوو، وزەی زیاترم وەرگرت، خۆم ئامادە کرد ئەگەر هاتنەوە بە دەمیانەوە بچم.

کاتژمیر دەی سەرلەبەیانی ڕۆژی شەممە یەنس تەلەفۆنی بۆ کردم و دوای سڵاو و چۆنی و چاکی وتی:

بەڕێز ماکوان تکایە ئەگەر دەکرێت هاوکاریمان بکە، هەیدی زۆر ناڕەحەتە.

ماکوان: باشە، بە خۆشحاڵییەوە دێمە خزمەتان.

یەنس: زۆر ببوورە شەرمەندە بوو ئە وجارەش خۆت گەڕایتەوە.

ماکوان: نا، وامەڵێ من ئاگاداری حالی تۆم گلەیی لەتۆ ناکرێت بەڕێز یەنس.

ماڵئاوایم لێکرد و تەلەفۆنم بۆ مام فەرهاد کرد کە بێن لەگەڵم، ئەوانیش ئامادەییان دەربڕی، چووم بە شوێنیاندا تەماشا دەکەم کرۆنیکا خۆی ئامادەکردووە بێت لەگەڵماندا، مام فەرهاد وتی سوێندی داوم کاتێك ڕۆشتین بەویش بڵێم بێت لەگەڵمان.

مام فەرهاد و میلاد چوونە دواوە دانیشتن ئەویش هاتە پێشەوە، لەبەرچاوی ئەوان بەمن دەڵێت ئەوە منم لە پێشی سەیارەی تۆ دانیشتووم؟

ماکوان: بەڵێ، خۆ ئەمیر ئەرسەلانی ڕۆمی دانەنیشتوویت!.

کرۆنیکا: جا ئەمیر ئەرسەلان کێیە لەچاو ئەمیر ماکوانم.

مام فەرهاد و میلاد پی دەکەنین.

ماکوان: بەخوا حەجەکەت بەس (حا)کەی ماوە، پێویستە تازەی بکەیتەوە.

لەڕێگا بە مام فەرهاد و میلادم وت پێویستە زۆر ئاگاتان لێم بێت با تەرکیزم لەسەر قورئان خوێندنەکەم بێت، ئێوەش لەوکاتەدا کە من قورئان دەخوێنم

یان قسە لەگەڵ جنۆکەکان دەکەم بڵێن؛ (اللهم اعوذ بك من همزات الشیطان)، باشە؟

کرۆنیکا: ئەی من چی بڵێم، هەروەکو ئەوان منیش بیڵێم؟

ماکوان: بەڵێ، هەروەکو ئەوان قابیلە خۆ تۆ دوعای تایبەتت بۆ دانانێم!، تۆش وەکو ئەوان.

کاتێک کە گەیشتین یەنس خۆی هات بە دەممانەوە وپێشووازی لێ کردین، ویستی تەوقە لەگەڵ کرۆنیکا بکات، ئەویش دەستی گرت بە سنگییەوە و تەوقەی لەگەڵ نەکرد، بەلامەوە وێستگەیەکی جوان و ئیمانی بوو.

ماڵەکەیان پڕ بوو لەخەڵك زیاد لە ١٠-١٥ کەسی لێبوو، ئێمەش زۆر بووین، ئاگام لێ بوو دەیانوویست بە تەلەفۆنەکانیان ڤیدیۆ بگرن، بۆیە قبوڵم نەکرد ئەوانیس ڕازی بوون و وازیان هێنا.

بە میلادم وت لە پشتم بووەستە ئەوەی پەلاماری یام بیبورێنەوە، تۆش دەست مەپارێزە.

میلاد: خەمت نەبێت ئەوەی نزیکت بێتەوە ئەییەم لە قیمە.

مام فەرهاد تۆ ئاگات لەو پرێستە(قەشە) بێت، ئەویش جنۆکەی هەیە، چاوت لەسەری بێت ئەوەی پەلاماری یام دووری بخەرەوە و فڕێی بدەرە ئەولاوە و ئاوی پیا بکە.

ئەوانەی لەوێ بوون دوکتۆری نەفسی، پرفیسۆر ئێدمۆند، پرێست تور، چوار کوڕی گەنج کە دیار بوو بەهێز بوون، خێزانی هەیدی و دوو کەسی ترم بینی کە ئەوان نزیك ئیستەبڵی (گەوڕی) ئەسپەکان وەستابوون.

داوای دوو سەتڵ ئاوم کرد جامێك قوڕاوم گرتەوە و داوام کرد مقەڵیەکی گۆشت برژاندن ئاگرێك بکەنەوە، لە باخەکەیاندا کارەکە ئەنجام ئەدەین.

پێشم وتن هەرکەس پەلامارم بدات دەستی لێ ناپارێزم و میلاد و مام فەرهادیش دەست ناپارێزن ڕووم لەپرێست و گەنجەکان بوو کە ئەو قسانەم کرد.

چونکە دەترسام کە کەسێکی تریش لەوان جنۆکەی هەبێت، بۆیە وریایی خۆم وەرگرت و قسەکەم ئاڕاستەی فەرهاد و میلاد کرد. کرۆنیکا و ئێمیلی بەیەکەوە وەستابوون.

بەناوی خوا دەستم پێکرد.

## لەنێوانی ماکوان و پرێست و پرۆفیسۆر

دەستم کرد بە قورئان خوێندن، قورئانەکەم لەگەڵ خۆم بردبوو، داوام لێکردن کەلە باخەکەیان کارەکە ئەنجام بدرێت، ئاگرەکەم کردەوە وقوڕا و و ئاوەکەشم ئامادە کرد، سەرقاڵی قورئان خوێندن بووم پرۆفیسۆر ئێدمۆند هاتە لام وتی بەڕێز ماکوان تکا دەکەم ئیزنی من و هاوکارەکانم بدە با ئێمە وێنە بگرین. زۆر پێویستمان پێی دەبێت بۆ لێکۆڵینەوەکانمان.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە بۆ کاری لێکۆڵینەوە ئاساییە، من بۆ ئەوە داوام کرد کە وێنە نەگیرێت تا بە تۆرە کۆمەڵایەتیەکاندا بڵاو نەبێتەوە، دەنا چی خزمەت بە زانست بکات لە تەرەفی منەوە هەموو هاوکاریەکتان دەکەم.

سوپاسی کردم و دەستی کرد بە وێنە گرتن، هەیدی زۆر ئارام بوو، داوام کرد کە دەست و قاچی ببەستنەوە بۆ ئەوەی ئازار بەخۆی نەگەیەنێت و منێش تەرکیزم بۆ بکرێت.

هەیدی: هەرچی تۆ پێت باشە من دەیکەم، فەرموو ببەستنەوە.

ماکوان: ئەتوانیت جلوبەرگێك بکەیتە بەرت کە داپۆشراوبێت وەکو کرۆنیکا؟

هەیدی: بەڵێ، حیجاب بکەم؟

ماکوان: ئەگەر واش بکەیت، ئەوا پێرفێکتە و زۆر سوپاست دەکەم کە هاوکاری من دەکەیت.

هەیدی چوو بۆ ئەوەی خۆی بگۆڕێت، یەكێك لە كوڕەگەنجەكان هاتە لام و وتی بۆ نایبەستیتەوە بەو دارەوە ئەوە باشترە، ئێمەش ماندوو نابین و ناشترسین.

بیرۆكەكەیم بەدڵ بوو، بەڵام لە خۆوە گومانم بۆ دروست بوو، وتم دەبێت پرس بە هەیدی بكەین بزانین ڕازییە، بەڵام پێـبڵێ ئەم بیرۆكەیەت چۆن بۆ هات.

گەنجەكە ناوی ئەیریك بوو وتی لە فیلمێكی دیكۆمێنتاری بینیوومە قەشەیەك وا كارەكەی ئەنجام داوە.

كەوای وت گومانم نەما و هەیدی گەڕایەوە بەجلوبەرگی داپۆشراو و سەری داپۆشی بوو، لێم پرسی بۆ زیاتر دڵنیابوون لە سەلامەتیت ڕازیت بتبەستینەوە بەو دارەوە، تكایە هاوكاریمان بكە.

داوام لە دایك و خوشكەكەی و كرۆنیكا كرد كە بیبەستنەوە، ئەوانێش بەستیانەوە.

دایكی دڵی نەدەهات بە قایمی پەتەكە ببەستێتەوە، بۆیە داوام لە میلاد و باوكی هەیدی كرد كە قاچ و سنگی باش قایم بكەن، با دایكی دەستی لەناو دەستی بێت و كورسییەكی بۆ بهێنن با لەتەنیشتی دابنیشیت تا هەیدیش هەست بە ئارامی بكات، داوام لە باوكیشی كرد كە لە نزیكییەوە بووەستێت، باوكی پێی خۆش بوو لە نزیكیەوە وەستا، قوڕاو و ئاوەكەم لە خۆم نزیك كردووە و دەستم كرد بە قورئان خوێندن.

بە ناوی خواو بە سڵاوات دان لە سەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پاشان دوعای خێرم كرد و داوام كرد لە خوای پەروردگار كە

سەرکەوتووم بکات لەم کارە و ببێتە مایەی هیدایەت بۆ ئەو خەڵکەی کەلە گەڵماندایە و خۆبەزل زانی و تەکەبوریش لەمن دووربخاتەوە، ئیخلاس و دڵسافی و ئیمانی زیاتر لەدڵمدا بەهێز بکات و پاشان نائومێد نەبین لەکارەکە و خوای گەورە هاوکار و پشت و پەنامان بێت.

سەرەتا بە خوێندنی سورەتی فاتیحە و پاشان سێ جار سورەتی ئیخلاسم خوێند، ئاگام لێ بوو هەناسە برکێی پێکەوت و ڕەگی ملی بەرز بویەوە و چاوی سوور بوو وەک ئەوەی خوێنی تیا بێت. هاواری دەکرد بە زمانی عەرەبی و نەرویجی و ئینگلیزی کە من بووەستێنن دەنا کچەکەیان دەکوژن، ئاگام لێبوو دایکی دەستی کرد بە گریان، قورئانەکەم وەستاند و وتم دایکی دوور بخەنەوە لێی، بە کرۆنیکا و ئێمیلیم وت ئەگەر ئێوە تەحەمول دەکەن با ئێوە دەستی بگرن، ئێمیلی خێرا چووە تەنیشتی و دەستی گرت، کرۆنیکاش دایکی دوورخستەوە.

دەستم پێکردەوە ئەوەندە بەهێز تەکانی دەخوارد ئەو دارەی دەجوڵاند، دارەکەش زۆر بەهێز بوو، ئەترسام گوریسەکە ئازاری بدات، دەیویست بەدان گوریسەکە بپچڕێنێت.

حەزقیل لە تەنیشتم پەیدا بوو وتی ئەی قوڕاوت بۆچییە، بە تووڕەییەوە ئاوی پێدا بکە و قوڕاوەکەی لێ بەن با ئارام بێتەوە.

بیرم کەوتەوە خۆ ڕاست دەکات، خەیاڵم ڕۆشتبوو تەرکیزم لەسەر قورئان خوێندنەکە بوو، ئاوم پیا کرد و بە باوکیم وت کە لە قوڕاوەکەی لێ بدات وەکو مەڵحەم بیدات لە گەردن و دەموچاوی.

دیسان دەستم پێ کردەوە کاتێك کە یەنس قورەکەی لێدا زۆر ئارام دەبووەوە ڕەنگی پێستی وەکو جارانی لێ دەهاتەوە، دیسان کەوتەوە قسە

کردن و بە زمانی جیاواز منیش بە نەرویجی وتم ناوی خۆتان بڵێن، دەنا بەو پەیمان و کۆنتراکتەی لەنێوان حەزرەتی سولەیمان و جنۆکەدا هەبووە ڕاستگۆ بن لەگەڵما و واز لەم کچە بهێنن ئەوا منیش ئازارتان نادەم، بەڵام سوێند بەخوای پەروەردگاری تاك و تەنها کە کەلامی خۆی ناردووە و قورئانە ئەگەر واز نەهێنن لەم کچە هەمووتان دەسووتێنم.

لەوکاتەدا ئاگرەکەم نزیك کردەوە لە هەیدی لەتاواندا دەیقیژاند، یەکێك لە جنۆکەکان هاواری کرد من وازی لێ دێنم بەلام جادووەکە بەتاڵ بکەرەوە.

ماکوان: ناوت چییە؟

جنۆکەکە: لییس

ماکوان: سیحرەکەت چییە ولەکوێدایە؟

لییس: لە تەویلەی ئەسپەکاندایە.

ماکوان: شووێنەکەیم پێ بڵێ با بڕۆین بیهێنین.

هەرکە وام وت قەشەکە ویستی پەلامارم بات، بەڵام مام فەرهاد گرتی و خستیە سەرزەوی، وتم بە میلاد هاوکاری باوکت بکە.

مام فەرهاد: نامەوێت، با ئاگای لەتۆ بێت، کۆنترۆڵم کردووە.

ئاگام لێبوو کە مام فەرهاد قەشە توری تاساندبوو.

ماکوان: بەیەکێك لە کوڕەکانم وت بڕۆن لەو ناونیشانە ئەو سیحرە بهێنێت، کەسیان نەیانوێرا بڕۆن بیهێنن، بەباوکی هەیدیم وت بڕۆ لەو جێگایە ئەو سیحرە بهێنە.

یەنس: زۆرباشە.

ئەو ڕۆشت و گوێم لە قەشەکە بوو هاواری دەکرد پەراسووەکانم شکا.

ماکوان: مام فەرهاد دەست بپارێزە، بابەسەرماندا ساغ نەبێتەوە، هەوڵ بدە جارێ دووری بخەرەوە.

لەگەڵ میلاد هەڵیان گرت و خستیانە ناو تەویلەی حەیوانەکان، وتم ئینجیلەکەی لێ بسێنن.

مام فەرهاد: ئینجیلەکە نادات، نامەوێت ڕایبکێشم لەدەستی دەترسم بدڕێت.

ماکوان: وازی لێ بهێنە.

لەگەڵ جنۆکەکان کەوتمە قسە کردن، دووبارە وتم کێ ئەو سیحرەی کردووە لەم کچە؟

لییس: قەشە تورە کردوویەتی، لەڕێگای کەللە سەری کەمتیارەوە.

ماکوان: بۆ وای کردووە، ئەو قەشەیە چی دەوێت لەم کچە ؟

لییس: ٣٥ ساڵە حەزی لە دایکیەتی، لە ڕاستیدا جادووەکەی لە دایکی هەیدی کردووە، بەڵام دایکی هەیدی جادووەکە کاریگەری لێ نەکردووە و سیحرەکە بە هەیدییەوە نوساوە.

دایکی هەیدیم بانگ کرد ناوی (هیلدە) بوو، باوکی سیحرەکەی هێنا کەللەسەرێکی کەمتیار بوو، ئیسقانەکەی و ددانەکانی، هەمووی ڕەش بوو، شتێکی لە شێوەی خاچێك دا وەکو چەقۆ وابوو لە ئێسقانەکە چەقێنرابوو، خوێنی پێوە بوو، نەمدەزانی چۆن بەتاڵی بکەمەوە. یەکەم جار بوو سیحری وا ببینم. پرسیم ئیوە چەند جنۆکەن کە لەگەڵ ئەم کچەن و کۆنترۆڵتان کردووە، تکایە وازی لێ بهێنن دیارییەکتان پێشکەش دەکەم کە لە دنیاو لە قیامەتیش خۆشحاڵتان بکات.

لییس: ئەو دیارییە چییە؟

ماکوان: بانگتان دەکەم بۆ هێز و قودرەتێك کە شتی واتان نەبینیوە و نەبیستووە ئەویش ئایینی ئیسلامە، موسوڵمان بن. نروا بەو قورئانە بهێنن و واز لەبەرەی شەیتان بهێنن بەرەو خوای حەق و خاوەن دەسەڵات و تاك و تەنها بڕۆن.

لییس: ناتوانین، چونکە ئەگەر موسولمان بین ئەمان کوژن.

ماکوان: بڕۆن بۆ مەملەکەتی سوڵتان و ئەوان ئەتان پارێزن و لەوانەیە لێرە هەندێك لەو هاوڕێیانەمی لێبێت ئێستا و گوێیان لێمان بێت، ئەوانە هەموویان جنۆکەی ئیماندار و ڕاستگۆن و هاوکاریتان دەکەن، تکایە وازی لێ بهێنن ئەو کچە گوناحە.

لییس: من وازی لێ دەهێنم و هاوڕیکانت بانگم دەکەن، بەڵام حەقی ئەوانی ترم نییە.

ماکوان: چەندی تر ماوە ئەگەر تۆ بڕۆیت؟

لییس: شەس جنۆکەی تری لەگەڵ دەمێنێتەوە.

ماکوان: هەمووتان ئافرەتن؟

لییس: بەڵێ، مێینەین.

ماکوان: ئەوەتان کە بەعەرەبی قسەتان دەکرد، با قسەم لەگەڵ بکات.

لییس: من وازی لێ دەهێنم، بەقسەت دەکەم دەڕۆن، ئەوە (ناهۆم)ە کە عەرەبی دەزانێت.

ناهوم: ماکوان چیت دەوێت لێمان.

ماکوان: دەمەوێت واز لەو کچە بهێنن، تۆ عەرەبی دەزانیت هێزی قورئان لەناوتان دەبات، وەرە موسوڵمان بە ئاگات لە قیامەتت بێت.

ناهوم: ناتوانین، دەمانکوژن.

ماکوان: لەگەڵ لییس بڕۆن بۆلاي هاوڕێکانی من لە مەملەکەتی سوڵتان پارێزراو دەبن بە پشتیوانی خوا.

بەزمانی عەرەبی قسەم لەگەڵ دەکرد هەموو ئەوانەی لەوێدا بوون سەریان سوڕما بوو پرۆفیسۆر ئێدمۆند بە کامێرا وێنەی دەگرت.

ناهوم: باشە منیش دەڕۆم.

ماکوان: نا ئەوانی تریش هەموویان بەرە لەگەڵ خۆت، دەنا تورە دەبم و ئەیانسووتێنم، ماندووبووم کاتم نەماوە بۆ قسەکردن، پێش ئەوەی بڕۆیت پێم بڵێ چۆن ئەو سیحرە بەتاڵ بکەمەوە.

ناهوم: چەند خولەکێکم بدەرێ، ئەوە کازۆڵ دەڵێ وەک هەموو سیحرەکانی تر بەتاڵ دەبێتەوە.

ماکوان: کازۆڵ دەبینیت؟

ناهوم: بەڵی ئەو قسەمان لەگەڵ دەکات.

ماکوان: بەقسەی بکەن.

کەوای وت زۆر دڵخۆش بووم و وازم لە هەیدی هێنا و چوومە سەر ئێسقانەکە و دەستم کرد بە خوێندنی قورئان و بەتاڵ کردنەوەی سیحر و بەچەکوش و بەرد ئێسقانەکەم ورد و خاس کرد و خستمە ناو سەتڵە ئاوەکە بۆ ئەوەی دوایی فڕێی بدەمە ناو دەریاوە.

پرسیارم کرد لە ناهوم کە ئایا قەشە جنۆکەی هەیە؟

ناهوم: ئەوە درۆ دەکات، قەشە نییە، بەڵکو ساحیرە و خەریکی سیحرە.

ماکوان: لەکوێ سیحر دەکات.

ناهوم: لە ژوورەکەی خۆی لە کلیساکە، هەموو خاچەکانی سەرەو خوار داناوە، بڕۆن تەماشای بکەن.

ماکوان: تکایە زوو ئەو کچە بەجێ بهێڵن با پشووو بدات، لەخوا بترسن زۆر ماندووتان کردووە.

ناهوم: هەموو پەیمانمان داوە کە وازی لێبهێنین، داوا دەکەین کە تۆ شاهید بیت کە کازۆڵ بمانپارێزێت.

ماکوان: من بڕوام بە کازۆڵ هەیە و ڕاستگۆیە و زۆر ئەمینە سیقە (متمانە) ی پێ بکەن.

بەردەوام قسەم دەکرد، تا ناوی جنۆکەکانی ترم پێ بڵێت، بەڵام هەیدی وەڵامی دایەوە، وتی لێت تێناگەم چی دەڵێیت.

ماکوان: هەیدی ئێستا هەست بە چی دەکەیت؟

هەیدی: زۆر ئارامم و برسیمە و تینوومە، هەست دەکەم مێشکم پشووی دەوێت، حەزم لێیە بخەوم.

داوام کرد کە بیکەنەوە بڕوات نان بخوات و پشووو بدات، قەشەکە بانگ بکەن تا بزانین بۆ وا دەکات.

یەنس هات بۆلام وتی بەڕێز ماکوان با ئەم (کیسە گووە، جنێوێکی نەرویجییە) با بیکوژم نەجاتمان بێت بەدەستیەوە، نازانی چی پێ کردووین.

ماکوان: پەلە مەکە با بزانین ماڵی چەند کەسی تری وێران کردووە، بیر لە کوشتن مەکەوە، بیر لەوەبکەوە خۆشی ڕزگار بکەین لەو داوەی کە تێی کەوتووە، هەرچۆنێك بوو یەنس-م هێور کردەوە من و مام فەرهاد و میلاد چووین بۆ تەویلەی ئەسپەکان قەشەکەمان هێنا، میلاد وتی ئاقڵ بە هیچ نەکەیت دەنا ئەوکەم بە خۆراکی سەگەکان.

تورە: نا دڵنیابە هیچ ناکەم، لەدەسەڵاتی خۆمدا نەبوو ئەوکارەی کردم، نازانم بۆ وام کرد.

ماکوان: تورەی بەڕێز دەکرێت ئەو خاچە لەملت بکەیتەوە، ئەو ئینجیلە بدەیتە من تا بەیەکەوە تەنها چەند خولەکێك قسە بکەین.

توره: دەستی کرد بە گریان و وتی ئاخر ئەو دوانە دەمپارێزن، با هەمیشە پێم بێت.

ماکوان: من بەڵێنت دەدەمێ کە خوای ئەو کتێبە دەتپارێزێت، من زیاتر لە تۆ بڕوام بە ئینجیل هەیە، زۆر ڕێزی ئینجیلم لایە، بەڵام تۆ ڕۆحی پیس لەلاشەتدایە پێویستە دەربچێت.

بەزمانی خۆی قسەم لەگەڵ دەکرد بۆ ئەوەی لێم تێبگات.

توره: نا پێوستم نییە کە تۆ ڕۆحی پیس دەربکەیت، من عیسای خوا لەلاشەمدایە.

ماکوان: نا، تۆ ڕاستگۆ نیت، تۆ کەسیکی جادووبازیت، تۆ هۆکاری ئەوە بوویت کە ئەو جنۆکانە کۆنترۆڵی هەیدی بکەن و ئازاری بەن، تۆ سیحرت لێ کردووە، بۆ زانیاریشت جنۆکەکان کە لەگەڵی بوون هەموو شتێکیان درکاند و وازیان لێهێنا، تەنانەت ئەوەشیان وت کە تۆ چەندین ساڵە حەزت لە هیلدەی دایکی هەیدی یە واتا خێزانی یەنس-ی هاوڕێت و جادووەکەشت لەو کردووە.

توره: نا، ڕاست ناکەن، من هەرگیز کاری وام نەکردووە، یەنس هاوڕێمە و هاوڕێی ئەم خێزانەم و هیچ پەیوەندییەکی خۆشەویستی دوور و نزیك لەنێوانماندا نەبووە. منیش یەك لانەیە هەرگیز بیرم لە خێزانی یەنس نەکردۆتەوە، کە پەیوەندی سۆزداری لەنێوانماندا هەبێت، بەڵکو وەك کەسێکی ئاسایی بووە لەلام.

ماکوان: ئەشێ تۆ ڕاست بکەیت، چوونکە جنۆکەی کافر تا موسوڵمان نەبن درۆ زۆر دەکەن، ئەگەر بێت و ئێستا یەنس ڕازی بێت بێینە ناو کلێساکە و ژوورەکەی تۆ لەوێ ئەوا لە ٪۱۰۰ بڕوات پێ دەکەم، ئایا ڕازیت؟

قەشە تورە: ڕازیم بێنە ناو کلیساکە، بەڵام ژووری من پرایڤتە و تایبەتە بەخۆم و کەرەستەی خۆمی لێیە و حەز ناکەم کەس بیبینێت.

ماکوان: خاچی ناو ژوورەکەت سەرەو خوار هەڵواسیوە، مەگەر وانییە؟

لەناو ئایینی مەسیحی دا ئەگەر خاچ سەرەو خوار هەڵبواسرێت زۆر بێ ڕێزییە و کورە لای نەصرانییەکان).

قەشە تورە: نا ڕاست نییە، شتی وام نەکردووە تۆ بۆ دادگایم دەکەیت.

ماکوان: من دادگایت ناکەم، بەڵام ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی کە ڕێگامان بدەیت بێینە ژوورەکەت پاشان هەموو ئەو جادووانەی کە کردوتە بەتاڵی بکەینەوە خۆشت ڕزگار بکەین، وەیان ئامۆژگاری یەنس و ئەو بەڕێزانە دەکەم لیرە کە هاوڕێیەتیت نەکەن و دەرت بکەن لەماڵ و هاوڕێیەتیان.

یەنس: ئەگەر قسەی بەڕێز ماکوان قبوڵ بکەی بێینە ناو ژوورەکەت ئەوا وەکو جاران هاوڕێیەتیت دەکەم، خۆ ئەگەر ڕازی نەبیت فەرموو لەئێستاوە لێرە بڕۆ نامەوێت بەهیچ شێوەیەك بتبینم.

تورە: من دەڕۆم زۆر ئاساییە، بەلام ئەو قسانەی ئەم کەسە ڕاست نییە و هاوکارە لەگەڵ ڕۆحە پیسەکان.

یەنس: بەڕێز ماکوان لەگەڵ هەرکەس هاوڕێ و هاوکار بێت من بەکەسێکی ڕاستگۆی دەزانم، پیاوێکی نزیکە لە خوا. هەرچەندە من

تەمەنم ٦٢ ساڵە بروای تەواوم بە خوایەك نییە، بەڵام دڵنیام کە ماکوان هێزێکی پاك پاڵپشتیەتی.

توره: ماکوان یەکێکە لە کەسە جادووبازەکانی کلێسای شەیتان دووره لە هیڵین[٣]-ی ڕاستەقینە.

ماکوان: چۆن دەزانیت من لەگەڵ شەیتانەکان کار دەکەم و پێوەری هێلینی ڕاستەقینە چییە؟

توره: تۆ کەسێکی ئیسلامیت، ئیسلام ناتوانێت (هیڵین) بکات.

ماکوان: من نەمشاردۆتەوە و بە ئاشکرا وتوومە کە موسوڵمانم و ئایینم ئیسلامە، وا بزانم هەمووتان شاهیدی ئەوەم بۆ ئەیەن.

پرۆفیسۆر ئێدمۆند: بەداخەوە کەسێکی وەکو تورەم ناسی و هەست دەکەم زۆر تاوانبار و درۆزنە، لەبەرانبەریدا من ماکوان زۆر بەڕاستگۆ دەزانم، چووینە ماڵەکەی قورئانمان بینی و نوێژی کرد و دوعای کرد، ئینجا دەستی کرد بەکارەکەی خۆی، بەڵام ماوەی ٤ ساڵە تۆ دەناسم یەك ڕۆژ تۆم نەدیووە بپاڕێیتەوە لەخوا و نوێژ بۆ عیسا بکەیت، هەر بۆیە من بەقسەی ماکوان دەکەم و لەم ساتەوە بەهیچ جۆرێك قسەت لەگەڵ ناکەم.

یەنس: فەرموو هەڵسە بڕۆ لێرە مەمێنە دەنا خراپت پێ دەکەم.

توره هەڵسا ڕۆشت، لەنزیك دەرگای حەوشەکە بانگم کرد و وتم بۆکۆتا جار پێت دەڵێ باهاوکاریت بکەم و واز لەکاری خراپ بهێنە.

---

[٣] Healing

وەڵامی نەدامەوە و ڕۆشت، بانگی کرۆنیکا و دایکی هەیدی-م کرد وتم بەڕێز هیلدە دەنگوباسی کچەکەت؟

هیلدە: باشە، نانی خوارد چوو پشووو بدات، زۆر ماندوو بوو.

ماکوان: تکا دەکەم کە لە ژوورەکەیدا وێنەی ڕووت و و هەیکەلی تێدا نەبێت، ئەگەر گرنتی بدەم بە ئێوە کەوای لێ نایەتەوە تاکە پەیمانێك کە بیدەم بە ئێوە ئەویش موسوڵمان بوونییەتی.

یەنس: واتا دەشیت وای لێ بێتەوە؟ چارەسەر نەبووە بەتەواوەتی؟

ماکوان: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە ئەوانەی کە جنۆکە کۆنترۆڵیان دەکات زۆر ئاسانە جاری تر ئەو جنۆکانە بگەڕێنەوە و دووبارە کۆنترۆڵی بکەنەوە، تاکە پەرژین و پاڕاستنێك زیکری خوای پەروەردگارە بەتەنها و موسوڵمان بونییەتی.

پرۆفیسۆر ئیدمۆند: ئەمەی جەنابت باسی دەکەیت وەکو ئەوە وایە کە ئەگەر موسوڵمان نەبێت وای لێدێتەوە و تۆ مەرجی موسوڵمان بوونی بەسەردا دەسەپێنی.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە، مەرجەکە باس دەکەم بەڵام نایسەپێنم.بەڵکو داواتان لێ دەکەم دەنا ئێوە و کچەکەشتان ئازادن، ئەوەی من داوای دەکەم کاری خراپ و پارە و سەروەت سامان و شتی ناپەسەند نییە. من داوای خواناسی لێدەکەم، داوای حەیا و حورمەت گەڕانەوەی بۆلای پەروەردگاری دەکەم، داوا کردن و سەپاندن دوو شتی زۆر جیاوازن، وایە پرۆفیسۆر؟

ئیدمۆند: بەڵێ، بەڵێ تێگەیشتم ببوورە ئەگەر قسەکەم لەجێگای خۆیدا نەبوو.

ماکوان: نا، بەڕێز من کارم تەواو بوو بەجێتان دەهێڵم و خوای گەورە هیدایەتتان بدات.

یەنس: حەز دەکەم ئێوارە میوانداریتان بکەم، ڕاستە هیچ ئامادە نەکراوە بەڵام لە دەرەوە نان داوا دەکەین و بەیەکەوە دادەنیشین.

ماکوان: ببوورە من کاتم نییە، هاوڕێیانی تر ئازادن.

میلاد و مام فەرهاد وتیان ئێمەش دەبێت بڕۆین، کرۆنیکا لە ژوورەوە بوو، وتم بانگی بکەن بابڕۆین.

یەنس: من زۆر حەز دەکەم بەیەکەوە نان بخۆین، خواردنی حەڵاڵتان بۆ داوا دەکەم.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە دەزانم، بەڵام من هەردەبێت بڕۆم، تکایە کرۆنیکا ئاگادار بکەنەوە دەڕۆین.

یەنس: دەکرێت کرۆنیکا لێرە بێت من خۆم دوایی دەهێنمەوە، بەڵام دەمەوێت قسەیەکی تایبەت لەگەڵ بەڕێزت بکەم، بەیارمەتی با پیاسەیەك بکەین.

ماکوان: فەرموو لەخزمەتام

هەلساین دووركەوتینەوە لە مجلیسەکە.

یەنس: بەڕێز ماکوان چەندت پارە دەوێت تکایە ئاگاداری کچەکەم بە.

ماکوان: من بەپارە کار ناکەم و هیچم ناوێت و خوای گەورە ئاگاداری هەمووانە.

یەنس: واتا بەخۆڕایی ئەم كارەت كردووە؟

ماكوان: بەڵێ، بۆ نابێت؟

یەنس: دەبێت بەڵام بەلامەوە سەیرە، چەند كەسم بانگ كردووە كە كاری (هیڵین) دەكەن داوای پارەیان كردووە.

ماكوان: ئاخر من كاری هیڵین ناكەم و موسوڵمانم. ئەو قەشە مەسیحییانەی كە ئەو ناوەیان لە خۆیان ناوە و كردوویانە بە پیشە (هیڵین)

یەنس: واتا تۆ نەتكردووە بە پیشە؟

ماكوان: نەوەڵڵا ئەگەر بزانم ئێوەش پارەتان پێویستە پارەت ئەدەمی.

یەنس: من نازانم چۆن سوپاست بكەم و زۆر بە گەورە ئەی نرخێنم و ژیانی كچەكەمت ڕزگار كرد، باوەشی پیاكردم یەك دوو جار، لە وڵاتی نەرویج پیاوان یەكتری ماچ ناكەن.

ماكوان: زۆر ئاساییە تكایە من دەبێت بڕۆمماڵتان ئاوا و كاتێكی خۆش.

كرۆنیكا هاتە لام و وتی من دوایی دێمەوە.

ماكوان: بڕۆ پێشم بكەوە، لەگەل مندا هاتوویت و لەگەل منێشدا دەگەڕێیتەوە، با قسە نەكەم لەبەرچاوی ئەو خەڵكە، دەی خێراكە.

خێرا چوو بەوانی وت دەبێت بڕۆم دایكم تەنهایە و وام زانی پەرستار دێت بۆلای، بەڵام ئاگاداریان كردمەوە كە ناتوانێت بچێت بۆلای.

یەنس: تكایە با كاتی تر یەكتر ببینین.

ماکوان: بە دڵنیاییەوە ئەگەر بمێنین و نەمرین زۆر خۆشحاڵ دەبم.

پرۆفیسۆر ئێدمۆند: بەڕێز ماکوان من و هاوڕێکانم زۆر حەز دەکەین زیاتر قسە بکەین لەگەڵت، تکایە تکایە با چاومان بەیەکتر بکەوێتەوە.

ماکوان: زۆر خۆشحاڵ دەبم کەی ویستتان من ئامادەم بتان بینم.

مالئاوایمان کرد و گەڕاینەوە، چوومە بەردەرگای ماڵی مام فەرهاد بۆ ئەوەی ئەوان بگەیەنم، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشابووم ئەوەبوو کە کرۆنیکا لە ڕێگادا بێدەنگ بوو هیچ قسەی نەکرد، هەستم کرد بە جۆرێک لە جۆرەکان بە قسەکەم تێك چووە، دابەزین لەگەڵ میلاد خوا حافیزیان لێ کردم، منێش مەشغوڵ بووم بە قسەکردن لەگەڵ مام فەرهاد.

میلاد هاواری کرد وتی باوکە فریا کەوە چیمەن خان بوورایەوە.

هەردووکمان ڕامانکرد لەتاواندا شڵەژاین من خەیاڵم بۆ ئەوە چوو کە ترسابێت و جنۆکە چووبێتە لاشەی، دەستم کرد بە قورئان خوێندن، بەئاگا نەهات ئەنجا زانیم کە نەخۆشی جەستەییە، خێرا خستمە ناو سەیارەکەم تا بیبەین بۆ نەخۆشخانە. دەرچووین بردمانە نزیکترین عەیادەی شەوانە لە نزیکی خۆیان، بردیانە ژوورەوە خێزانی مام فەرهادی لەگەڵدا بوو، بەگریان هاتە لامان وتی تەندروستی زۆر ناجێگیرە و بە ئامبولانس بردوویانە بۆ خەستەخانەی (کالێنیس).

ماکوان: ئەی تۆ بۆ نەچوویت لەگەڵیدا.

گلارە خانم: ئاخر نەیانهێشت.

مام فەرهاد: خێرا بابڕۆین بۆ نەخۆشخانەی کاڵنێس لەوی ماوەیەك ماینەوە دوای چەند خولەکێك دکتۆرێك هات و وتی پشکنینی خوێنمان بۆ کردووە چاوەڕێی وەڵامەکەین تا بزانین بۆ وای لێهاتووە. دوای ماوەیەك هاتەوە وتی لە پشکنینەکەدا دەرکەوتووە کە تووشی (شێربەنجە) بووە، تەندروستی زۆر ناجێگیرە و دەبێت لێرە بمێنێتەوە.

لە مام فەرهادم پرسی کە ئایا پێشتر بە ئێوەی وتووە کە نەخۆشە یان ئەمە یەکەم جارە وای لێبێت؟

مام فەرهاد: جارێکی تر ئامبولانس هات، من چوومە دەرەوە وام زانی فاتمە خان نەخۆشە، بەڵام کرۆنیکایان برد، ئەو کاتە پێم وتن ئەگەر دەڵێن با یان خۆم یان خێزانم بێت لەگەڵتان وتیان پێویست ناکات.

ماکوان: واتا ئەمە یەکەم جار نییە وای لێبێت، خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات، گوناحە.

میلاد: کاك ماکوان بە دایکمی وتبوو کە شێرپەنجەی سنگی هەیە و عەمەلیاتی بۆ کراوە، هەرچەند وەکو خوشکم وایە، هەردوو مەمکیان بڕیوەتەوە، بەڵام تەشەنەی کردووە و ئەندامەکانی تریشی گرتۆتەوە، مەگەر خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات.

ماکوان: ئەم زانیارییانە چۆن دەزانیت؟

میلاد: دایکم پێی وتم، داوای کردبوو کە ئاگاداری بین، بەڵام وتبووی با کاك ماکوان و باوکم نەزانن.

ماکوان: چارەسەری هەیە؟

میلاد: ئەوەندەی من بزانم دەبێت چارەسەری کیمیایی بۆ بکەن، بۆ ئەوەی لە جێگایەکدا بیوەستێنن و نەهێڵن لەوە زیاتر تەشەنە بکات، بەڵام توخوا با نەزانێت کە من پێم وتوون.

ماکوان: نا بێخەم بە، هەرناهێڵم بزانێت کە ئێمە زانیومانە، کاتێك بەئاگا هات و چووینە لای وا خۆمان نیشان دەدەین هیچ نازانین، بەڵام زۆر خەمبار بووم بەڕاستی، خوای گەورە شیفای بدات.

دوکتۆرەکە جارێکی تر هاتەوە لامان و وتی ئەگەر دەتانەوێت دەتوانن بیبینن، بەڵام ماندووی مەکەن پێویستی بە ئیسراحەتە، چوونکە چارەسەری کیمایایی دەکەین و پێویستە پشوو بدات.

چوومە ژوورەکەی زۆر بەزەیم پیا دەهاتەوە چاوم پڕ بوو لە فرمێسك، تەماشام دەکرد و فرمێسکێش لەچاوم دەخلیسکا و بەقوڵی هەناسەم هەڵدەکێشا و تەماشام دەکرد، بەدەنگی هەناسە و گریانەکەی من چاوی بەرز کردەوە و وتی:

ماکوان بۆ من دەگریت، زەردە خەنە گرتی و چاوی نایەوە بەیەکدا، ئەو زەردەخەنەیەی زۆر قسەی تیابوو، ئەوەندەی تر دڵی پڕ کردم، پشتم تێکرد کە بڕۆم.

دیسان وتی ماکوان بەجێم دەهێڵیت؟

ماکوان: نا، لات دەبم بەڵام با ئیزعاجت نەکەم لەدەرەوە دەوەستم.

کرۆنیکا: هیچ کات بەتۆ ئیزعاج نابم.

## هیوایەکی بێ هیوا

کە چوومە ژوورەکەی خەوی لێکەوتبوو، زۆر بەزەییم پێدا هاتەوە، زانیم کە کۆتایی تەمەنییەتی. فرمێسک لە چاوم هاتە خوارەوە و هەناسەم هەڵدەکێشا، بەدەنگی هەناسە و گریانم بەخەبەر هات.

زەردەخەنەیەکی زۆر نایاب و جوانی کرد، خۆشحاڵ بوو کە منی بینی بۆی دەگریم، هەستی کرد کە خۆشم ئەوێت. پشتم تێکرد کە بڕۆمە دەرەوە وتی ماکوان بەجێمدەهێڵیت؟

ماکوان: نا دەچمە دەرەوە دادەنیشم با ئیزعاجت نەکەم.

کرۆنیکا: هەرگیز بە تۆ ئیزعاج نابم، تکایە بەجێم مەهێڵە.

ماکوان: دڵنیابە بەجێت ناهێڵم، توخوا گەردنم ئازاد بکە کە ئێوارە لێت توڕە بووم. زۆر بە ناشیرینی وتم پێشم بکەوە بابڕۆین، بەخوا من ناخ و تەبیعەتم عەشایەرییە، ئەوەی لەگەڵ من بێت بەجێی ناهێڵم، مەبەستم ئەوە بوو مادام لەگەڵ من هاتوویت من لێت بەرپرسم.

دیسان زەردەخەنەکەی کردەوە ئەوەندە شیرین و جوان بوو دنیایەک ووشەی تیا بەدی دەکرا.

کرۆنیکا: بەپێچەوانەوە، ئەوکاتە هەستم کرد کە خاوەنم هەیە و ئەوەندە خۆشحاڵت کردم، ئەگەر ئازارم نەبوایە لە خۆشیدا پێدەکەنیم.

ماکوان: یاخوا هەر پێکەنینت گوڵی من.

کرۆنیکا: بەڕاستی ئەوە تۆیت وا قسە لەگەڵ من دەکەیت؟ ئەزانم ئەوەندەم نەماوە و دەمرم تۆش دەزانیت کە کاتم کەمە بۆیە ئاوا قسەم لەگەڵ دەکەیت؟

ماکوان: ئەگەر مردن و ژیان بەدەست من و تۆ بوایە، دڵنیابە ناومان مرۆڤ نەدەبوو، بەڵام چەندین کەس لە لێواری مەرگ دا بوون و تەمەنیان بۆ درێژ کراوەتەوە، ئەوەندەی من بزانم کرۆنیکا بەتەمای مردن نییە، بەڵکو بۆ ژیان دەژیای و هەنگاوت دەنا.

کرۆنیکا: بڵێم چی هیوام زۆر کەمە، بەڵام قسەکانت یەك پارە وزەیە بۆم، هێز و توانام پێ دەبەخشێت.

ماکوان: دەچم گوڵت بۆ دێنم، کام گوڵە لەخۆت چوو ئەوەت بۆ دێنم، برسیمە خواردن دەهێنم بەیەکەوە نان بخۆین، ڕازی دەبیت؟

کرۆنیکا: با بیری لێ بکەمەوە، کێشە نییە ڕازیم بەیەکەوە نان بخۆین.

ماکوان: سوپاسی ئەو کاتە دەکەم کە بەخشیت بە من.

ئەڵبەت بۆ دڵی خۆشی ئەو وام دەوت.

چووم خواردن و گوڵم بۆ هێناو لە تەنیشتیەوە دانیشتم نانەکەم دەکرد بە دەمیەوە، پەرداخیک کۆلاشم بۆ ئامادە کردبوو بیخواتەوە، زوو زووش پێم دەوت، ئەو گوڵەی کە هێناومە شێوەی لەیەکێك دەچێت.

کرۆنیکا: لە کێ دەچێت؟

ماکوان: بە دڵنیاییەوە لە کرۆنیکای گوڵی ماکوان ئەچێت.

کرۆنیکا: ئێستا بشمرم ئاساییە، تۆ بگەڕێوە با دایکم بێت بۆلام، تۆ بچۆرەوە ماڵەوە دەزانم ماندوویت.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە دەچم دایکت دێنم بۆلات، ئەگەر پێت خۆشە لە بەردەرگای خەستەخانەکە دەوەستم.

کرۆنیکا: نا خوای گەورە لەمنت نەسێنێت، زۆر ماندووم کردیت، تەنها دایکم بێنە بۆلام ئەزانم ئێستا دڵی لامە.

ماکوان: بەسەرچاو ئێستا دەچم دەیهێنم

کاتژمێر دەی شەو بوو کە دایکی کرۆنیکام برد بۆ خەستەخانە و گەڕامەوە ماڵەوە، ماندوێتی زۆری بۆ هێنام خەوم لێکەوت، خەبەرم بووەوە بۆ نوێژی بەیانی زۆر دڵ پڕ لە گریان بووم، بەدەم گریانەوە دوعای خێرم زۆر بۆ کرد، پاشان خەوم لێکەوتەوە. کە بەخەبەر هاتم ڕاستەخۆ بەرەو نەخۆشخانە بەڕێ کەوتم لە ڕێگا حەزقیل، سەسیل و شێخ بەرقان هاتن بۆلام بەیەکەوە بەدەم قسە کردنەوە بەرەو نەخۆشخانە ڕۆشتین.

شێخ بەرقان: هەرچی بڵێین و قسە بکەین ماکوان ئاگای لە ئێمە نییە، ماکوان سەرقاڵە بە دڵییەوە.

ماکوان: یاشێخ نازانم بڵێم چی لەخۆوە هەست بە تاوانباری دەکەم.

شێخ بەرقان: بۆ؟ خۆ تۆ تووشی سەرەتانت (شێرپەنجە) نەکردووە. بەڵکو ئەوەی تۆ بۆت کردووە هیچ کەس بۆی نەکردووە، پێویستە من قسەت لەگەڵ بکەم دەربارەی کارەکەی دوێنێت کە زۆر سەرکەوتوو بوویت، بەڵام چەند شتێکت ماوە کە پێویستە ئاگاداری بیت و بیکەیت.

ماكوان: یا شێخ بڕوا بكە مێشكم هیچ وەرناگرێت، با كاتێكی كە قسە بكەین.

شێخ بەرقان: باشە حاجی ماكوان گیان، خوات لەگەڵ.

ماكوان: خواتان لەگەڵ.

دەمویست بفڕم تا بە زوترین كات بگەمە لای كرۆنیكا، گەیشتمە نەخۆشخانەو بە پەلە خۆم گەیاندە بەشی شێرپەنجە، كە چووم جێگاكەی چۆڵ بوو، دڵم خورپەی یا وتم مردووە.

ئاگام لە خۆم نەماو كۆنترۆڵم لەدەست یا، پرسیارم كرد كێ بەرپرسە لێرە؟

ئافرەتێك بەدەممەوە هات وتی فەرمووو با هاوكاریت بكەم.

ماكوان: دوێنێ نەخۆشێكمان هێنا كە دایكی لەلای بوو، ئێستا لەكوێیە؟

پەرەستارەكە: پەلە مەكە با بپرسم.

ڕۆشت پاش دە خولەك گەڕایەوە وتی بەیانی بە ئامبولانس بردویانە بۆ نەخۆشخانەی ڕادیۆم هۆسپیتاڵ (ئەم نەخۆشخانەیە تایبەتە بە نەخۆشییەكانی شێرپەنجە).

سوپاسم كرد و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە،، ماندوێتی دوێنێ شەوم هێشتا نەحەسابوویەوە زۆر ماندوو شەكەت بووم خەوم لێكەوت، ئێوارە دڕەنگ خەبەرم بوویەوە، وتم تازە دڕەنگە بەیانی دوای كار دەچم بۆلایان بۆ نەخۆشخانە، بەیانی لەسەر كار بووم لەلایەن پۆلیسەوە تەلەفۆنم بۆكرا كە هەندێك دۆكۆمێنتیان لایە دەبێ بچم وەری بگرم.

کاتێك چووم وەرمگرتن بە ئیتالی بوون و کۆپەیەکیشیان لێ وەرگێڕا بوو بۆ زمانی کوردی، بڕیارەکەی دادگای ئیتالیا بوو کە بۆچی سزای ٩ سال زیندانی داوە بەسەرما، کە بینیم ئەوەندەی تر بێزاری و خەمۆکی دایگرتم.

کە تەماشام کرد لەسەرەوە ناوەکەم بەهەڵە نووسرابوو ٩ ساڵ زیندانیان دابوو بەسەر (نەریمان کریم محمد)دا کە بینیم وتم ئەمە سەرەتاکەیەتی هەڵەیە داخۆ ناوەرۆکەکەی چی تیا بێت.

گەڕامەوە ماڵەوە دیسان کات دڕەنگ بوو فریا نەدەکەوتم کە بچم بۆلای کرۆنیکا، چوونکە ئەو نەخۆشخانەیە کاتی تایبەتی هەیە بۆ سەردانی نەخۆش.

لەماڵەوە دانیشتم دەستم کرد بە خوێندنەوەی بڕیارەکە نووسرابوو کە ماوەی مانگێك کاتت هەیە بۆ تێهەڵچوونەوە لە بڕیارەکەی دادگا. ئەو شەوە چەند جارێک نوسخە وەرگیڕدراوەکەم خوێندەوە، پاشان خێزانم تەواوی بڕیارەکە کە بەئیتالی نووسرابوو تایپی کرد و لە گوگڵ ترانسلەیت وەریگێڕا، کە سەیرم دەکرد ئەوەی کە وەرگێڕدراوە و بەدەست من گەیشتووە و ئەوەی کە لە ئیتالیاکەدا نووسراوە زۆر جیاوازن.

لە هەردووکیاندا شتی وا فەنتازیای تێدا نووسرابوو، بۆیە دەموت ئەمە بۆمن نییە، چوونکە ئەم شتانە هیچی من نیم و دوورن لە ڕاستی و هەمووی درۆ و دەلەسەن، ئەبێ سزای نۆ سال بەسەر کەسێکی تردا دراوە.

کە ئەو حاڵەتەم بینی ئەوەندە بێزار بووم کە تەنانەت تاقەتی خۆشم نەبوو، ئەم بڕیارە لەدوای شەش مانگ لە کۆتا بڕیاری دادگا بە دەستی من گەیشتووە، لە غیابی خۆمدا حوکم دراوم. چەندین جار داوام کرد کە هیچ

نەبێت با لەڕێگای ڤیدیۆوە ئامادەی دادگایی کردنەکە بم و هیچنەبێت بتوانم دیفاعێك لە خۆم بکەم، قبوڵیان نەدەکرد.

لە نەرویجیش بەمن دەوترا بەردەوام کە تۆ تەسلیمی ئیتالیا ناکرێیت و تۆ هیچت لەسەر نییە و زیندانی ناکرێیت.

هەرچۆن بوو دانیشتم وەڵامی خاڵ بەخاڵی درۆکانی ئیتالیام دایەوە وناردم بۆ پارێزەرە ئیتالیەکەم (مارکۆ ڤێرنیلۆ) ئەویش بەنامەو ئیمێل قسەی لەگەڵ دەکردم، ئینگلیزی نەدەزانی، بە ئیتالی دەینووسی و لە گوگڵ ترانسلەیت وەری دەگێڕا بۆ ئینگلیزی و دەینارد بۆ من، ناچار ئێمە داواکەمان نووسی و وەرمان گێڕا بۆ چوار زمان و بۆمان ناردن (کوردی، عەرەبی، نەرویجی و ئینگلیزی) بۆ ئەوەی هیچ حوجە و هەنجەت و بیانویەکیان بەدەستەوە نەمێنێت.

سەرقاڵ بووم بەو کارەوە خۆم لەبیر کردبوو، دوای چەند ڕۆژ وتم هەرچۆنێك بیت دەبێت مەجالێك بدۆزمەوە بچم بۆ نەخۆشخانە سەردانی کرۆنیکا بکەم، ڕۆژی هەینی بوو کاتێك لەکار تەواو بووم ویستم بەرەو ئۆسلۆ بکەومە ڕێ، لەڕێگا سەیارەکەم وەستا و فریاگوزاری هات بەدەممەوە، خۆم و سەیارەکەماین بردەوە بۆ نزیکترین شار تا لە شەریکە سەیارەکەم بۆ چاك بکەنەوە.

کە چوومە کۆمپانیا وتیان بەلایەنی کەمەوە هەفتەیەکی پێدەچێت، چارم نەما خۆم بە قیتار گەڕامەوە بۆماڵەوە.

بۆ بەیانی ڕۆژی شەممە لەهەوڵی پەیدا کردنی سەیارەدا بووم کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ یەنس تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی ئەمڕۆ کاتژمێر ٢ی دوانیوەڕۆ

دێین بۆماڵتان ئەگەر گونجاو بێت، منیش بووم بە قسەی خۆمەوە و وتم بەخێربێن چاوەڕێتانم.

میوانەکانم هاتن سێ کەس بوون (پرۆفیسۆر ئێدمۆند، یەنس و ئافرەتێکی دەروونناس کە هاوکاری ئێدمۆند بوو بەناوی کریستینە) هاتبوون.

گوڵێکی جوان و تابلۆیەکیان بە دیاری بۆ هێنابووم، دوای هەواڵ پرسی و چۆنی و چاکی هەواڵی کچەکەیم پرسی وتم حاڵی چۆنە؟

یەنس: سوپاس بۆ تۆ وەکو جاران حاڵی باش بووە و زۆر سەرقاڵە، بۆیە ئەمڕۆ نەهاتن لەگەڵمان ڕۆشتوون بۆلای کرۆنیکا. کاتێك بیستمان زۆر نارەحەت بووین بەوەی کە نەخۆشە، بەڵام هیچ لە کلتور و ژیانی ئێوە نازانم بۆیە تا ئەم ساتەوەختەش نازانم چۆن و چی بکەم تا پاداشتی ئەو چاکەیەت بدەمەوە.

پرۆفیسۆر ئێدمۆند: ئەو قسەیەی یەنس زۆر تەواوە هەموومان تووشی شۆك بووین.

ماکوان: بۆ چی بووە؟

پرۆفیسۆر ئێدمۆند: تکایە ڕێگام بدە با قسەکان تەواو بکەم، دەمەوێت قسەی دڵی خۆمت بۆ بکەم و واقیعەکەت بۆ ڕوون بکەمەوە.

ماکوان: ببوورە فەرموو بە ئیسراحەت قسەی خۆت بکە.

پرۆفیسۆر ئیدمۆند: کە دەڵێم تووشی شۆك بووین وا ماوەی چوار ڕۆژە ئێمە سەیری ئەو ڤیدۆیە دەکەین کە لەکارەی تۆ گرتوومانە، هیچ سەری لێ دەرناکەین، هیچ تەفسیرێکی زانستی و تەنانەت میتۆلۆژیشم بۆ

ناکرێت. هەشت کەس لە لێکۆڵەرەوان تەماشامان کردووە هەریەکەو قسەیەك دەکات و لێکدانەوەیەکی بۆ دەکات، لە دوایدا هەمووman پەشیمان دەبینەوە.

دەمەوێت ڕاستگۆ بم لەگەڵت ئەو ناوانەمان لێ ناویت وتمان کەسێکە کاری هیڵین دەکات، بەڵام لەوان ناچیت.

وتمان جادوو بازە، بەڵام دژی ئەوانی

وتمان بە کیلسا و سەلیب کار دەکات، بەڵام تۆ موسوڵمانیت.

وتمان چەکرا[٤] بەکاردەهێنێت، بەڵام تۆ بڕوات پێی نییە.

لە کۆتاییدا وتمان لەوانەیە شامانیزم[٥]-ە بەڵام لەوانەیە هەر نەشزانیت چییە.

بەڕاست تۆ چیت و تەفسیری کارەکەت چییە؟

ماکوان: تەواو بوویت جەنابی پرۆفیسۆر؟

ئێدمۆند: بەڵێ، فەرموو.

ماکوان: سەرەتا من کەسێکی زۆر ئاسایی و مرۆڤێکی نۆرماڵم. ئەوەی من کردم و فێری بوو هەموو کەسێک دەتوانێت فێری ببێت. تایبەت نییە بە ماکوان، کێشەکەی ئێوە لەوەدایە کە لێکدانەوە و تەفسیرتان لە ڕێگای بایەلۆجییەوە یاخود زانستیی ئەکادیمیەوەیە و بیردەکەنەوە.

[٤] Chakra
[٥] Shamanism

ئیدمۆند: تۆ بڕوات بە زانستی ئەکادیمیی نییە؟

ماکوان: ڕێگام بدە تا قسەکانم تەواو بکەم، خۆ من (یورالف یێرستاد)[٦] نیم تا بڕوام بە زانست و ئەکادیمیا نەبێت، بڕوای تەواوم بە زانست و ئەکادیمیای زانستی هەیە.

ئێدمۆند: زۆر ببوورە یورالف یێرستاد چۆن دەناسیت؟

ماکوان: من لەنەرویج دەژیم خۆ لە ئاسمانەوە نەهاتووم، ئەویش خەڵکی ئەم وڵاتەیە و لەناوچەی (سنۆسا) ژیاوە.

ئێدمۆند: بڕوات پێیەتی؟

ماکوان: بە دڵنیاییەوە نەخیر بە ساختەچی و فرتوفێڵ و ساحیری دەزانم.

یەنس: بروا بکە بەڕێز ماکوان لە نەرویج ٥٠ هەزار کەسی لە نەخۆشی چاك کردۆتەوە.

ماکوان: لەکوردستان هاوشێوەی ئەو پیاوەی لای ئێوە زۆرە، بڕوابکە ئەو کەسەی تۆ باسی دەکەیت خوشکەکەی خۆی بە ساختەچیی زانیووە.

ئێدمۆند: تکایە ماکوان با پرسیار بکەم وەڵام بدەرەوە، مێشکم ئاڵۆز بووە ڕێکخراوێکە هەموو نەخۆشەکانی تۆمار کردووە، چۆن (NAFKAM)[٧]

ڕاست نییە، تەنانەت وەزیری تەندروستی نەرویج بۆ چارەسەری کوڕەکەی چووەتە لای.

---

[٦] Jorlaf Gjerstad

[٧] ناوەندی توێژینەوەی نیشتیمانی بۆ پزیشکی تەواوکەر و جێگرەوەی

ماكوان: بەدڵنیاییەوە بەشێکی کارەکەی جادوو و سیحر بووە، جنۆکە بۆیان کردووە، بەشێکی تری ساختەچێتی بوو، ڕەخنەگرێکی ئەمەریکی هاتە لای وتی یەك ملیۆن دۆلارت ئەدەمێ بۆ ئەو کارانەی کە دەیکەیت، من نەخۆشێکت بۆ دێنم لەژێر چاودێری و پاراستنی ئێمەدا چارەسەری بکە، قبوڵی نەکرد و نەیتوانی بیکات، ئەو ڕێکخراوەی باسی دەکەیت (سنۆسمان) خۆی خاوەنی بووە، بۆ زانیاریت ئەو کەسەی کە ملیۆن دۆلارەکەی دایە ناوی (جێمس ڕاندی) بوو، هەروەها پرۆفیسۆر (تۆرکۆ لارسن) بەئاشکرا باسی ئەوەی کرد کە (سنۆسمان) واتا یورلاڤ پیاوێکی ساختەچی و خەڵك هەڵخڵەتێنەرە.

خوێندنەوەی من بۆ ئەو کارەی وەزیری تەندروستی کاتێک ئەو کارەی کرد کە لە کاتی هەڵبژاردنەکان و سەروبەندی بانگێشتی هەڵبژاردن ئە وکارەی کرد، تەنها کارێکی سیاسی بوو، جەنابت باش دەزانیت کە سنۆسمان لە پارتی کاری نەرویجی کاری کردووە، کەسێکی سیاسی بوو، بڕوای بە بە زانست و ئەکادیمیا نەبوو تا پۆلی پێنجی بنەڕەتی خوێندبوو، ئەو کارانەی کە دەیکرد زۆربەی کاری جنۆکەکان و سیحر بوو. هیچ پەیوەندی بە دینەوە نەبوو، هەرچەند ئەو خۆی بە پیاوێکی ئایینی دەناساند.

تەنانەت لە ساڵی ٢٠١٦ کەناڵی ئێن ئارکۆ فیلمێکی دۆکیومێنتاری لەسەر دروست کرا کە ١٢٠ ملیۆن کرۆنی تێچوو، خۆی بە پێغەمبەری ناوچەی سنۆس دەزانی، جا بۆیە من بڕوام پێی نییە.

ئێدمۆند: زانیاریەکانت تەواون، ئەی بڕوات بە کاری (چاکرا) هەیە؟

ماكوان: نەوەڵڵا نەك بڕوام پێی نییە، بەڵکو بەحەرامیشی دەزانم. ئەوە بەشیکە لە عیبادەتی بوزای و لاوتستۆیی و کۆنفۆشیوسی کە زیاتر پەیوەندی بە یۆگاوە هەیە.

ئێدمۆند: واتا باوەڕت بە یۆگا نییە؟

ماکوان: نا من پێم وایە ئەو کارەی کەلە یۆگادا دەکرێت، پەیوەندی بە ئایینی چینییەکان و هیندۆسەکانەوە هەیە، چوونکە پێکهاتووە لە ٧ بەشی سەرەکی.

یەکەم: بەکارهێنانی عەورەتی پێشەوە

دووەم؛ بەکارهێنانی عەورەتی دواوە

سێیەم: بەکارهێنانی ناوك

چوارەم: بەکارهێنانی دڵ

پێنجەم: بەکارهێنانی گەردن و مل

شەشەم: بەکارهێنانی ناوچاو و تەوێڵ.

حەوتەم: بەکارهێنانی کەللەی سەر.

هەموو ئەمانە بەکاردێت لە دانیشتنی ئاسۆیی و شاقۆڵی.

مەبەست لە شاقۆڵی ئێسکەکانی پشتە و ئاسۆی مەبەست دانیشتنە لەسەر کۆم و گەردن و مل و پشتەسەر و..هتد

ئەوەی لە یۆگادا بەکاردێت و قۆناغی پێگەیشتنی جادووی چەکارایە، کەناویان لێناوە بە ئێنەرژی و هیواخواستن و تێکەل بوون لەگەل ڕۆح، کە هەمووی درۆ و ساختەچێتی و بنەماکای دەگەڕێتەوە بۆ جنۆکە و شەیتان.

ئێدمۆند: ئەی دەربارەی شامانیزمە چی دەڵێیت؟

ماکوان: ئەوە هەر زۆر کۆنە، زیاتر قەرەج و هیندەسوورەکان و سامییەکانی سیبیر بەکاری دەهێنن، بەشێکی زۆری خورافیاتە و بەشەکەی تری سیحر و جادووە. پیاوەکاهینەکانی هیندە سوورەکان شامانیسمیان دەکرد، گوایە ئەوان لەنێوانی دنیای کۆتایی و لەم جیهانەدا زنجیرەی پەیوەندین. بۆیە نەك بڕوام پێی نییە بەڵکو بە حەرام و کوفری دەزانم.

پرۆفیسۆر ئێدمۆند: ئەی تەفسیری کارەکەی تۆ چییە؟

ماکوان: تەفسیری کارەکەی من ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، دوژمنایەتی نێوانی چاکە و خراپەیە. زانست ناتوانێت لە چاك و خراپ بکۆڵێتەوە، زانست دەستنیشانی چۆنێتی دەکات نازانێت هاتوو چۆنە.

ئێدمۆند: تێناگەم مەبەستت لە هاتوو چییە؟

ماکوان: زانست بۆ گەڕانەوەی سەرچاوە زۆر دواکەوتووە، هێشتا لەسەرەتاشدا نییە بۆ ئەو کارە، بۆیە پەنا بۆ فەلسەفە دەبات. بۆ نمونە ئەگەر بەزانست بڵێین سەرچاوەی یەکەم خانە و پێکهاتەکانی ناوك و سایتۆپلازما چۆن هاتووە دەتبات بۆ ئەلەکترۆنەکان و موجەب و سالب، زۆری بۆ بهێنە دەتبات بۆ زانستی موجەرەد، یان دەڵێت نازانم یاخود دەڵێت بە سوتفە (ڕێکەوت) دروست کراوە، یان دەڵێت ئەمە هەربووە، نایەوێت دان بنێت بە دروستکەری یەکەم و سەرچاوەی هەموو شتەکان کە پەروەردگارە، ڕوونە؟

ئیدمۆند: ڕاستە وایە، زانست لەگەڵ شتی بەرجەستە مامەڵە دەکات.

ماکوان: من و تۆ هەرگیز بەیەك ناگەین، تۆ بەزانست داوا لەمن دەکەیت، منیش بە دین وەڵام دەدەمەوە، دوو هێڵی تەریبین بەیەکەوە درێژ

دەبینەوە، خاڵی هاوبەشمان نییە بۆ گەیشتنمان بەیەك، تەنها یەك فولکە هەیە کە بمان وەستێنێتەوە.

ئێدمۆند: ئەو فولکە و گرێیە چییە کە زانست و دین بەیەکەوە دەبەستێتەوە؟

ماکوان: ئەقڵ

ئێدمۆند: ئێ منیش شتی ئەقڵیم دەوێت.

ماکوان:نا، تۆ بەدوای ئەقڵەوە نیت. تۆ داوای شتی بەرجەستە دەکەیت، وایە؟

ئێدمۆند: مەگەر ئەقڵ بەرجەستە نییە؟

ماکوان: بێزەحمەت ئەقڵی جەنابت لەکوێدایە؟

ئێدمۆند: لەمێشکمدایە.

ماکوان: مێشک هیچ پەیوەندی بە ئەقڵەوە نییە، بەڵکو سەنتەری کۆنترۆڵی سیستەمی گیانلەبەرانە.

تۆ داوای بەرجەستە بوون دەکەیت وەك هەستەکان (تام، بینین، بۆن، بیستن و بەرکەوتن)، زانست کار لەسەر ئەوە دەکات، فەلسەفە کار لەسەر ئەقڵ دەکات، ئیسلام کار لەسەر هەردووکیان دەکات.

ئێدمۆند: پێویستم بەوە هەیە کە چەند ساڵیک لای تۆ بخوێنم، ئایا ئامادەیت ئەم باسە بە نووسین یاخود کۆرێك پێشکەش بە ئێمە بکەیت، هەموو کات و ماندوبوونەکەشت لەسەر زانکۆ دەبێت.

ماکوان: زۆر بە خۆشحاڵییەوە ئامادەم.

ئیدمۆند: سەرەتای سێمێستەری یەکەمی ساڵی خوێندن دەست پێ بکە، ئێمە ناتوانین سەرپەرشتیارت بین چوونکە تۆ باسی بەڕەت بۆ ئێمە دەکەیت، خۆت سەرپشك بە کەکێ هاوکارت بێت.

ماکوان: نەخشە ڕێگای بۆ دادەمەزرێنین.

ئێدمۆند: من قسەم نەما و ماندوومان کردیت.

ماکوان: بە پێچەوانەوە خۆشحاڵتان کردم.

ئەوان ڕۆیشتن و منیش ماڵئاواییم لێکردن، تەلەفۆنم بۆ کرۆنیکا کرد داوای لێبوردنم لێکرد کە میوانم هاتووە.

بەکرۆنیکام وت کە بەیانی دێم سەردانت دەکەم.

کرۆنیکا: نا بەیانی ناکرێت، چونکە من سێ ڕۆژە دەرمانی کیمیایی وەردەگرم، بۆیە خەستەخانە بڕیاری یاوە بمباتە دەرەوە تا کەمێك بگەڕیم دەچـم بۆ ئۆپێرای ئۆسلۆ. بیخەرە دوو بەیانی، باشە؟

ماکوان: زۆرباشە، هەر تۆ خۆشحاڵ بیت، منیش خۆشحاڵ دەبم.

بۆ بەیانی کاتژمێر دەی بەیانی حەزقیلم لێ پەیدا بوو، بەگەرمی هەواڵی پرسیم و وتی هاوڕێیان سڵاویان هەیە بۆت، بەڵام ڕوخساری زۆر خەفەتبار دیاربوو.

ماکوان: حەزەی برام بۆ وا بێتاقەتی، خۆ هیچ ڕووینەداوە کەسوکارم، هیچ هەواڵێکی ناخۆشت پێیە، پێم بڵێ ئەوەندە هەواڵی ناخۆشم بیستووە بەرگەی هەموو ناخۆشییەك دەگرم، ڕاهاتووم، حەوت برا قسەم بۆ بکە.

حەزقیل: نا هیچ ڕووینەداوە، خوای گەورە هەموو لایەك سەلامەت بکات،سوڵتان سڵاوی زۆری هەبوو بۆت داوایەکی لێ کردوویت جا نازانم بە قسەی دەکەیت یاخود نا.

ماکوان: هەرچی بە من بکرێت لە خزمەتی سوڵتاندام، بڵێ بزانم داواکەی چی بوو؟

حەزقیل: دەیوت بە ماکوان بڵێ با پێش مەرگی کرۆنیکا هاوسەرگیری لەگەڵ بکات.

ماکوان: سەیرە ئەو لەلێواری مەرگدایە بۆ ئەم داوایە لەمن دەکرێت؟

حەزقیل: نازانم ئەو داوایەی لێت هەبوو.

ماکوان: وەڵڵاهی حەزەی برام بڵێم چی، ماوەیەك کاتم بدەرێ با بیرێکی لێبکەمەوە، وەڵامەکەتان ئەدەمەوە، باشە؟

حەزقیل: زۆر باشە من هەواڵەکە دەگەیەنم و تۆش ئاگات لەخۆت بێت.

ماکوان: ئەوە بۆ وا قسەم لەگەڵ دەکەیت ئەڵێی من بەرەو مردن دەچم؟

حەزقیل دەستی کرد بەگریان و ڕۆشت بێ ئەوەی خواحافیزیم لێبکات، زۆر سەرم سوڕما بەو کارەی، وتم بڵێی کرۆنیکا مردبێت.

تەلەفۆنم بۆ کرد جوابی دایەوە وتی کاتژمێر ١١ دەڕۆم. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخر بۆچی هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێك بکەم کە هیچ هیوایەکی بە ژیان نەماوە و دەمرێت، لەم هاتوچۆیەدا بووم لە کۆریدۆری ژیانمدا کە ئەقڵم نەیدەگرت، چوونکە زەواج کردن تەنها قسە و باس نییە وژیان و مەرگیش بەدەست خوای پەروەردگارە، ئەی ئەگەر ئەم ئافرەتە ژیا و چاك بوویەوە، من ناتوانم لەگەڵی بژیم. بۆ من زۆر قورس دەبێت، چوونکە ژیانی خۆم و خێزان و منداڵەکانم لەدەست ئەیەم، بەڵام سوڵتان تەکلیفی کردووە پێم ناخۆشە تەکلیفەکەی بشکێنم، دوایش دەموت ئاخر خۆ سوڵتان بڕیار نادات بۆ ژیانی من با هەر بۆخۆی بڵێت.

هەرچۆن بوو گەیشتمە ئەو بڕیارەی کە ناتوانم نە درۆ لەگەڵ خۆم بکەم نە لەگەل سوڵتانیش و نەلەگەڵ کرۆنیکاش. درۆ لەگەل خۆم ناکەم نامەوێت ماڵومنداڵم لێ تێك بچێت، درۆ لەگەڵ سوڵتان ناکەم و ناتوانم ژنی تر بهێنم و درۆ لەگەڵ کرۆنیکاش ناکەم کە نەتوانم ڕاستگۆ نەبم لەگەڵیدا.

بۆ ڕۆژی دوایی چووم بۆلای کرۆنیکا، ماوەیەك بوو نەمدیبوو کێشی زۆر دابەزی بوو زۆر بەزەییم پیا هاتەوە، کاتێك کە دەرگاکەم کردەوە و بەو شێوەیە بینیم لەتاوا ئاگام لە خۆم نەما کاتێك کە سڵاوم کرد لە خۆی و دایکی دەرگاکەم داخستەوە پەنجەم کەوتە بەردەرگاکە و ئازارێکی زۆرم پێگەیشت و کەمێك خوێنی لێهات، کە ئەو حاڵەتەی بینی وەك شێتی لێهات خێرا هەڵسایەوە و ڕووەو من هات وتی چی بوو، من خۆم لام گرنگ نەبوو، کەچی ئەو هاواری دەکرد.

کرۆنیکا: نازانم بۆ دایم مێشکت مەشغولە و ئاگات لەخۆت نییە.

پەنجەمی گرت بۆ ئەوەی خوێنی لێ نەیەت، هیچی دەست نەکەوت لێی بئاڵێنێت لەتاواندا پەلاماری سەرپۆشەکەی خۆی دا تا پەنجەم بۆ ببەستێت، تەماشام کرد کە قژی پێوە نەمابوو!. ئەو ئاگای لەخۆی نەبوو، بەڵام من کە بینیم تووشی شۆك بووم. کە زانی سەرپۆشەکەی بەسەرەوە نەماوە تەریز بوویەوە و منیش نەمدەزانی چی بڵێم، پەنجەم لەدەستی دەرهێنا و سەرپۆشەکەم دایەوە بەسەریا.

ماکوان: خوا عەفوت بکات خۆ فیشەکم بەرنەکەوتووە، وازی لێ بهێنە بەو کاڵێنکسە دەیپێچم خوێنەکەی دەوەستێت، خوا جەزات باتەوە.

کرۆنیکا: ناشیرین بووم؟ ببوورە کە ئاوا دەرکەوتم.

دایکی دەستی کرد بە گریان کە گوێی لە کرۆنیکا بوو وای وت.

ماکوان: بە پێچەوانەوە لەورۆژەوەی کە ئیمان لە دڵتدا چەکەرەی کردووە لای من لە هەرچی شاجوانی جیهانە جوانتری، لەبەر ئەوە جوانی لە لاشەدا نییە، بەڵکو جوانی لە ڕەوشت و ڕۆح و قسە و کرداردایە. تۆلای من هەرجوانی.

کرۆنیکا ئاهێکی هەڵکێشا..

پیم وتن ئەم ئێوارەیە بەیەکەوە نان دەخۆین دەچم پیتزا دەهێنم، چووم بۆلای دەلاکێك سەرم تاشی و وەکو ئەوم لەخۆم کرد، پیتزایەکم کڕی و چوومەوە بۆلایان، ئینجا کە منی بینی تووشی شۆك بوو، وتی ئەوە بۆ وات لەخۆت کردووە.

ماکوان: لەبەر ئەوەی زۆر لە تۆ جوان بوو حەزم کرد لاسایی تۆ بکەمەوە!، وامزانی وەکو تۆ جوان دەبم، بەڵام ببوورە من لە تاوانبار دەچم و تۆش لە

مندالیکی ناسک کە تازە سەری مووی لێدێت، ئیستا زانیت جیاوازییەکە چەندە زۆرە.

فاتمە خان: وەی بەساقەت بم ماکوان گیان، بەخوا ڕۆلە هەر جوانخاس و پڕ ڕەوشتی، دوعای خێر بۆ ئەم کچە بکە یاخوا مەرگتان نەبینم ڕۆڵەکانم.

ماکوان: خوای گەورە تۆش تەمەن درێژ بکات، دوو ڕۆژی تر جەژنی قوربانە (إن شاءالله)هەموو دەچینە دەرەوە و کرۆنیکاش چاك دەبێتەوە، دوای ئەوەی نانمان خوارد من چووم دەستم بشۆم و لە کافتێریاکە دوو قاوە بۆ خۆم و کرۆنیکا بهێنم لە ڕێگا حەزقیل و کازۆڵم بینی.

حەزقیل: سوڵتان و جەماعەت هەموو لێرەن، سوڵتان تکات لێ دەکات کە داوای زەواجی لێ بکەیت.

ماکوان: حەزە هەروا ئاسان نییە، بڕواناکەم بتوانم ئەوە بکەم.

کازۆڵ: نەك تەنها سوڵتان داوات لێ دەکات، بەڵکو ئەوە داوای هەموو هاوڕیکانتە، ماکوان قسەمان مەشکێنە.

هەردووکیان ڕۆیشتن و بەجێیان هێشتم، بەبێ ماڵئاوایی و خواحافیزی، منیش چووم قاوەکانم هێنا و قاوەیەکم دایە دەستی کرۆنیکا و وتم ان شاء الله ساڵیکی تر بەیەکەوە دەچینەوە بۆ حەج تازە ئەم ساڵ فریا نەکەوتین.

کرۆنیکا: ان شاء الله

دایکی لەخۆشیا وتی هەموو مەسرەفەکەتان لەسەر من.

ماکوان: قسەیەکت پی بڵێم لەبەرچاوی دایکت دڵم مەشکێنە.

کرۆنیکا: فەرموو ماکوان تۆ دەزانی کە چەندە عەزیزی لەلام چۆن دڵت دەشکێنم

ماکوان: چەند کاتە دەمەوێت پێت بڵێم ئێستا لەبەرچاوی دایکت پێت دەڵێم هیوادارم ڕازی بیت.

کرۆنیکا: فەرموو بۆ بەشەرمەوە قسە دەکەیت، چیت دەوێت پێم بڵی.

ویستم داواکەی سوڵتان بەجێ بهێنم، بەڵام هەرچیم کرد نەمتوانی، بۆیە پێم وت هەستە دوو ڕکات نوێژی تەوبە بکە.

دوای ئەوە ماڵئاواییم لی کردن و بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە.

گەیشتمە ماڵەوە ویستم ڕاستەخۆ بچمە حەمام خۆم بشۆم سەروملم هەمووی موو بوو، تەلەفۆنەکەم زەنگی لێدا، کە جوابم یایەوە فاتمە خانی دایکی کرۆنیکا بوو دەگریا و دەیوت ماکوان فریام بکەوە، چیمەن مرد.

بە پەلە گەڕامەوە بۆ ئۆسلۆ دایکی و پەرستارێکم فێرکرد کە چۆن بیشۆن و چووم بۆ مزگەوت کفنم بۆ هێنا و تەلەفۆنم کرد بۆ کۆمپانیایەك کە کاری ئامادەکردنی گۆڕ و گواستنەوە و ناشتنیان ئەنجام ئەدا، هەموو شتێکم ئامادە کرد، بۆ ڕۆژی دوایی لە گۆڕستانێکی نزیك شاری ئۆسلۆ لە گۆڕستانی موسوڵمانان ناشتمان و دایکیم هێنایەوە، یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بوو، دایکی داوای کرد کە تەعزێی بۆ دابنێین، منیش پێم وت ئێستا جەژنە با جەژن تەواو بێت بە دڵنیاییەوە تەعزێی بۆ دائەنێین.

خەریکی ئامادەکردنی شووێن بووین بۆ تەعزێکەی کە چوارەم ڕۆژی جەژن بوو، بەیانی زوو لە خەو هەڵسام بەرەو کار بەڕێ بکەوم کە چوومە

خوارەوە بۆ ئەوەی سەیارەکە داگیرسێنم و بکەومە ڕێ پۆلیس و موخابەرات هاتن دەستگیریان کردم و ناردیانم بۆ ئیتالیا.

ئەم بەشە لێرەدا کۆتایی هات چاوەڕوانی سەرەتایەکی پڕ ناسۆر بن لە کتێبی داهاتوو بەناوی (مەملەکەتی زیندان لە دوورگەی شەیتان)

ماکوان کەریم
ڕۆژی یەکشەممە
٢٠٢٢/١٢//١١

## پاشکۆ:
## کارما

کەرەمە یان کرمن بەمانای کرداری مرۆڤەکان دێت، بەو مانایەی کە کرداری مرۆڤەکان لە ژیانیاندا خۆشبەختی و بەدبەختی دیاری دەکات. کە ئەم کردارانە لە ژیانی داهاتووشدا کاریگەری دەبێت.

واتا هەرچی بکەیت لەگەڵ خۆت دەیکەیت، چی چاك چی خراپ.

کارما عەقیدەی دینی هندۆسەکانە کە دەڵێن کارما واتای کردار دێت کە لە نووسراوەکانی ئوپانشادیدا هاتووە ئەگەر کاری چاك بکەیت خۆشبەخت دەبیت و ئەگەر خراپەکاریش بیت گرفتار و بەدبەخت دەبیت.

ئوپانشادی کۆنترین نووسراوی فەلسەفی هندۆسەکانە.

لە دینی هندۆیسمەکان و بودایسمەکان بە هۆکاری کرداری مرۆڤەکان (کارما) وزەیەك دروست دەبێت کە شێوازی ژیانی ئێستا و دوایی کەسەکەش دیاری دەکات.

لە ئایینەکانی هندۆیسم، بودایسم و جینیسم باوەڕیان بە دووبارە لە دایکبوونەوە هەیە. پێیان وایە ڕۆحیان ئەچێتە لاشەی کەسێکی تر و لەدایك دەبنەوە، خۆ ئەگەر کەسەکە کرداری باش بووبێت ئەوا ڕۆحەکەی دووبارە لە شتێکی جواندا لەدایك دەبێتەوە، خۆ ئەگەر کەسێکی خراپیش بووبێت ئەوا دەبێتە شتێکی پیس.

# کاپوێیرا

وەرزشێک یاخود سەمایەکی ئەفریقی بەڕازیلیە، کەلە ساڵەکانی ١٥٠٠ی زاینیدا لەلایەن کۆیلە ئەفریقییەکان لە بەڕازیل پەرەی پێدرا.

کاپوێیرا چەند جوڵەیەکی جیاوازە ئەنجام دەدرێت لەگەڵ گۆرانی و مۆسیقای تایبەت، کە گۆرانییەکان لە بەند و هۆنراوە میللیەکان وەردەگیرێن، ئەم جوڵانە لەلایەن کۆیلە ئەفریقیەکانەوە دەکرا کە ئاماژەبوون بۆ شۆڕش و جوڵانەوەی کۆیلەکان دژی خاوەنەکانیان.

بۆیە ئەم جوڵانە هەم بە وەرزش وە هەم بە سەماش ناودەبرێن.

لە کاپوێیرادا تەرکیز ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە بۆ جوڵەکانی کەسەکە خۆی و کەسی بەرانبەریشی.

ئامانج و مەبەستی سەرەکی کاپوێیرا ڕاکردنە لە جوڵەی کەسی بەرانبەر نەك دیفاع کردن.

لە کۆندا ئەو کەسانەی کە ئەم جوڵانەیان ئەنجام ئەدا چەقۆ یاخود شتێکی نوکتیژیان بە قاچەکانیانەوە دەبەست بۆ ئەوەی بەرانبەرەکەیان عەزێت بەن یاخود بیکوژن، بەڵام لە ئێستادا زیاتر وەك هونەرێکی نمایشی ئەنجام دەدرێت.

# هیڵین Healing

جۆرێکە لە چارەسەری نەخۆشی جەستەیی و دەروونی کە پشت دەبەستێت بە هێزی دەرەوەی توانای مرۆڤ.

ئەم جۆرە چارەسەرە لە ڕێگای دەست لێدان لە نەخۆشەکە یان بەکارهێنانی هەندێك شت و ئەنجامدانی هەندێك کار کە لەتوانای مرۆڤەکاندا نییە.

هەندێك لەو کەسانەی کە ئەم کارە دەکەن، ئەڵێن کەوا بەبێ ئەوەی نەخۆشەکەش ببینن لە دوورەوە دەتوانن چارەسەری بکەن.

هیڵین شێوازێکی چارەسەری کۆنە کە ئەو کەسانەی کە ئەم کارە دەکەن بە شێوازی تایبەت بەخۆیان ئەم کارە ئەکەن، بەڵام هەموویان لە یەك شتدا هاوڕان کە پێیان وایە ئەویش ئەوەیە کە پێیان وایە لە ڕێگای وزەوە ئەو کارە ئەنجام دەدەن.

گوایە سەرچاوەی وزەی کەسی نەخۆش بلۆك کراوە و ئەوان ئەم بلۆککردنە لەناو دەبەن و دووبارە سەرچاوەی وزە دەخەنەوە کار لە کەسی نەخۆشدا تا جەستەی بتوانێت خۆی خۆی چارەسەر بکات.

## Joralf Gjerstad (Snåsmann)

## یورالْف یێرستاد (سنۆس مان)

سیاسەتمەدار، نووسەر و شیفابەخشێکی نەرویجییە.

دەربارەی شیفا بەخشین و چاککردنەوەی نەخۆش گریمان و گفتوگۆی زۆری لەسەرە، کەوا ئەم کارەی لە ڕێگای سیحرەوە بووە، ئەگەرنا دەستەکانی ئەو توانایەیان نەبووە.

چەند کتێبێکی دەربارەی مێژووی نەرویج نووسیوە ئەم پیاوە سیاسیە تەنیا ٥ ساڵ چۆتە قوتابخانە و لە خێزانێکی قەرەباڵغ لەدایك بووە، منداڵی شەشەمی خانەوادەکەیەتی، کە حەوت برا و خوشکی بووە.

لە کارگەی شیرەمەنی سنۆسا کاری کردووە و نازناوی سنۆسمانی دراوەتێ.

لە تەمەنی ١٦ ساڵییەوە چاودێری کاتژمێرەکەی کڵێسای سنۆسا بووە، هەر لەوێوە دەستی بە کاری سیاسی کردووە بووە بە سەرۆک شارەوانی ئەوێ لەسەر حیزبی کاری نەرویجی.

یێرستاد دەگێڕێتەوە و دەڵێت کەوا هەر لە تەمەنی منداڵییەوە هەستی بەوە کردووە کە دەستەکانی توانایەکی تایبەتیان هەیە کە مرۆڤی ئاسایی ئەو توانایەی نییە.

باسی ئەوە دەکات کە توانای بینینی ئێستا و داهاتوو و ڕابردووشی هەبووە، توانیوویەتی دەربارەی شتەکان، مرۆڤەکان، شووێن و کات زانیاری هەبێت.

هەستەکانی زۆر جیاواز بوون لە هەستی مرۆڤی ئاسایی، ئەم زانین و هێنانی زانیاریانە تەنها لە ڕێگای جادووەوە دەبێت کە پێشبینی ڕووداوەکانی کردووە.

سنۆسمان دەڵێت ئەندامانی تری خانەوادەکەی ئەم توانایەیان هەبووە، بەڵام کەسیان وەك ئەو نەبوون تا بتوانن نەخۆش چارەسەر بکەن.

دەڵێت ماوەیەکی زۆر هەوڵی داوە کە زاڵ بێت بەسەر تواناکانیدا و بیان شارێتەوە، بەڵام زۆر قورس بووە بۆی.

تا لە تەمەنی ٢١ساڵیدا دەبێتە سەرباز و لە جەنگی دژی ئەڵمانیا بەشدار دەبێت لەوێ ئافرەتێکی جادووگەر دەبینێت کە فاڵی بۆ دەگرێتەوە و پێی دەڵێت کە تۆ دەبیتە کەسێکی ناسراو لە هەموو نەرویج دا و یارمەتی خەڵکیش دەدەیت.

بۆیە لەوکاتەوە چیتر نەمویست زاڵ بم بەسەر توانکانمدا و بیانشارمەوە، بۆیە دەستم کرد بە چارەسەری نەخۆش و لە ماوەی پەنجا ساڵی کارکردنم دا توانیومە هەزاران کەس چارەسەر بکەم.

چەندین کەسی ناسراو پەیوەندییان پێوە کردووم کە پێشبینیان بۆ بکات لە کارەکانیاندا لەوانە پیتەر نوورهاوگ کە یاریزانێکی ناسراوی خلیسکێنی سەربەفرە لە ساڵی ٢٠٠٩ لە یاری خلیسکێنی سەربەفر بۆ پاڵەوانێتی

ئەوروپا بەشدار بووە و پەیوەندی بە سنۆسمانەوە کردووە تا پێشبینی بۆبکات ئەنجامی یارییەکان چۆن ئەبێت.

هەروەها وەزیری تەندروستی نەرویج بیارنە هۆکۆن هانسن ڕەخنەیەکی زۆری ئاڕاستە کرا کە بۆ چارەسەری کوڕەکەی لە ساڵی ١٩٩٧ پەیوەندی بە سنۆسمانەوە کرد، کوڕەکەی نەخۆشی گەشکەی لەگەڵ بووە.

مەدالیای زیوی پیاوی لێهاتووی لەلایەن پادشای نەرویج پێبەخشرا لە ساڵی ٢٠٠٦ کە بە کاریگەرترین پیاوی پارێزگای ترۆیندەلاگ هەڵبژێردرا.

فیلمیکی دۆکیومێنتاری لەسەر دروست کرد بەناوی NRK کەناڵی تەلەفزیۆنی

(هەست بە گەرمی دەکەیت؟)

لە ٢٠٠٨ ژیاننامەکەی کرایە کتێب و چاپی کرد.

ساڵی ٢٠١٢ کتێبێکی تری چاپ کرد کە باس لەوە دەکات زیاد کە ٥٠ هەزار کەسی چارەسەر کردووە و ئەو هەواڵ و دەستخۆشیانەی بۆی هاتبووەوە لەلایەن نەخۆشەکانییەوە لە کتێبەکایدا باسی لێوە کردبوو.

لەدوای هەموو ئەم کارانە خوشکەکەی ئەوەی ئاشکرا کرد کە براکەی هیچ توانایەکی تایبەتی نییە و کارەکانی تەنها لە ڕێگای جادووە.

# یەرسانییەکان کێن؟

گەڕان بەدوای مێژووی دروستبوونی یەرسانییەکان و زانیاری دەستکەوتن لەبارەی یەرسانییەکانەوە کارێکی یەکجار قورس بوو ..بۆ من، چوونکە ئەوەندەی کە دەگەڕام بۆسەرچاوەی تەندروست دەستم نەدەکەوت بە زمانی کوردی و تەنانەت بە زمانی فارسی و عەرەبیش، بۆیەناچار ڕووم کردەوە عەشیرەتی قەڵخانی و لەناویاندا چەند ڕۆشنبیرێکی کاکەیی و یەرسانیم دواند، ئەوان هەندێك لەبارەی خۆیان دووان، هەندێك زانیاری دیکەش لەخەڵکێ ناوچەی هاوار و هەڵەبجە دەستم کەوتەوە، بۆیە ناویشم نەناوە لێکۆڵینەوە یاخود توێژینەوە.. بەڕاستی بەدڵی خۆم زانیاریم دەست نەکەوتووە لەسەر ئەم گرووپە و جارێ بە نا کامڵ و ناتەواوی دەزانم.

سەرەتا ئەوەندەی کە بۆم ئاشکرا بووە ئەم کۆمەڵە زۆر نزیك بوون لە "کەریم خانی زەند" لەسەردەمی کەریم خانەوە دروست بوون، لەدوایی ئەوەی کەریم خان لە سوپای" نادرشا"دا ناسراو بەهۆکاری شەڕی ناوخۆی ئەو دەمەی ئێران لە ساڵی١٧٤٧ زاینی کە هۆکاری دەگەڕێتەوە بۆ دروستبوونی دەوڵەتی خەواریجەکانی " بوو سەعیدی " لە عومان و جەنگی عوسمانلی لە ئەفغان، کەریم خان یەکێك بوو لە سەرکردە کوردەکانی ئەو دەمە و لەگەڵ دەسەڵاتداری ناوچەکەدا بەناوی بەختیار کە ئەویش یەکێك بوو لە بنەماڵەی شاکانی ئێران و توانی ڕێکبکەوێت و لەدوای ئەوەی کە دەسەڵات کەوتە دەست کەریم خان بەسەر بەختیاریشدا سەرکەوت و کوشتی .. کەریم خان زۆربەی ئێران کەوتە بن دەستی، کورد و بەتایبەت هۆزی لوڕەکان بوونە هەوێنی پشتگیری

دەوڵەتەکەی کەریم خان لە ئێران و شیراز بووە پایتەختی ئەو دەمەی کەریم خانی زەندی کوردی..

لەدوای ئەوە بنەماڵەی زەندییەکان براکانی کەریم خانی زەندو منداڵەکانی لە دوای مردنی کەریم خان لەسەر میراتییەکەی بووە بە شەڕیان ئەو دەوڵەتە بەردەوام بوو لەساڵی ١٧٥٠ -١٧٧٩ زایینی کۆتایی بە دەسەڵاتی هات.

هەر بۆ زانیاری خوێنەر جەنگی نێوانی بنەماڵەی زەندییەکان لە نێوانی زەکی خان و عەلی موراد خان و صادق خانی مامیان و تا کۆتایی کوڕیان کەلەگەڵ ئاغا موحەممەد خانی قاجەر کەوتنە جەنگ و شکستیان خوارد و قاجەرییەکان توانیان سەر بکەون.

هەرچەندە ئەم پێشەکی مێژووییە کاڵ و کرچە بۆ دەسەڵاتی زەندییەکان، بەڵام من کارم بە مێژووەکە نییە ئێستا تەنها ڕوونکردنەوەی ئەو ڕووداوە ئەدەم کە قاجەرییەکان سەرکەوتن بەسەر کوردە زەندییەکاندا بە هاوکاری دەوڵەتی خاچپەرستەکانی جۆرجیا و ئەرمەنیا و ڕوسیا و داغستانی ئەو سەردەمە.

بەشێك لە سۆفییەکانی ئەو سەردەمە کە ناسرابوون بە قزڵباشییەکان کە نزیك بوون لە تورکەکانی ئازەربایجان و قزڵباشییەکان واتا سۆفییە کڵاو سوورەکان زۆر کەریم خانیان خۆشدەویست ئیتر لەو سەردەمەوە زۆر پیرۆزیان دا بە زەندییەکان و بەتایبەت کەریم خانی زەند کە دەوڵەتی خەواریجەکانی خەلیج (کەنداو) بەناوی بوسەعدەدین پشتگیریان دەکرد خۆشەویستیەك لەلایەن خەڵکیەوە بۆ زەندیەکان هەبووە

تا سەردەمی عێل وبەگەکانی جاف، جافەکان سەرەتا تەنها ئیسلام ناوی بردوون باسی کردوون لە مێژوودا، ئەویش لەدوای سەردەمی سەفەوییەکانەوە ناویان هاتووە ناو مێژوو وەك جاف، هەرچەندە لەسەردەمی زەندییەکانەوە ناویان نەهاتووە بەڵام وەك گروپ پاڵپشتی زەندییەن بوون وەك تیرە و هۆزێك بوونیان هەبووە، بەڵام نازناوی جافیان پێوە نەلکاوە، زیاتر لە میژوودا ئاماژە بە سەردەمی سەفەوییەکان کراوە بۆ دەرکەوتنیان .. جاف پێکهاتەکەی زۆرێکن لە کوڕانی شاتری و ڕۆغزایی و نەوژین و هارونی و ئیسماعیلی و کەماڵی و میکائیلی ... تاد.

ئەمانە هەموو تفەنگ بەدەست و سوارچاکی جاف بوون جافیش وەك باس کراوە لە مێژووەکاندا ناویان لەدوای کەریم خانەوە هاتووە بە جەفاکێش و هەمیشە دەربەدەر بوون لەدوای ئەو دەوڵەتە، مامۆستا عەلائەدین سەجاددی دەفەرموویێت ناوەکەیان لە جەفاوە هاتووە

ئەمانە زیاتر قاڵببوونەوە لە بواری ڕۆحی و پاشان تێکلاوبوونی بیرۆکەی" یەرسانی "بەناو بیروباوەڕی سۆفیزمی ئەودەمەی جافا

کەواتە سەرەتا پێویستە ئایینی یارسانی وەك بیرۆکەی سۆفیزم هاتە ئاراوە لەو ناوچانەدا کە ئێستا ناویاننناوە بە یارسانی دەرکردووە پێشتر و ئێستاش هەندێکیان خۆیان هەر بە موسڵمان زانیوە و پێیان وایە ئەوان موسڵمانی ڕاستین و خۆیان بە کاکڵە گوێزی ئیسلام دەزانن..! دوای ئەوەی کە یەرسانی وەك بیروباوەڕ تێکلاو بوو بە بیری سۆفیزمی ئیسلامی ئەم کۆمەڵە نزیك لە کەریم خانی زەندەوە، ئیتر بە تەواوەتی بیروباوەڕیان دەگۆڕێت.. ئیتر یەرسانی دەبێتە پشتو پەنای جاف...

# یەرسان چییە؟

لەبنەڕەتدا ئاینێکی کۆنی ئارییەکانە، هەرچەندە لەهەندێك سەرچاوەی کوردیدا هاتووە کە یارسان ئایینی ڕەسەنی هەورامییەکان و ناوچەی هەورامان بووە، بەڵام - نووسەر- پێی وایە کە یارسان یەکێکە لە قۆناغی خوایەتی ئەزدییەکان و دوای عیشقێتی دەگاتە ئەم پلەبەندییە کەیارسانە و ئەویش لە هیندستانەوە سەرچاوەی گرتووە، بنەڕەتی ئەم فەلسەفەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئایینی شووشەنگی و میترایی، کە ئەم فەلسەفەیەش پیرۆزی ئەدات بە ئاگر وەك ئایینی زەردەشتی.

بیروباوەڕی کاکەیی تواوە لە نێوانی سۆفیزم و یەرسانیدا

ئەم کۆمەڵە خاوەنی چەند کتێبێکی تایبەت بە خۆیانن بێجگە خۆیان نیشانی هیچ کەسێکی دیکەی نادەن، لەڕاستیدا پێت دەڵێت دەتوانی تەماشای بکەیت بەڵام دەبێت بەو ئاواتەوە بتلێتەوە، هەرگیز نایبینیت.

کتێبە گشتییەکانیان:

زەبووری پێغەمبەر داود و کتێبی پیرۆزی ئەهلی حەقە

لەناو ئەم کتێبەدا وەك ئاڤێستا و خوردە ئاڤێستا بڕوایان بە هەندێك لە نزاو سرود یان سروت هەیە، کە ئەوانیش لە کاتی تایبەت دا بەرانبەر بە ئاگر دەیخوێنن

بە تار و دەف و سروودەکانیان دەڵێن لە ئەنیش ئارامگای سوڵطان ساك.

جەژنی سامۆئیلی کرماشانیان هەیە.

هەرچەندە یارسانییەکان خەڵکانێکی زۆر بە پیرۆز دەزانن لە بەرزنجە و پیرانی زەردەشتی و شێخانی نەقشبەندی و قادریش تەنانەت ناوی سان و سوڵطانیان زۆرە.

لە خۆیان زیاتر ئافرەت نادەن بە موسڵمان، ڕێگەیان پێدراوە کە سوننەیان بینی بڵێن نزیکین لە ئەهلی سوننەت و بە پێچەوانەوە کە شیعەشیان بینی بڵێن نزیکین لە ئەهلی شیعەی عەلی و عەلی بە ئیمامی خۆیان دەزانن، هەڵەبەت هەندێکیان ئەوانەی نزیکن لە ئێرانەوە ئەم قسە بەڕاشکاوانە دەکەن، خۆشیان ناساندووە بەئەهلی حەق.

بڕوایان بە خوایەك هەیە لە ئاسمان، بەڵام باوەڕیشیان وایە کە عێل و بەگەکانی جاف هەموو پێغەمبەر بوون دوایی حڵ (حلول) بوون بە جەستەی خوا و هەموویان بوونەتە خوا..! شیعرو سروودەکانی عێل بەگی جاف زۆر پیرۆزە و وەك قورئانە بەلایەناوە زۆر پیرۆز تەماشا دەکرێت

ڕێز لە هەموو ئایینێك دەگرن و وەك خۆیان دەڵێن هەموو ئایینێکیان پێڕاستە

هەرچەندە ئەوان دەڵێن بڕوامان بە بەهەشت و جەهەنەم هەیە، بەڵام بڕوای ئەوان لە زیندووبوونەی ڕۆحدایە بە شێوەی مار و مێروو بۆ خراپەکاران و ڕۆحی پاکیش وەك چۆلەکە و پەپولە و ئاژەڵە جوان و ناودارەکان... پێیان وایە بەردەوام مرۆڤەکان بەمشێوە دەمێننەوە بەردەوامن لەم پرۆسەیەدا، دەبنەوە بە ڕۆحی تر و گیانلەبەری تر بەگوێرەی چاکە و خراپەیان .. بەهەشت و جەهەنم بەو پێوەرە دەست نیشان دەکەن

## پیرۆزییەكانیان

ئەوەی كە پیرۆزە لای كاكەیی ژینگەیە.. ئەوە كە سروشتە لای ئەوان ڕێز لێگیراوە .. وەك ڕۆژ، خاك، سەوزایی، دار، ئاو، بەرد، دەتوانرێت بپەرسترێت، بەهۆكاری ئەوەی كە ئەمانە خزمەت بە مرۆڤ دەكەن.

واتا ئەمانیش بڕوایان بە فەلەسەفەی تەنسیخی ڕۆح (تناسح الارواح: دۆنا و دۆن) و ئاوێتە بوون هەیە واتا (حلول) كە لە بنەڕەتدا فەلسەفەیەكی كۆنی هیندییە.

## Chakra چاکرا

چاکرا وشەیەکی سانسکریتیە و بەمانای چەرخ دێت.

چاکرا سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هیندۆسەکان و پێیان وایە سەرچاوەی وزەی جەستەیە کە هۆکارە بۆ بەردەوام بوون لە ژیان.

هیندۆسەکان پێیان وایە ٧ جۆر چاکرا لە جەستەی مرۆڤ دا هەیە، کە هەریەك لەمانە ئۆرگانێک یان کۆمەڵە ئۆرگانێك کۆنترۆڵ دەکات و بەرپرسی ئەنجامدانی کاری ئەو ئۆرگانانەیە لە جەستەدا.

حەوت جۆرە چاکراکەش بریتین لە:

چاکرای ڕیشە، چاکرای خاجی، چاکرای دڵ، چاکرای خۆر، چاکرای قوڕگ، چاکرای چاو، چاکرای تاجی چاکراکان.

# باوەڕی شەمەنیسم

باوەڕی شەمەنیسم یەکێکە لە کۆنترین عەقیدەکان لای هەندێك نەتەوە کە لە پێش مێژووەوە باوەڕیان پێی هەبووە و تا ئێستاش لای هەندێکیان هەر ماوە.

شەمەن باوەڕەکان پێیان وایە لە ڕێگای پەیوەندی بە ڕۆحەکانەوە دەتوانرێت پەی ببرێت بە ئازار و ناڕەحەتی مرۆڤەکان و لەڕێگای ئەوانەوە چارەسەر بکرێت، کە خۆیان ناویان ناوە جادووی پزیشکی و پێشبینی ڕووداوەکان دەکەن لە ڕێگای ڕۆحەوە.

ئەو کەسانەی کە ئەم کارە دەکەن و هەڵدەسن بە پەیوەندی بە ڕۆحەوە و چارەسەرکردنی نەخۆش پێیان دەوترێت شەمەن.

ئەم شەمەنانە ئیدیعای ئەوە دەکەن کە ڕۆحیان دەتوانێت سەفەر بکات بۆ جیهانێکی تر و لەگەڵ ئەرواح دا پەیوەندی ببەستێت، ئیدیعای ئەوە دەکەن کە لەنێوان جیهانی ماددی و جیهانی ڕۆحانیدا دەتوانن پارسەنگی بکەن.

وشەی شمەنیسم لە زمانی تونغوزی سیبرییەوە سەرچاوەی گرتووە و بەمانای دانا دێت.

# ناوەڕۆک



ئامانجی نووسەر لەنووسینی ئەم پەرتووکە ئەوەیە کە چەواشەکاریی و درۆو خورافیات لەسیحرو جادوبازی و کاری شەیتانەکان جیابکرێتەوە.

لەکتێبی یەکەمی مەملەکەتی شەیتاندا نووسەر زیاتر باسی ئەو رووداوانە دەکات کەچۆن ئاشنا بووە بەجیهانی جنەکان و چۆن پەیوەندیی دروست بووە لەنێوانیاندا.

لەبەشی یەکەمدا خوێنەر ئاشنابووە بەشێوازی چوونە ناوەوەی جنەکان بۆ لاشەی مرۆڤ و چۆنێتی دەرهێنانی، هەروەها باسێکی کورتی ئەو گروپ و رێکخراوو مەزهەبانەی کە لەپەرتووکەکەدا ناویان هاتووە روونبکاتەوەو فێرمان بکات ئەوانە کێن و خەریکی چین لەرابردوو ئێستاشیاندا.

لەوبەشەی کە باسی جنۆکەو چوونە ناو لاشەی مرۆڤ دەکات، نووسەر هەوڵیداوە زانستیانەو واقیعیانە لەرووی مەیدانییەوە کەخۆی ئەزموونی هەبووە تێیداو راوبۆچوونی زانایان و پسپۆرانی لەسەر وەرگیراوەو گونجاوە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، باس بکات.

لەکتێبی دووەمی مەملەکەتی شەیتاندا نووسەر هەوڵی ئەوەی داوە کەجۆری سیحرو جادوو روونبکاتەوەو شێوازی بەتاڵکردنەوەکەی باس بکات، تا خوێنەر سوودی لێ ببینێت و لەرووبەڕووبوونەوەی هەر حاڵەتێکی لەو شێوەیەدا بزانێت چۆن چارەسەری بکات.

لەکتێبی سێیەمدا نووسەر هەوڵی تەواوی داوە کە ئەو کەموکوڕیانەی لەکتێبی یەکەم و دووەمدا هەبووە پڕیکاتەوەو واقیعیانەترو زیاتر لەرووی مەیدانییەوە کەخۆی بەشێک بووە لەرووداوەکان، نیشانەکان و شێوازی چوونە ناو لاشەی جنەکان و دەرهێنانیان و ئەو ئەزێت و ئازارەی کە مرۆڤەکان دەیبینن بەدەستی ئەوان روون بکاتەوە.

# مەملەکەتی شەیتان




حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف

٢٥٠٠٠ /M.Ktebxana ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە